# فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی

نووسینی : ڕۆژان نوری عبدالله -زانکۆی کۆیە
سەرپەرشتی: پ.ی.د.بەکر عومەر - زانکۆی سلێمانی

# فەرهەنگی

# زمان و زاراوەسازیی کوردی

# فەرهەنگی
# زمان و زاراوەسازیی کوردی

نوسینی:

ڕۆژان نووری عەبدوڵا

سەرپەرشت:

پ.ی.د. بەکر عومەر عەلی

2707ی کوردی

2007ی زایینی

بـابــــەت : زمانەوانی (مۆرفۆلۆجی)

ناوی کتێب : فەرهەنگی زمانو زاراوەسازیی کوردی

ناوی نوسەر : ڕۆژان نوری عەبدولا

ژمارەی سپاردن : 207 ساڵی 2006

ژمارەی چاپ : چاپی یەکەم - 2007

نەخشەسازی : عوسمان کەریم

بەرگ : هەرێم عوسمان

چاپ : خانەی چاپو بلاوکلادنەوەی چوارچرا

بەرپەرشتی چاپ [illegible]

نرخ : 6000 دینار

تیراژ : (1100) دانە

## ئەم كتێبە، پێشكەشە بە :

- باوكم و دايكم .
- خوشك و براكانم .
- هاوڕێ و خۆشەويستانم .
- هەموو ئەو بەڕێزانەی بە دڵسۆزييەوە، هەوڵی بەرەوپێشبردنی زمانی كوردیو دەوڵەمەندكردنی فەرهەنگەكەی دەدەن .

# ناوەڕۆك

# پێشەکی:-

**ناو نیشانی نامەکە :-**

نامەکە بۆ (( فەرهەنگی زمان و زاراوە سازیی کوردی )) تەرخان کراوە، لە ئاستی مۆرفۆلۆجیو هەندێك جاریش بە پێی پێویست، پەل بۆ ئاستی سیمانتیك و سینتاکسو ڕێنووسیش هاوێژراوە، چونکە کە ڕەسەی شیکردنەوەکە خۆی لەو ئاستانەدا دەبینێتەوە.

**هۆی هەڵبژاردنی ئەم بابەتە :**

ئەمڕۆ وەك دوێنێ نییە، سەردەمێکی جەنجاڵە، ڕۆژانە دیاردەی نوێ سەر هەڵدەداو لێوان لێوە لە داهێنان و گۆڕانکارییە هزرییەکان، هەموو ئەمانەش پێویستیان بە پەیدابوونو هاتنەکایەی وشەی نوێ هەیە.

لەگەڵ ئەوەی زاراوە بە بەردی بناغەی لە دایکبوون و پێکهێنانی زمانی نەتەوایەتیی هەموو زمانێکی پێشکەوتوو دادەنرێت، لە بوارە جیاجیاکانی زانستی و ڕۆشنبیریو هونەری و وێژەییدا، هۆیەکە بۆ یەکخستنی بیرکردنەوەو تێڕوانینیان، بەلأم ئێمەی کورد لە بواری زاراوە سازیدا، هێشتا نەگەیشتووینەتە ئاستی پێویست، بۆیە پێویستە گرنگی بەم لایەنەی زمان بدەین و بەرەو پێشەوەی ببەین، تاوەکو بتوانین ، فەرهەنگی زمانەکەمان دەوڵەمەند بکەین. هەرچەندە هەندێك کار لە سەر زاراوەسازی کوردی کراوە، بەلأم تاوەکو ئێستا، نامەیەکی ئەکادیمیی سەربەخۆ نییە، کە بە شێوەیەکی تایبەتمەندوفراوان وردە کارییەکانی ئەم زانستە دەربخات و باس لە ڕۆڵی پێشگرو پاشگرەکانی دارشتن و ئەرکیان لە زمانداو هەریەکە لە ڕێبازەکانی دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی زمان و چۆنیەتی کارکردنیان و کێشەکانی ئەمڕۆی زاراوەسازی کوردی و نەخشە دانان بۆ چارەسەرکردنیان بکات، بۆیە بە ئامانجی نەهێشتنی ئەم کەلێنە بە پێویستمان زانی، لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی بۆ زاراوەسازی و چۆنیەتی دەوڵەمەند بوونی فەرهەنگی زمان، لە چوارچێوەی نامەیەکی زانستیدا بهێنینەدی.

**گرنگی باسەکە:**

ئاشکرایە، کە زانستی زاراوە سازیی ئەمڕۆ لە زمانە پێشکەوتووەکاندا، گرنگییەکی زۆری پێ دەدرێ، چەندین لێکۆڵینەوەی جۆراوجۆری لە بارەوەکراوە، فەرهەنگی تایبەت بۆ گشت بوارەکانی دادەنێن و دەیخەنە بەردەستی خوێندەواران و ئامادەی سوود لێ وەرگرتنی دەکەن.

زمانی کوردی ئەمڕۆ، بەقۆناغێکی مەزنی گەشەسەندن و پەرەپێدان و خزمەت کردندا دەڕوات، بووە بە زمانی پەروەردەو فێرکردن، زمانی کارگێڕی و سیاسەت و زمانی دادگاو یاسا دانان و چەندین بواری دیکە، لێرەدا گرنگی زاراوەو چۆنیەتی دروستکردنیو یەکخستنی دەردەکەوێت، کە بە کۆڵەگەی زمانی نەتەوایەتی و بنچینەی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو دادەندرێت.

پێشکەوتنە خێراکانی زانست و زیادبوونی بەرهەم، هەمیشە پێویستیان بە پەیدا بوونو هاتنەکایەوی وشەی نوێ هەیە، وشەکانی زمان زیاد دەبن و گەشە دەکەنو گۆڕانانیان بەسەر دادێت، هەندێکیان لە بەکارهێنان دەکەون، بەڵام بزووتنەوەیەکی بێ وچان و بەردەوام لە زماندا هەیە، وشەی نوێ لەسەربنچینەی ئەو وشانەی لە زووەوەلە زمانەکەدا هەن دروست دەبێت. بۆ ئەوەی زمانەکەمان توانای دەربڕینی چەمکە زانستییەکانی هەبێت، پێویستە گرنگی بە دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگەکەی بدەین، بایەخدان بە، بەکوردی کردنی زاراوە زانستییەکان، بۆ گواستنەوەی گەورەترین بڕ، کە لە پووری زانستیی جیهانی، کارێکی گرنگ و بە بایەخە.

گرنگی ئەم لێکۆڵینەوەیە، لەوەدایە، کە بۆیەکەم جارە، بەشێوەیەکی وافراوان و لە چوارچێوەی نامەیەکی ئەکادیمیدا، باس لە وردەکاریەکانی زاراوەسازی و چۆنیەتی دروستبوونی زاراوەی نوێباو و ڕێبازەکانی دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی زمان کراوە. ڕۆڵی هەرپێشگرو پاشگریکمان لە داڕشتنی زاراوەدا بەجیا بۆ دروستکردنی بەشەکانی ئاخاوتن (ناو، ئاوەڵناو، ئاوەڵکار، کار) باس کردووە.

جگە لەوەی ڕێبازی ( لێکدان و داڕشتنمان ) وەکو دوو ڕێبازی سەرەکی زاراوە داڕشتن لە زمانی کوردیدا باسکردووە، ئاماژەشمان بەهەندێ پێشگرو پاشگری تازەش کردووە، کەلەڕێگای دابەشکردنی وشە بۆ مۆرفیمە پێکهێنەرەکانیانەوە بۆمان دەرکەوتوون.

باسی ئەو مۆرفیمانەمان کردووە کە ئەرکی سینتاکسی و دارشتن دەبینن، بە ( مۆرفیمی دوولانە) ناومان بردوون.

گرنگییەکی دیکەی ئەم نامەیە لەوەدایە، کەیەکەم جارە گەشەکردنی زاراوەو دەوڵەمەندبوونی فەرهەنگی زمان، بەدەوڵەمەندی و بەپێزی بوارەکانی ئەدەبیی و ڕاگەیاندن بەتایبەتی ڕۆژنامەنووسی، بزووتنەوەی‌نەتەوەیی و کۆمەڵایەتیی، ئاینی و کارگێری‌و لێکۆڵینەوەی زانستیی جۆراوجۆر دەبەستینەوە، پێشکەوتنی هەریەکێك لەم بوارانە دەبێتە هۆی پەرەسەندنی زاراوەی کوردی و بوژاندنەوەی فەرهەنگی زمان.

هەروەها باسی ئەوکێشانەمان کردووە، کە ئەمڕۆ ڕووبەڕووی زاراوەو بواری زاراوەسازی کوردی بوونەتەوە، دیارە زاراوەدانان گیروگرفتی زۆرە، وەك دانانی لەیەك زاراوە زیاتر بۆ واتایەك، پەنا بردنە بەر زاراوەی زمانانی دیکە لە ڕادەی پێویست، دارشتنی نادروستی زاراوەی نوێ، گەلێك هۆکاری دیکەی وەك نەبوونی دەوڵەت و نەبوونی کۆڕی زانیاری... تاد، لەگەڵ خستنە ڕووی چەند بنەمایەك بۆ دروستکردنی زاراوەی نوێباوی کوردی‌و هەوڵدان بۆ دروستبوونی زمانێکی ستانداردی کوردی و ڕێنووسێکی یەکگرتوو.

## سنووری باس :

ئەم باسە لە چوارچێوەی دیالێکتی کرمانجی ناوەڕاستدا، لە فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی دەکۆڵێتەوە.

## کەرەستەی نامەکە :

بریتییە لە ئاخاوتنی ڕۆژانەو ئەو لێکۆڵینەوە سنوور دارانەی تائێستا، لە سەر زاراوەسازی کوردی کراون، لەگەڵ سوودوەرگرتن لە هەندێ سەرچاوەی زمانانی دیکەی وەکو عەرەبیی و ئینگلیزی.

## ڕێبازی لێکۆڵینەوەکە :

لە نوسینی ئەم نامەیەدا بە گشتی پشت بە ڕێبازی وەسفی ((سینکرۆنی)) بەستراوە، واتا لەو مۆرفیمانە دەکۆڵێتەوە، کە ئێستا لە کاردان و لەلایەن قسە پێکەرانی زمانی

کوردییەوە، بۆ دارشتنی زاراوەی کوردی بەکاردەهێندرێن و ئەو سەرچاوانەی کە ئەمڕۆ بۆ دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی زمانی کوردی پشتیان پێ دەبەسترێت، ئەوکێشانەی کە ئەمڕۆ دووچاری زاراوەسازی و فەرهەنگی زمانی کوردی بوونەتەوە.

**بەشەکانی نامەکە :**

نامەکە لە پێشەکی و سێ بەش و ئەنجام پێکهاتووە، بەم شێوەیە :

**بەشی یەکەم :**

لەم بەشەدا سەرەتا رۆڵی وشەمان وەکو بەشێکی گرنگی زمان دەرخستووە، ئینجا فەرهەنگی زمانمان بۆ سێ بەش دابەش کردووە، لەبەرئەوەی پێشگرو پاشگر جۆرێکی تایبەتین لە مۆرفیم، لە رێگای پێناسەی مۆرفیمەوە هەندێك لە تایبەتییەکانی مۆرفیمان بە گشتی و مۆرفیمی وشە دارێژ (پێشگرو پاشگر) بە تایبەتی باسکردووە. لە دواییدا باسی رێبازی دارشتنی (ناو، ئاوەڵناو، ئاوەڵکار، کار ) مان کردووە، هەروەها لیستێکمان بۆ هەندێ پاشگری دیکە دروستکردووە کە ناوی دارێژراوسازدەکەن. لە دواییدا باسی مۆرفیمی دوو لانەمان کردووە، کە جگە لە ئەرکی سینتاکسی، ئەرکی وشە دارشتنیش دەبینن، ئینجا باسی هەندێك وشەی دیکەمان کردووە، کە لە بەکارهێناندا رووەوپێشگر بوونەتەوە.

**بەشی دووەم :**

لەم بەشەدا باسی چەند سەرچاوەیەکی دیکەی دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی زمانمان کردووە، وەك : (وەرگرتن، لێکدان، میتافۆر، فرەواتا ) و رێگاکانی دیکەی داهێنان، پارچەکردن، ئەکرۆنیم، دەنگداری و چەند هۆکارێکی دیکە کە دەبنە هۆی دەوڵەمەندبوونی فەرهەنگی زمان وەك (بزووتنەوەی نەتەوەیی، ئاین، بزووتنەوەی ئەدەبیی، رۆژنامەنووسیی و لێکۆڵینەوەی زانستیانە).

**بەشی سێیەم :**

باسی ئەو کێشانە دەکات کە دووچاری زاراوەسازی ئەمڕۆی کوردی بوونەتەوە، وەك کێشەکانی زمانی کوردی و زمانی سەرچاوەو چۆنیەتی وەرگێڕانی زاراوە بۆ زمانی کوردی، ئەو هەوڵانەی کە لە لایەن تاکەکەس و پسپۆڕانەوە دەدرێن بۆ سازکردنی زاراوەی کوردیو نەبوونی دەوڵەت وژێر دەستەیی و نەبوونی کۆڕی زانیاری و نەبوونی فەرهەنگو بیروبۆچوونی جیاواز لە بارەی وەرگرتنی زاراوەی دراوسێ و جیهانی و هەوڵدان بۆ یەکخستنی زاراوەکان و دانانی چەند بنەمایەك بۆ زاراوەی زانستی و دروست بوونی زمانی ستانداردو ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی.

لە کۆتایی نامەکەشدا ئەو ئەنجامانەی کە پێیان گەیشتووین لەگەڵ لیستی سەرچاوەکان و کورتەی باس خراونەتەڕوو.

# بەشی یەکەم
# فەرهەنگی زمان - زاراوە دروست کردن

**سـەرەتا :**

ڕۆڵی وشە لە زماندا گرنگ و کاریگەرە، وشە بە دانەیەکی بنەڕەتی زمان دادەنرێت. کە لە دێر زەمانەوە جێگەی بایەخی زانایان و توێژەرەوەکان بووە. بەڵگەش بۆ ئەم ڕاستییە ئەوەیە، کە بەر لە دووهەزار و سێ سەد ساڵ لەمەو پێش (ئەرستۆ) پێناسەی وشەی کردووە، دەڵێت:

((وشە یاخود ناوبێژەیەکی واتادارە، لە چەند دەنگێك پێکهاتووە، هیچ پارچەیەکی خۆی لە خۆیدا واتا نابەخشێت ))[1].

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کەزانایان لەو سەردەمەوە، بایەخیان بەزمان و وشەداوە.

زمان بە ناسنامەی زمانی نەتەوایەتی دادەنرێت، هۆیەکیشە بۆ بەرەوپێشەوەچوونی. لە دووتوێی کەلەپووری زمانی کوردیدا نموونەی هەمەچەشنە لە پەند و ئیدیەم و قسەی بەجێ بەدی دەکەین، کە باس لە دەورو کاری زمان و وشە لە ژیاندا دەکەن، ڕەنگ دانەوەیان لەسەر باری دەروونی و شێوازی پەروەردەیی مرۆڤ بە گەورەو بچوکیەوە، وەك :

((بەقسەی خۆش مار لە کون دێتە دەر)).[2]

مرۆڤ گیانلەبەرێکی کۆمەڵایەتییە، زمانیش ئامێرەکەیەتی. بەو پێیە هەر لە سەرەتاوە ((بەهۆی پەیدا بوونی کۆمەڵ و کاری گەلیەوە))[3] پێویستی بە زمان بووە، بەپێی ڕێککەوتنێکی کۆمەڵایەتی وشەیان بەرانبەر دیاردەکانی ژیان داناوە.

وشە لە زانستی زماندا گرنگییەکی زۆری پێ دەدرێت، بەهۆی وشەوەیە کە مرۆڤ دەتوانێت ئەو بیرەی لە مێشکی دایە دەری ببڕێت کە دەلالەت لە شت ومەك و دیاردەی جیاجیای سروشت دەکات.

---

(١) ارسطوطاليس، (و): عبدالرحمن البدوی، فن الشعر، ل٥٦.

(٢) د.نەسرین محەمەد فەخری، لایەنی هاوبەشی و جیاوازیی نێوانی هەردووزمانی کوردی و عەرەبیلەدروست بوونی ووشەی نوێدا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری ((دەستەی کورد))، ب٢٩-٣٠، ل ١٩٩.

(٣) محەمەد مەعروف فەتاح، زمانە وانی، ل١٣.

هەموو زمانێك هێندە كەرەسە دەخاتە بەردەست قسەپێكەرانی تا بتوانێت بەپێی قۆناغ و زەمەن لەدەور و بەری خۆیان پێی بدوێن، بەڵام ئەوەش دەزانین كە زمان بە بەردەوامی وەك ژیان لە فراوان بووندایەو وشەكان و دەربڕینەكان وشەو دەربڕینی نوێیان لێدەبێتەوە وشەكان وشەی تر دەخەنەوە و پێداویستییەكان وامان لێدەكەن ناوی نوێ و دەربڕینی نوێمان هەبێ.

بۆ دەوڵەمەندكردنی زمان، پێویستمان بە دەوڵەمەندكردنی فەرهەنگەكەی هەیە، ئەویش بەهۆی بوونی پەیوەندییەكی بەتین و گرنگ لە نێوان فەرهەنگ و زمان. بەكۆی دانەكانی فەرهەنگ دەوترێت زمان، بەڵام ناتوانین بەكۆی دانەكانی زمان بڵێین فەرهەنگ. چونكە زمان فراوانترە لە فەرهەنگ. بە تێكڕای وشەكانی زمان دەوترێت فەرهەنگی گشتی زمان.

**فەرهەنگی هەموو زمانێكیش ، بریتییە لە :**




بەم شێوەیە دەكرێت فەرهەنگی گشتی بكەین بە دووبەشەوە :




١- فەرهەنگی بنەڕەتی : مەبەست لە فەرهەنگی بنەڕەتی كۆی ئەو وشانەیە كە لە زماندا هەن و كۆمەڵ بەگشتی لەسەری ڕێككەوتوون. فەرهەنگی بنەڕەتی ئەو وشانە

دەگرێتەوە کە بە خۆماڵی دادەنرێت. بریتییە لە فەرهەنگی وشەکانی زمان، ئەو وشانەی کە مرۆڤ هەر لە منداڵییەوە ئاشنایان بووە و هەست و خرۆشی پێیان جولاوە.[1]

فەرهەنگی بنەڕەتی پەیوەندی بە هەموولایەنەکانی ژیانی مرۆڤ و زانستە جۆراوجۆرەکانی دیکەش جگە لە زانستی زمانەوە هەیە. بەوێنە: ئەو وشانەی کە زمان پێکدەهێنن پەیوەندییەکی بەتینیان بە بیری مرۆڤەوە هەیە ( بنیامین لی وروف) پێی وایە کە : ((بنیاتی زمان ئەو شتەیە کە بیر دیاری دەکات و دەستی بەسەردا دەگرێت بە تەواوەتی. لەبەر ئەوەی ئەزموونی ناسینی جیهان لەلایەن مرۆڤەوە سەیرکردنیان بۆ جیهان دەگۆڕێت بە گۆڕانی ئەو زمانەی قسەی پێ دەکەن. هەروەها زانایانی وەك (همبۆڵدت و ساپیر و بنیامین لی وروف) تێبینی ئەوەیان کردووە کە بەرهەمی شارستانییەتی تایبەتە بە کۆمەڵەوە، کۆمەڵگا کشتوکاڵییەکان زیاتر ئەو وشانە بەکار دەهێنن کە تایبەتە بە لایەنە کشتوکاڵییەکانەوە. هەروەها زمانی عەرەبە کۆنەکان زمانی ژینگەیەکە کە تایبەتمەندییەکی دیاریکراوی هەیە لە خودی زمانەکەدا بەدی دەکرێت، میللەتانی (ئەسکیمۆ)ش کە لەناو ژینگەیەکی سارد و سڕدا دەژین چەندین زاراوەیان هەیە کە جۆرەکانی بەفری پێ دیاری دەکەن))[2].

لە زمانی کوردیشدا، ئەو وشانە زیاتر بەدی دەکەین کە تایبەتن بە ساردی و بەفرو باران و ناوی شاخ و دارستان وەك لە ناوی بیابان و جۆرەکانی خورما یاخود ماسی.

بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێت کە : هەموو زمانێك فەرهەنگی بنەڕەتی خۆی هەیە، فەرهەنگی بنەڕەتی زمانێك جیاوازە لە فەرهەنگی بنەڕەتی زمانێکی دیکە، تەنانەت ئەو زمانانەش کە سەربە یەك بنەماڵەو ڕەچەڵەکن.

– لێرەدا ئاماژە بە کۆمەڵێك لەو وشانە دەکەین، کە فەرهەنگی بنەڕەتی زمانیان پێکهێناوە:

١– ناوی خزمایەتیی، وەك : دایك، باوك، خوشك، برا، ئامۆزا، خاڵۆزا ... هتد.

٢– ناوی ئەندامانی لەشی گیانلەبەر، وەك : مێشك، چاو، دەست، دڵ، پێ ... هتد.

٣– ناوی ئاژەڵی ماڵی یان دڕندە، وەك : مریشك، ئەسپ، کەروێشك، پڵنگ، ... هتد.

---

(١) چاو پێکەوتن ، د.بەکر عومەر عەلی.

(٢) د. عمر ابراهيم عزيز، العلاقه بين اللغه والفكر، ل١٨٠.

٤- ئەو ناوانەی کە پەیوەندیان بەشت و دیاردە سروشتییەکانەوە هەیە، وەك : شاخ، کێو، دەشت، ڕووبار، دەریا ، ... هتد.

٥- ناوی خواردن و خواردنەوەی پێویست، وەك: نان، گۆشت، شیر، ... هتد.

٦- کۆمەڵێك ئاوەڵناو، وەك : ڕاست، چەوت، کۆن، نوێ، خۆش، ... هتد.

٧- ڕەنگەکان،وەك : سوور، سپی، شین، زەرد، ... هتد.

٨- ناوی شوێنی حەوانەوە، وەك : ماڵ، خانوو، ژوور، هەیوان ... هتد.

٩- ناوی ژمارە، وەك : یەك، دوو، چوار، بیست وسێ، چواردە، سەدوشەش، ... هتد.

١٠- چەکی خۆپاراستن یان ڕاوکردن، وەك : تەور، شیر، شمشێر، کێرد، داس، ڕم، ... هتد.

١١- ناوی ئامێری پیشەسازی، وەك : ئاش، هەوجاڕ، دەستاڕ، ... هتد.

١٢- ناوی بەروبومی کشتوکاڵی، وەك : میوە، دار، درەخت، سێو، سەوزە، ... هتد.

## ١- کورتە مێژوویەکی زاراوەسازی :

هەر لە سەدەی نۆزدەیەمەوە، زانایانی زیندەوەرزانی و کیمیا لە ئەوروپا دەستیان بە یەکخستنی ڕێساکانی دانانی زاراوە لەسەر ئاستی جیهان کرد. ئەم بزوتنەوەیە پلە بە پلە گەشەیسەند. ((لە ساڵانی (١٩٠٦ – ١٩٢٨)دا بەشەش زمان فەرهەنگی وێنەداری شلۆمان بۆ زاراوە تەکنیکیەکان، دەرچوو.

بایەخی ئەم فەرهەنگە لەوەدایە، کە لەسەر دەستی گروپێکی دنێودەوڵەتی لە شارەزایان دەرچووە و، بەپێی ڕیزبەندی ئەلف و بێی ڕێك نەخستراوە، بەڵکو لەسەر بنچینەی چەمکەکان و پەیوەندی نێوانیان ڕیزکراوە.

لە ساڵی (١٩٣١) کتێبی (یەکخستنی‌نێو دەوڵەتی زمانی ئەندازە) بە تایبەتی (ئەندازەی کارەبایی) دەرچوو، کە پرۆفیسۆر (ڤیستەر)، مامۆستا لەزانکۆی ڤیەنا کە لە ساڵی (١٩٧٧)کۆچی دوایی کردووە دایناوە، دوای ئەوەی چەندین بنچینەی پتەوی بۆ ئەم زانستە دانا، زۆربەی زمانەوانان و ئەندازیاران، ئەم کتێبە بە سەرچاوەیەکی گرنگی ئەم بابەتە دەژمێرن.

له سالّی (١٩٣٦)دا لەسەر داواکردنی یەکێتی سۆڤیەت (لیژنەیەکی تەکنیکی بۆ زاراوەکان) له ئەکادیمیای زانستەکانی سۆڤیەتی پێکهێندرا. لەژێر سایەی (یەکێتی جیهانی کۆمەڵەکان بۆ پێوانە نیشتمانیەکان ISA).

لەدوای جەنگی جیهانی، لیژنەیەکی نوێ جێگەی (لیژنەی تەکنیکی بۆ زاراوەکان) گرتەوە، بەناوی (لیژنەی تەکنیکی ٣٧)ی تایبەتکار بە دانانی زاراوە و ڕێکخستنیان. کە بەشێکە له (ڕێکخراوی جیهانی یەکخستنی پێوانەیی ISA)، کە جنیف بۆتە بارەگای ئەم لیژنەیە هەڵساون بە کۆششێکی زۆر له بواری یەکخستنی بنەماکانی دانانی زاراوە.

یەکێك لە پێشەنگە گەورەکانی بواری زاراوە سازی، کە شارەزایەکی گەورەی یونسکۆیە، (ئەدوین هۆلمستروم )ە، ئەم ڕێکخراوە جیهانیەی هاندا بۆ بنیاتنانی (فەرمانگەی زاراوەی نێو دەوڵەتی)، وە بودجەی دارایی پێویست دابین بکات بۆ بلاوکردنەوەی بیلۆگرافیایەك بەدووبەرگ، بەناونیشانی فەرهەنگە تایبەتمەندەکان له زانست و تەکنۆلۆژیادا. لەم دوایانەدا چاپێکی زیدەکراوی نوێی دەرچوو.

لەسالّی (١٩٧١) بە هاوکاری نێوان یونسکۆ و حکومەتی نەمسایی (مەرکەزی زانراوی نێودەوڵەتی زاراوەکان Infoterm) لە ڤیەنا دامەزرا. پرۆفیسۆر (هلموت فلبر Felber) مامۆستای زاراوەسازی لە زانکۆی ڤیەنا، کە ناسراوە بەچالاکی فراوان لەم بوارەدا سەرپەرشتی دەکات))[1].

ئەم بنکە یە چەندین کۆڕو سیمیناری جیهانی بۆ ئەم مەبەستە ساز کرد، یەکێ لەوانە کۆڕێکی جیهانی سەربارەت بە هاوکاری دەولی لە مەیدانی زاراوەکان ، دا کە لە ڤیەنا لە سالّی (١٩٧٥) بەسترا. لە ئاکامی ئەم سیمینارەدا، بنکەکە ڕێبەرێکی بەناوی ڕێکخراوە بەرکارەکان له بواری زاراوە و چالاکیەکانیاندا، دانا.

((ئەم بنکەیە بە هاوکاری ئەکادیمیای زانیاری سۆڤیەتی، بنکەیەکی زانیاری دەولی بۆ زاراوەکانی (أنفوترم) لەمۆسکۆ دانا، سەبارەت بە کێشە تیۆری و مەنهەجییەکانی زاراوە.

هەروەها بنکەکە لە ڤیەنا لە (٢٧-٣٠) تشرینی دووەمی (١٩٧٩)دا سیمینارێکی سازکرد بۆ لێکۆڵینەوە له فەرهەنگنوسی و پەیوەندی زاراوەسازی بە زانستەکانی دیکەوە و پێویستی گەشەپێدانی بانکی زاراوەکان بەتایبەتی له بوارە دیاریکراوەکاندا.

---

(١) د. علي القاسمي، مقدمة في علم المصطلح، ل ١١-١٣.

دواهەمین کۆبونەوە لەبارەی زاراوەسازی (سیمیناری جیهانی لەبارەی گیروگرفتەکانی هاواتایی و پێناسە لە زاراوەسازیدا) کە لە (کوبیك) لە کەنەدا لە حوزەیرانی (١٩٨٢) بەسترا و هەروەها سیمینارێکی تایبەت بە زاراوەسازی لە کۆنگرەی جیهانی فەرهەنگسازیدا زانکۆی (ئەکستەر) لە ئەیلولی (١٩٨٣)دا))[١] پێشکەشکرا.

## ٢- کورتە مێژوویەکی زاراوەسازی کوردی

زاراوە لەزمانی کوردیدا بەرێگایەکی ناهەمواری پێشکەوتندا تێپەڕیوە و هەمیشە لە کێشەدا بووە. بەڵام هیچی لەبارەوە نەنوسراوە ولێی نەکۆڵدراوەتەوە.

مێژووی زاراوە لە زمانی کوردیداپەیوەستە بە مێژووی پێشکەوتنی زمانی کوردییەوە. ئەگەر تەماشای کاری فەرهەنگنووسی کوردی بکەین، کێشەی زاراوەی کوردی دەبینین بە وێنە لە ((نەوبەهار))ی ئەحمەدی خانی و((ئەحمەدی)) شێخ مارفی نۆدێی و((الهدية الحميدية في اللغة الكردية))ی یوسف زیائەدین خالدی پاشا و ...هتد گەلێك زاراوەی وەها تۆمارکراون کە ئێستا سەرچاوەن و پەنایان بۆ دەبەین. شێخ مارفی نۆدێی کە ((پشتێر))ی بەرانبەر بە ((اصطبل)) و ((شاگرد))ی بەرانبەر بە ((تلميذ)) بەکارهێناوە. ئەوەکێشەی زاراوەی ئەوکاتەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە.

لەم ساڵانەی دواییدا فەرهەنگنوسەکانمان لە فەرهەنگەکانیان گەلێك زاراوەی کوردییان تۆمار کردووە، بەوەدا پێشکەوتن و گەشەسەندنی زاراوەی کوردیمان بۆ دەردەکەوێ.

بەوێنە : ((مامۆستا گیوموکریانی ((هەندەران))ی بۆ ((خارجية)) و ((شارەوانی)) بۆ ((بلدية)) داناوە، مامۆستا مەردۆخ ((پاژ ))ی بۆ ((جزء)) و ((ڕژد))ی بۆ ((حريص)) بەکارهێناوە. مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ (( پەیجور))ی بۆ ((تحقيق الشرطة)) و ((وەرزش))ی بۆ ((رياضة)) تۆمارکردووە، مامۆستا تۆفیق وەهبی ((پار)) ی بۆ ((فصل الكتاب)) و ((دادخوان)) ی بۆ ((مشتكي)) بەکار هێناوە

---

(١) سەرچاوەی پێشوو ، ل١٦-١٧.

مامۆستا قەناتی کوردۆ ((بەرەڤان)) ی بۆ (( حکم)) و ((فێرگە)) ی بۆ ((مدرسة)) نووسیوە ... هتد))[1].

مێژووی دانان و سازکردنی زاراوە لەچاوکاری فەرهەنگ نووسین دا دواکەوتووە و دانانی زاراوەی کوردی بە تایبەتی لەدوای شۆڕشی (١٤)ی تەمووزی ساڵی (١٩٥٨) ەوە برەوی سەند. کاتێك خوێندن لە زۆربەی خوێندنگاکانی کوردستان کرایە کوردی، پێویستی زاراوەی زانستی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و پەروەردەیی و چەندین بواری دیکە هاتە پێشەوە. بەم بۆنەیەوە مامۆستایانی کوردستان چەند لیژنەیەکیان پێکهێناو کۆمەڵێك زاراوەی پێویستیان داناو لە گۆڤاری (ڕۆژی نوێ) دا بڵاویان کردەوە.

ئەم کارە لە سنووری قوتابخانە تێپەڕی و فراوانتر بوو، ژمارەیەك پسپۆڕی دڵسۆز و هەندێ دەزگای کوردی و لیژنەی تایبەتی، خۆیان بەدانانی فەرهەنگی زاراوە وە خەریك کرد و نەقابەی مامۆستایانی سلێمانی کۆمەڵێك زاراوەی زانستیان لە شێوەی فەرهەنگۆکدا ڕێکخست و بڵاویانکردەوە.

مامۆستا جەمال نەبەز لە ساڵی ١٩٦٠ لە ژێرناوی (هەندێك زاراوەی زانستی) فەرهەنگۆکێکی لەچاپ دا، (( لە ساڵی ١٩٦١ دا بەرۆنیۆسەدنوسخەیەکی کتێبەکەی لەژێر ناوی ((فەرهەنگۆکی زانستی)) دا بلاو کردەوە. یەکەمیان نزیکەی سێ سەد زاراوەیەك دەبێت ودووەمیان دەوروبەری سێ هەزار زاراوەیەك دەبێ ))[2].

گۆڤاری (پەروەردە وزانست)یش کە بەڕێوەبەرایەتی خوێندنی کوردی لە بەغدا دەری دەکرد، لە ساڵی (١٩٧٢)دا ژمارە (٤) ی خۆی تەرخان کرد بۆ هەموو ئەو زاراوانەی کە لە بابەتە جۆراو جۆرەکانی خوێندنگاکاندا بەکار دەهات.

هەروەها بەرهەمەکەی مامۆستا (کەمال جەلال غەریب)، بە ناوی (فەرهەنگی زانیاری) لەم بوارەدا ڕۆڵێکی بەرچاوی هەیە.

هەروەها هەوڵەکانی کۆڕی زانیاری کورد لەبەغدا بەرهەمێکی باشی لە زاراوەی جۆربەجۆر بە چاپ گەیاند و بڵاوکردەوە.

---

(١) ئەنجومەنی کۆڕ، لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ، گۆڤاری کۆڕی زانیاری،ب٣، بەشی یەکەم، ل٤٩٩

(٢) جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی، ل ١٨.

(( وەزارەتی پەروەردەی هەرێمی کوردستانیش هەر لە ڕۆژی دامەزراندنیەوە لایەنی فەرهەنگ و زاراوەی بابەتەکانی خوێندنی فەرامۆش نەکردووە، بەردەوام هەوڵی بەرچاوی لەم بوارەدا هەبووە، لاپەڕەکانی گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی) شایەتی ئەوەن، کە هەر لەژمارە (٤)ی ئەم گۆڤارەوە هەرجارەو کۆمەڵێك زاراوەی پێویست بەهەرسێ زمانی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی بڵاودەکاتەوە، هەروەها (فەرهەنگی مامۆستا) شی لەچاپداوە، کە زاراوە جۆربەجۆرەکانی هەموو بابەتەکانی خوێندنی تێدایە. بەکوردی کردنی زمانی خوێندن لە ئامادەییە پیشەییەکان و پەیمانگاکانی پێگەیاندنی مامۆستایان دا پێویستی بە شارەزایانی زمانی کوردی بوو، بەتایبەتی لە ڕووی زانستییەوە وەکو بابەتەکانی کارەبا و ئەلیکترۆن و ئۆتۆمبیل و دارتاشی لە خوێندنی پیشەسازیدا و لقەکانی کشتوکاڵی و بازرگانی، ئەمەش هەنگاوێکی دیکەی وەزارەتی پەروەردە بوو، بۆ دەوڵەمەندکردنی زمانەکەمان لە ڕووی بەکارهێنانی لە بابەتە زانستییەکانداو پانتایەکی لەباری دروست کرد بۆ خوێندن لە هەموولقەزانستییەکاندا.

هەر پرۆژەیەك دەربارەی پەرەپێدانی زمانی کوردی، یان دانانی فەرهەنگێکی کوردی بێت یەکەم دەزگا، وەزارەتی پەروەردە دەگرێتەوە. هەر ئەویشە بەشێوەیەکی سەرەکی سودی لێ وەردەگرێت، دیارە بەکارهێنانی زمانی کوردی لە دانانی بەرنامەکانی کۆمپیوتەردا تۆمارکردنی بابەتەکانی لە تۆڕی ئەنتەرنێتدا، زمانەکە دەباتە قۆناغێکی نوێی هاوچەرخ و ئەمەش یەکێکە لە کارە هەرە پێویستەکانی وەزارەت))[1].

لەدوای ڕاپەڕینە مەزنەکەی میللەتەکەمان وبەتایبەتی لەم چەند ساڵەی ڕابردوودا زاراوە دانان گوڕ و تینێکی مەزنی بەخۆوە بینیوە و گۆڕاوەو گەشەی سەندووە، هەنگاو بە هەنگاو، بەپێی پێشکەوتنی زانست و زانیاری و فراوان بوونی بواری ڕاگەیاندن لە تەلەفزیۆن و ڕادیۆ لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا و ئاڵوگۆڕکردنی زانیاری لەگەڵ میللەتانی دیکەدا، لەڕێگای سەتەلایت و ئینتەرنێت و فاکس و ئامرازەکانی دیکەی گەیاندنەوە.

---

(١) محەمەد ئیسماعیل، ئەم هەنگاوەی لقی هەولێری یەکێتی نووسەران، هیوایەکی گەشە لەڕێی دانانی فەرهەنگی یەکگرتووی کوردی، نوسەری نوێ، ژ١٩، ل ١٧–١٨.

## ٣- زاراوه دانان وەك زانست

زاراوه سازىو دانانى زاراوه، به مەبەستى پێكهێنانى زمانێكى زانستى بۆلقه زانستييه جياجياكان، پێويستييەكه بۆ هەموو زمانەكان بەرانبەر بە هەر چەمكێكى نوێ لە بواره جياجياكانى ژياندا.

### پێناسەى زاراوه سازى :-

زاراوه سازى بەم شێوەيه پێناسه دەكرێت:-

((ئەو زانستەيه كەوا له پەيوەندى نێوان چەمكه زانستييەكان و زاراوەكانى زمان، كەئەو چەمكانه دەردەبڕن دەكۆڵێتەوه ))[1].

### گرنگى زاراوه سازى:-

گۆڕان و پێشكەوتنەخێراكانى زانست، هۆيەكى سەرەكى بوون بۆ زياد بوونى چەمك و واتاكان، تاوەكو ژيان بەرەو پێشتر بڕوات، واتاكان بێ سنوور تر دەبن، بەڕادەيەك كە وشەكانى زمان بەشيان ناكات، لەبەر ئەوه پێويست دەكات بەدواى شێوازى چاككردنى ئەم كێشەيەدا بگەڕێين و بە شێوەيەكى زانستيانە هەوڵى دانان و هەڵبژاردنى زاراوەى نوێ بدەين كه بەوردى ئەو چەمكانه دەربڕن.

دانانى زاراوەو هەڵبژاردنيان و لێكۆڵينەوەو يەكخستنيان بووه هۆى سەرهەڵدانى زانستێك، بە ناوى (زانستى زاراوەسازى)، كه لە نێوان چەندين زانستى ديكەدا هاوبەشى دەكات. زۆر بوونى زاراوەكان، بووه هۆى بەكارهێنانى كۆمپيوتەرو پێكهێنانى بانكى زاراوەكان، بۆئەرشيف كردنى زاراوەكان و هەموو ئەو زانياريانەى پەيوەنديدارن بە زاراوه سازى وەك سەرچاوەو دام و دەزگا كاراكان لەم بوارەدا.

ئاشكرايه يەكخستنى زاراوه زانستييەكان، هەوێنى دابين كردنى يەك زمانى زانستييه، كه ئەويش ڕێگا خۆشكەره بۆپێكهێنانى يەكێتى نەتەوەيى، بۆ جێ بە جێ كردنى ئەم پرۆسەيەش پێويسته:-

١. (تيۆرى گشتى زاراوه سازى)، بنەماكانى زاراوه سازى زانستى و تەكنەلۆژى بە زمانى كوردى بخوێندرێت.
٢. دروست كردنى بانكى زاراوه وەك دەزگايەكى سەربەخۆ.

---

(١) د. علي القاسمي، مقدمة في علم المصطلح،ل ١٨.

٣. دامەزراندنی کۆڕێکی زانیاری وەك دەزگایەکی ئەکادیمی و دەسەڵاتدار.

٤. هاندانی لێکۆڵینەوەو نوسین لە سەر بابەتی تیۆری گشتی زاراوە سازی و تیۆری تایبەت بە زاراوەکان بۆ لیکۆڵینەوە لە سیستەمی واتاکان لە بوارە جیا جیا کانی زانست و زانیاری بۆ ئاسانکردنی دانانی زاراوەی بەرانبەریان.

## ٤- زاراوە دروست کردن

هێزی مرۆڤ لە هێزی زمانەکەیدایە، دەوڵەمەندبوونی زمانیش دەوڵەمەندبوونی خۆی دەگەیەنێ، چونکە ئاوێنەی ژیانیەتی، هۆیەکی کاریگەریشە بۆ لە یەکتر گەیشتن و ئاڵگۆڕ کردنی بیروراو پێکەوە ژیان.

((زاراوە لە هەموو زمانێکی زیندوودا، بەشێکی زۆری وشەکانی ئەو زمانە دەگرێتەوە، ئەم بەشەش بابەتەکانی زانست و رۆشنبیری و ئەدەبی و هونەری و ئابوری و رامیاری و...هتد دەگرێتەوە.

زاراوە بنچینەی زمانی ستانداردی نەتەوەیە، دیالێکتەکانی لەیەك نزیك دەکاتەوە، دەبێتە هۆی پێکهینانی یەکێتی دەربرین و بنچینەی ئامرازو هزرو بیرو داهێنان بۆ نەوەکانی داهاتوو بەیەکگرتوویی))[1].

ئەو زانستەی کە لە چۆنیەتی دروست کردن و پێکهاتنی وشەکانی ئەمرۆی زمان دەکۆڵێتەوە پێی دەوترێت وشە رۆنان(Word Formation)

جگە لە فەرهەنگی بنەڕەتی، کە سەرچاوەی یەکەمی لە دایك بوونی وشەیە لە زماندا، داتاشین و دروست کردنی زاراوەش بەشێکی چالاك و سەرچاوەیەکی دیکەی دەوڵەمەند کردنی فەرهەنگی زمانە ((هەرچەندە رەگی وشە مانای سەرەکی وشە هەڵدەگرێ، بەڵام هیچ زمانێك ئەو توانایەی نییە تەنیا بە رەگ و وشەی سادە مەبەست دەربڕێ))[2].

پێشکەوتنە خێراکانی زانست و بیرو هزری مرۆڤ، زیاد بوونی بەرهەم بوونەتە تەگەرە لەبەردەم دۆزینەوەی زاراوەی تەواوو گونجاوی سەرجەم بوارەکانی ژیان. بە شێوەیەك هاویەکسانیەك نابیندرێ لە نێوان چەمکە زانستییەکان و ئەو زاراوانەدا کە دەریاندەبڕن. بۆیە هەمیشە پێویستمان بە پەیداکردن و هاتنەکایەی وشەی نوێ هەیە، وشەکانی زمان

---

(١) محەمەد وەسمان، گیروگرفتەکانی زاراوە دانان لە زمانی کوردیدا،ل ٥٠.

(٢) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، وشە رۆنان لە زمانی کوردیدا،ل ٣١٠.

گۆڕانیان بەسەردا دێت، هەندێکیان بە تێپەڕبوونی کات لە بەکارهێنان دەکەون، بەڵام لە زماندا بزوتنەوەیەکی بێ وچان و بەردەوام لە ئارادایە، وشەی نوێ دروست دەبێت لەسەر بنچینەی ئەو وشانەی کە لە زووەوە لە زمانەکەدا هەن، بۆ ئەم مەبەستەش چەند ڕێگایەك هەیە، کە لەزماندا پەیڕەو دەکرێت، لە هەموویان گرنگتر دارشتنە.

دارشتن : یەکێکە لە ڕێگاسەرەکییەکانی دروست کردنی زاراوە لە زمانی کوردیدا، لەبەر ئەوەی بەپێی ئەو دابەشکردنانەی زمانەوانان بۆ زمانەکانی جیهانیان کردووە، وەك ئەو دابەشکردنەی کە زمانەوانی سەدەی نۆزدەیەم (ولیەم ڤۆنت هامبۆلدت) بۆ زمانەکانی جیهانی کردووە، کە بەپێی پەیوەندی نێوان مۆرفیمەکان لەناو قاڵبی وشەدا زمانەکانی جیهانی دابەش کردۆتە سەر سێ جۆر : ((نووساو، تواوە، دوورەپەرێز))[1].

هەروەها ئەو پۆلێنەی کە زمانەوانیی هاوچەرخ لە ڕوانگەی ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەر پێکهاتەی مۆرفۆلۆژی زمانەکاندا هاتووە، کە بۆ پۆلێنکردنی زمانەکانی جیهان بنەمای نوێیان خستۆتە بەردەست، لە ئەنجامی پەیڕەوکردنی ئەو بنەمایە نوێیەدا، زمانەکانی جیهانییان بەپێی فۆرمسازی وشە بۆ چەند جۆرێك دابەشکردووە کە بریتین لە :

(( ١- زمانە شیکراوەکان. ٢- زمانە لکاوەکان.

٣- زمانە ئاخنراوەکان. ٤- زمانە نێوان گرەکان.))[2]

زمانی کوردی کە سەر بە خێزانە زمانی کۆمەڵەی ئێرانیی بنەماڵەی هیندۆ ئەوروپییە، دەکەوێتە کۆمەڵەی زمانە لکاوەکان (نوساوەکان) (Agglutinating language) سروشتی ئەم جۆرە زمانانەش ((دروست کردنی وشە دەکاتە پێوەرو پێ لەسەر سیفەتەکانی وشە دادەگرێت))[3]. مەبەست لەو سیفاتانە ئەوەیە، کە زۆربەی وشەکان لەم جۆرە زمانانە ((لە ژمارەیەك مۆرف پێك دێ وە هەریەکە لەو مۆرفانە مۆرفیمێ دەنوێنێ ، ئەم جۆرە زمانانەش بەوە دەناسرێنەوە، کە گیرەك بۆ ڕەگی وشە زیاد دەکەن بە مەبەستی گۆڕینی واتا)).[4] زمانی کوردی کە دەکەوێتە ناو ئەم گروپەوە ژمارەیەکی زۆر لە وشەو

---

(١) د. وریا عومەر ئەمین، چەند ئاسۆیەکی تری زمانەوانی،ل ١١٦ -١١٧.

(٢) ئەبوبەکر عومەر قادر، بەراوردێکی مۆرفۆسینتاکسی لە زمانی کوردی و فارسی دا،ل ٥.

(٣) Crystal, A dictionary of linguistics and phonetics,P.١٣.

(٤) د.محمد علي الخولي، معجم علم اللغة النظري، انكليزي – عربي، ل٩.

دەربڕینەکانی ناسادەن واتە (لیکدراو و داڕێژراون). دەتوانین بە زمانێکی جەمسەرگر ناوی ببەین کە پێشگر و پاشگرەکان دەلکێن بە جەمسەری وشەکانەوە.

زاناکان لە ڕوانگەی جیاوازەوە دەڕواننە دارشتن :

١- بە دیدی (ساپیر) : ((پێویستی دارشتن لە زماندا پێویستییەکی دەروونییە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە هیچ زمانێ ناتوانێ ئەو هەموو بیرو چەمکانەی دەوروبەری خۆی بەهۆی وشەی سادەوە دەربڕێ لەبەر ئەوەی زانین بێ پایانەو کەرەسەی دەوڵەمەنترین زمان لە چاویدا کەمەو کۆتایی هەیە.

٢- دیر مەند لە ڕوانگەی واتاو ئەرکەوە لە دارشتن دەکۆڵێتەوە))[1].

وشەی داڕێژراو : بریتییە لە مۆرفیمێکی سادەی واتادارو زیادییەك، جا ئەو زیادییە پێشگر یان ناوگریان پاشگربێت. (لەم ڕووەوە ناوگر لە زمانی کوردیدا کارا نییە).

لە بەر ئەوەی کە پێشگرو پاشگر جۆرێکی تایبەتن لە مۆرفیم سەرەتا ئاورێك لە مۆرفیم و ئەو ئەرکانە کە لە ڕووی دارشتنەوە دەیبینن دەدەینەوە :-

زانین و شارەزا بوونی مۆرفیمەکان و دیاریکردنی دەورو ئەرکیان لە زماندا کارێکی گرنگە. کەرت کردنی وشە بۆ سەر مۆرفیمە پێکهێنەرەکانی نەك هەر سوودی هەیە بۆ زانینی چۆنیەتی پێکهاتن و دروست بوونی وشە، (( بەڵکو یاریدەی ڕۆنانی وشەی نوێ دەدات. زۆرجار وشەی نوێ لە مورفیمە چالاکەکانی زمان دروست دەکرێت و ئەمەش سەرچاوەیەکی گرنگی تەواو کردن و دەوڵەمەند کردنی زمانە))[2].

لەبەرئەوەی ((هێما زمانییەکان، یەکەی یەکگرتووی ڕێکخراون، ئەمەش مانای وایە قسەکەر دەتوانێ ئەم هێمایانە بەش بەش بکات، هەروەها دووبارە یەکی بخاتەوە، بۆ دەر بڕینی مانایەکی جیا، ئەم خاسیەتە زمانەوانییەش پێی دەوترێت لەتکردنی دوولایەنە، (Doublesegmentation). هەروەك باوە زماناسەکان ئاماژە بە دوو جۆر کەرتکردن دەکەن:

١- کەرت کردنی پێکهاتەکان بۆ مۆرفیمەکانیان ئەمەش پێی دەڵێن (کەرتکردنی یەکەم)

٢- دابەش کردنی مۆرفیمەکان بۆ دەنگەکان ئەمەش پێی دەڵێن (کەرتکردنی دووەم) ))[3]

---

(١) کەوسەر عزیز ئەحمەد، بیردۆزی مۆرفیم و هەندێ لایەنی وشەسازی کوردی، ل٧٥.

(٢) د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، وشە ڕۆنان لە زمانی کوردیدا،ل ٢٨.

(٣) د. محمد محمد یونس، مدخل الى اللسانيات،ل ٣٢.

((بیری مۆرفیم لە سەرەتای چلەکاندا هاتە کایەوە))[1] دوای ئەوەی زاناکان گەڕان بە دوای دۆزینەوەی دانەیەکی ڕێزمانی وەکو فۆنیم، کە لە توانایدا بێت هەموو زمان شیبکاتەوە، یان ڕێزمان بگۆڕێتە سەری ئەویش (مۆرفیم) بوو.

گەڕان بە دوای دۆزینەوەی دانەیەکی ڕێزمانی وەك مۆرفیم دەگەڕێتەوە بۆ یەکدیگیر نەبوونی زمانەوانان لە سەر پێناسەیەکی تەواوی وشە، لەبەر ئەوەی ((ڕێزمانی تەقلیدی وشەی بۆ شیکردنەوەی زمان بە بنچ داناوە))[2] بۆیە هەمیشە وشە وەك بچوکترین دانەی واتادار سەیری کراوە، بەڵام دەرکەوت چ بە پێوانەی فۆنۆلۆژی یان سیمانتیکی، ناتوانرێت پێناسەیەکی وای وشە بکرێت، کە بشێ تیۆرێکی گشتی لە سەرڕابنرێ و بکرێ بە پێوانە بۆ شیکردنەوەی زمان.

پێناسەی مۆرفیم بە چەند جۆرێك کراوە، زمانەوانان لەم ڕووەوە بۆچوونی جیاوازو هاوبەشیان هەیە. هەندیکیان لە ڕوانگەی واتاوە لە دیاردەکە دەڕوانن، هەندێکی دیکەیان لە ڕوانگەی ئەرك و واتاوە بۆی دەچن.

٥- بەخستنە ڕووی چەند پێناسەیەك هەندێ لە تایبەتی و مەرجەکانی مۆرفیم باس دەکەین :-

١- ((مۆرفیم بچووکترین یەکەی واتاداری زمانە))[3].

لەبەر ئەوەی لە زانستی زمانی نوێدا ، ئەرك یەکسانە بە واتا، مۆرفیم دەبێ ئەرکی هەبێ یان دەبێ واتای هەبێ :

أ- مۆرفیمی واتادار هەموو وشە فەرهەنگییەکانی ، وەك :

ناو ، ئاوەڵناو ، کار ، ئاوەڵکار ...هتد دەگرێتەوە.

ب- مۆرفیمی ئەرکی، وەك هەموو گیرەکەکان :

ڕێزمانی و وشەداڕێژ



---

(١) د. محمەد مەعروف فەتاح، زمانەوانی،ل ٧١.

(٢) وریا عومەر ئەمین، مردنی وشە، کاروان، ژ٤٥، ل٨.

(٣) Bloomfield, Language,P,١٦١,

جـ - ئاماژەکردن بەوەی کە مۆرفیم بچووکترین یەکەی زمانییە، هێمایە بۆ ئەو ڕاستییە زمانەوانییەی کە ناتوانرێت مۆرفیم بچووکتر بکرێتەوە بەبێ ئەوەی واتایان ئەرکی ڕێزمانی لەدەست بدات :

چاو :     چ - او

ەکە :     ە - کە ... هتد.

٢-(( هەموو کەرەسەیەکی ڕێزمانی بۆ چەند دانەیەکی بچووك شی دەکرێتەوە کە پێی دەووترێت (مۆرفیم) )).[(١)]

أ - وشەکانی زمان لەڕووی دارشتنەوە دابەش دەبن بۆ : سادەو دارێژراوو لێکدراو.

١- وشە ناسادەکان بۆ مۆرفیمە پێکهێنەرەکانیان کەرت دەکرێن، وەك :

کوردایەتی :     کورد + (- ایەتی )

سەرانسەر :     سەر + ان + سەر

٢- وشە سادەکان کەرت ناکرێن ئەگەرچی هەندێ وشە بە ڕوخسار وا دەردەکەوێت، لەبەر ئەوەی لە فەرهەنگی زمانەکەدا بۆ ئەم مەبەست و واتایە دانراون و یەکەیەکی واتایی سەربەخۆن و دارشتنێکی پتەویان هەیە.

ئەگەر وشەی سادەکەرت بکەین ئەوا تەنیا کەرت کردنە بۆ دەنگە پێکهێنەرەکانی، نەك بچووکترین دانەی واتایی یان ئەرکی ((لەگەڵ ئەوەی دەنگێك یان چەند دەنگێك بەهەند دادەنرێت بۆ نواندنی مۆرفیم، بۆ نموونە : نە/ نا کە مۆرفیمی ناکردن دەنوێنن لەگەڵ ڕەگی کاردا. مەرج نییە لە پێکهاتەی تردا هەمان ئەرکیان هەبێت، بۆ نموونە (نەمام، ناکام) یەك وشەی سادەن و یەك مۆرفیمن، واتە نە/نا لەم دووپێکهاتەدا فۆنیمن لە هەمان کاتدا لە وشەکانی نەخۆش / ناپاك دا وەك مۆرفیم سیفەتیان پێچەوانە کردۆتەوە ))[(٢)].

ب - مۆرفیم بچووکترین دانەی زمانە لە ئاستی ڕێزماندا بە قەوارەی جیاجیا کاردەکات، وەك :

١- بـ :  لە برۆ، بکوژ (نیشانەی فرمانە و گیرەکێکی ڕێزمانییە )

---

(١)د. محەمەد مەعروف فەتاح، زمانەوانی، ل٧١.

(٢) ئەبوبەکر عومەر قادر، بەراوردێکی مۆرفۆسینتاکسی لە زمانی کوردی و فارسی دا، ل١٥ - ١٦.

٢- ب : له بنوس، بكەر دا ( گیرەكێكی وشەدارێژەرە و وشەی نوێ دادەرێژێ و بەشی ئاخاوتن دەگۆڕێ ).

٢- مۆرفیم (( بچووكترین دانەی واتاداری زمانە له فۆنیمێ یان زیاتر پێك دێت ))[1].

١- مۆرفیم دەشێ لەیەك فۆنیم پێك هاتبێ، وەك :

ك : دەسك ، پەتك ، دڕك ... هتد.

٢- مۆرفیم دەشێ لەیەك فۆنیم زیاتر پێك هاتبێ، وەك :

ۆڵ : ئاسكۆڵ

ایەتی : كوردایەتی ، خوشكایەتی

٣- ستگابێرگ ، له یەكێك له خاڵەكانی كه بۆ پێناسەی مۆرفیمی كردووە، دەڵێت : ((لە چەند شێوەیەكدا دووبارە دەبێتەوە، بەڵام تا ڕادەیەك واتایەكی نەگۆڕ دەبەخشێت))[2]. بەپێی ئەم پێناسەیە، مۆرفیم دەبێ بەواتای نەگۆڕ لەژینگەی جیاواز دووبارە ببێتەوە :

ئەم خاڵە دەتوانرێ بە دوو ڕیانی مۆرفیم و ڕەگەكان دابنرێ لە وشەیەكی وەكو (نایاب) دا :

ئەگەر نا : بەمۆرفیمی بەند دابنرێ. ئەوا،

یاب : دەبێ مۆرفیم بێ، بەڵام تەنیا لەو شوێنەدا هاتووە و دووبارە نابێتەوە. بۆیە دەبێ بەیەكێك لەم دوو بۆچوونەی خوارەوەدا لێكۆڵینەوەی بۆ بكرێت:

بۆچوونی یەكەم :- ئەگەر (نا) به مۆرفیم دابنرێ ناچاردەبین (یاب) یش به مۆرفیم دابنێین، ئەوكاتە (یاب) دەبێتە ڕەگی وشەكە. چونكە لایەنی زۆری واتای وشەكە بۆ خۆی ڕادەكێشێ، بەڵام بەهۆی ئەوەی كه (نا) ڕۆڵی نەفی یان پێچەوانە كردنەوەی نەگێڕاوە، ناكرێت به مۆرفیمی دابنێین (تەنیا لەم شوێنەدا).

بۆچوونی دووەم : بەهۆی ئەوەی كه (نا) مۆرفیم نییە و (یاب) لە فەرهەنگی زمانی كوردیدا هەڵگری هیچ واتایەك نییە و لەهیچ ژینگەو وشەیەكی دیكە دا دووبارە

---

(١) د. وریا عومەر ئەمین، چەند ئاسۆیەكی تری زمانەوانی،ل٢١٢.

(٢)Stageberg, N.c. An Introductorty English grammer , P.٨٣.

نابێتەوە دەبێ : ( نا + یاب) بە ئەسڵی یەك وشەی (نایاب) دابنرێ و بەو شێوە ڕیزە دەنگیەوە دەچێتە فەرهەنگی زمانەکەوە.

((بەتێبینی ئەوەی کە بۆ ئەم لێکدانەوەیە تەنیا دۆخی ئێستای زمانمان لێکداوەتەوە، نەچووینەتەوە ناو مێژووی زمان))[1].

لەو تایبەتیانەدا کە زمانەوانەکان بۆ مۆرفیمیان دیارکردووە، خاڵی سەرنج ڕاکێش لە پێناسەکانی (کاتامباو) و (کریستاڵ) دەردەکەوێت، کە مۆرفیم جیا دەکەنەوە بۆ مۆرفە پێکهێنەرەکانیان :

١- ((شیتەڵ کردنی وشەکان بۆ مۆرفیمەکان بەجیاکردنەوەی مۆرفەکان دەست پێدەکات)).

٢- ((مۆرفیمەکان یەکەی ئەبستراکتن و لە قسەکردندا جیادەکرێنەوە و بە (مۆرف) ناودەبرێن))[2].

بە سەرنج دان لە پێناسەی زمانەوانان و دەرخستنی هەندێ لە تایبەتی و مەرجەکانی مۆرفیم دەگەینە چەند ڕوونکردنەوەیەك :

١- مۆرفیم و فۆنیم سەربە دووئاستی (مۆرفۆلۆجی، فۆنۆلۆجی) جیاوازن، ناتوانین، بڵێین:- مۆرفیم لە فۆنیم پێکهاتووە، بەڵکو مۆرفیم بەهۆی مۆرفەوە دەنوێنرێت کە لە دەنگ پێکهاتووە.

٢- مۆرفیم دانەیەکی بنەڕەتی ئاستی ڕێزمان (وشەسازی – سینتاکس)ە –وەك یەکێك لە پێکهاتەکانی ڕستە ئەرکێك یان واتایەك دەگەیەنێت.

٣- ((ناوچەی ئاستەکانی ڕێزمان و فەرهەنگەوانی و وشەسازی هەرچۆنێك دابەش ببن و سنووریان چەندیش تێکبچڕژێ ئەمانە هەموویان لە قاڵبێکدا هاوبەش دەبن و لە هەموو یاندا مۆرفیم دانەیەکی بنەڕەتییە))[3].

---

(١) محەمەد مەعروف فەتاح، زمانەوانی،ل ٨٦.

(٢) ئەبو بەکر عومەر قادر، بەراوردێکی مۆرفۆسینتاکسی لە زمانی کوردی و فارسی دا،ل ١٦.

(٣) کەوسەر عەزیز ئەحمەد،بیردۆزی مۆرفیم و هەندێ لایەنی وشە سازی کوردی،ل ١٩ .

بەهۆی ئەوەی کە پەیوەندی نێوان فۆرم و واتا پەیوەندییەکی لەخۆوەیە، دەشێت :

١- تاکە مۆرفیمێك لە چەند شێوەیەکی (فۆنۆلۆجی) جیاجیادا دەرکەوێت کە بە (ئەلۆمۆرف) ناودەبردرێت، وەك: (ەکە، کە، یەکە، ۆکە ... )

٢- یەك فۆرمی مۆرفۆلۆژی چەند مۆرفیمێك بنوێنێت، وەك :

ان: لەوشەی (مندالآن) دا، ئەرکی کۆکردنەوەی ناوی بینیوە.

ان : لەوشەی (سەیران) دا،ئەرکی دارشتنی وشەیەکی نوێی بینیوە.

((ئەگەر پەیوەندی نێوان وشەو واتاکەی پەیوەندییەکی لەخۆوە نەبێت، زمانەکان جیاواز نەدەبوون. لەمەشەوە بۆمان دەردەکەوێت کە هەڵبژاردنی هێما و هێما بۆکراو کارێکی لەخۆوەیە ملکەچی هیچ یاساو هۆیەکی دیاریکراو نابێت، لەبەر ئەوەی زمانی مرۆڤ، جیاوازە لەگەڵ هێمایەکانی دیکەی ئیشارەتدان وەکو : گلۆپی هاتوچۆ، یاخود (خاچی مەسیح) کە ئیشارەت بۆ ئەوە دەکات مەسیح لە خاچ دراوە ))[1].

٦- دەکرێ جۆرەکانی مۆرفیم بە دوو شێوە دابەش بکەین :

١- بەپێی گەیاندنی واتا دابەش دەکرێ بۆ دوو پۆل :

أ- مۆرفیمی سەربەست :

ئەو مۆرفیمەیە کە بەتەنها دەردەکەوێت و واتایەکی سەربەخۆی هەیە

ب - مۆرفیمی بەند :

ئەو مۆرفیمەیە کە بەتەنها ناوترێت و واتا نابەخشێت، دەچێتە سەر وشە یان مۆرفیمێکی دیکەو واتا دەبەخشێت.

مۆرفیمی بەند بەپێی ئەو ئەرکەی لە زماندا دەیبینن ، دووجۆرن :-

١- مۆرفیمی بەندی رێزمانی (Functional affixes )

ئەوانەن کە ئەرکی رێزمانی دەبینن بۆ رێکخستنی پەیوەندی نێوان وشەکان. لەبەر ئەوەی وشەکانی زمان لەناو خۆیاندا، پەیوەندی هەمیشەیی یان هەیە. ((بۆ دەربرینی هەر مەبەستێك وشەکان بەپێی دەستووری ئەوزمانە دەچنە پاڵ یەك و فۆرمی پێویستی خۆیان

---

(١) د. محمد یونس، مدخل الی اللسانیات،ل ٢٨.

پێك دەهێنن و مەبەستی دیاریكراو دەگەیەنن))[1]، وەك: (ەكە، دە، ب، نا، نە، مە ... هتد).

٢- مۆرفیمی بەندی وشە دارێژ (derivataional affixes) : ئەوانەن كە ئەركی دارشتن دەبینن.

٢- بەهۆی شوێنی پێوەلكانیان دابەش دەبن بۆ :- (پێشگر ، ناوگر ، پاشگر ).

مۆرفیمی وشە دارێژ (پێشگر، پاشگر ) و دەرخستنی هەندێ لە تایبەتییەكانیان و دەوریان لە چۆنیەتی سازكردنی زاراوەی دارێژراوی زمانی كوردیدا دەبێتە تەوەرەی بەشی یەكەمی باسەكەی ئێمە:-

دەكرێت سەرپاكی مۆرفیمەكان لە هێڵكاریەكدا بخەینە روو :-




(١) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، وشە رۆنان لە زمانی كوردیدا،ل ٣٢.

(٢) صباح رشید قادر، هاوبێژی و فرەواتایی لە گیرەك دا، ل٥٢.

# ٧- سەرچاوەکانی زاراوەی کوردی
## ( پێشگر و پاشگر )

پێشگرو پاشگری دارِشتن کە لە زانستی زماندا بە ((مۆرفیمی وشە دارێژ Derivational morpheme) ناسراون )).[1] بەم شێوەیە پێناسە دەکرێن:-

١- پێشگر :- ((بەلاتینی بە پێشگر دەوترێت (prefixus) زاراوەیەکی لێکدراوە، لە دوو بەش پێکهاتووە (Prê ) کەبەواتای بەش و بەردەم دێت ( fixus ) بە واتای (چەسپاو – نوساو- لکاو ) دێت. بەوپێیە( پریفێکس ) زاراوەیەکی گراماتیکییە، ئەو مۆرفیمەیە کە دەکەوێتە بەشی پێشەوەی وشەو دەبێتە هۆی گۆڕینی وشەکە لەڕووی فۆرم و واتاوە،

٢- پاشگر:- بەلاتینی بە پاشگر دەوترێت (su-fixes) ئەمەش لە دوو بەش پێکهاتووە(su) بەواتای پاش،(fixes) بەواتای (چەسپاو- نووساو – لکاو ).واتە پاشگر بەو مۆرفیمە دەوترێت کەبەکۆتایی بناغەی وشەوە دەلکێت، دەبێتە هۆی گۆڕینی وشە لەڕووی فۆرم و واتاوە))[2]، بوونی پێشگرو پاشگر لەزمانی کوردیدا ئەوە دەردەخات کە، زمانی کوردی یەکێکە لەو زمانە زیندووە سەربەخۆیانەی کەڕەوش و تایبەتیی خۆی هەیە، ڕەسەنی و سەربەخۆیی ئەم زمانە دەردەخات و لە زمانە لێ نزیک و دوورەکانیش جیای دەکاتەوە، لە بارەی واتاو بنج و پەیدابوونی (پێشگرو پاشگر)ەوە چەند بۆچوونێك هەیە:-

١- لەڕوانگەی مێژووییەوە زۆربەی زمانەوانەکان لەو باوەڕەدان کە ئەمانە لەبنەڕەتدا، وشەی سەربەخۆو واتاداربوون، بەلام بەتێپەڕبوونی کات و لە ئەنجامی زۆربەکارهێنانیاندا، نرخی واتاییان لە دەست داوە لە کاتێکدا بە تەنیا بە کاردەهێندرێن.

٢- تێڕوانینی ئەمرۆی زمان بۆ ( پێشگر و پاشگر ):-

---

(١) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، نوسینی کوردی بە ئەلف و بێی عەرەبی، ل١٢٩.

(٢) د. نەسرین فەخری، پێشگرو پاشگری (فە یان وە )لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری، ب١،بەشی یەکەم،ل٢٣٩.

أ – ئەو پێشگرو پاشگرانە لەپردەرنەکەوتوون،بەڵکو بە پێی پێویستی و لە سەر بنەمای زمانەکە خۆی لە زمانەکەیشەوە پەیدا بوون،((بەتەنیا بایەخیان نییەو بەشێوەیەکی سەربەخۆ کارناکەن،کەدەچنە سەر وشە دەتوانن دەوری دروست کردنی وشە ببینن، بەو پێیە ڕاست نییە بە جیا بنووسرێن)).[1]

((هەموو گیرەکە وشە دارێژەکان بریتین لە کێڵگەیەکی واتایی، هیچ گیرەکێکی ئەو کێڵگەیە بەهای واتایی نابێ تاوەکو بنکەیەك هەڵنەبژێرێ بۆ پێوەنووسان)).[2]

لەم بارەیەوە ئێمە بیروڕامان وایە کە :

لەئەمرۆی زماندا (پێشگرو پاشگر ) بەتەنیا واتایان نییە، بەڵکو کاتێك دەچنە سەربنکەی وشەی دیکە واتای نوێ دێننە کایەوە.

هەندێك لە تایبەتییەکانی (پێشگرو پاشگر ) ی دارشتن لەزمانی کوردیدا : –

- پێشگرو پاشگری وشە دارێژ لە زمانی کوردیدا لەوەدا لەیەك دەچن کە هەر دووکیان مۆرفیمی بەندن، بەشداری دەکەن لەدارشتنی زاراوەی نوێدا، لەم ڕووەوە تایبەتییەکانیان لە سازکردنی زاراوەی کوردی دەردەخەین : –

١ – ((پۆلی سینتاکسی وشەکە دەگۆڕین))[3]،واتە ئەگەر وشەکە بەر لە وەرگرتنی مۆرفیمەکە ناو بێت،بەیەککگرتنی لەگەڵ مۆرفیمەکەدا ، دەبێت بە ئاوەڵناو،وەك : –

بە + ناز ⟵ بەناز

↓ ↓ ↓

م.وشە دارێژ ناو ئاوەڵناو

٢ – تەنیا دەبێتە هۆی گۆڕینی واتا، بێ گۆڕینی بەشە ئاخاوتنی وشەکە :–

هەڵ + گرتن ⟵ هەڵگرتن

أ– گۆڕان لە فۆرم و واتای وشەکە ڕووی داوە،بەبێئەوەی پەیوەندی دژواتایی دروست ببێت.

---

(١) د.ئەورەحمانی حاجی مارف، گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی بە ئەلف و بێی عەرەبی،ل ٥٦.

(٢) صباح رشید قادر، هاوبێژی و فرەواتایی لە گیرەکدا،ل ٦٥.

(٣) Scailis, Generative Morphology , p.١٠٢.

ب- پەیوەندی دژ واتایی دروست دەكات، بەتایبەتی لە ئاوەڵناوی چۆنیەتیدا :-

نا + شیرین ←——— ناشیرین

↓ ↓ ↓

م. وشەدارێژ ئاوەڵناو (بناغە ) ئاوەڵناوی دارێژراو

٣ – ژمارەی پێشگرەكان كەدەچنە سەرەمان بەشی ئاخاوتن لاسەنگن، بەوێنە :- لەبەشە ئاخاوتنی (ناو) دا پێشگرەكان لە چاو پاشگرەكاندا نموونەیان كەمە، ئەمەش بەپێچەوانەی بەشە ئاخاوتنی (كار) كە بە زۆری بە پێشگر زیاد دەكرێت. بەرێژەیەكی گشتیش هەمیشە پاشگرەكان چالاكترن.

٤ – مۆرفیمی وشە دارێژ لەزمانی كوردیدا خاوەنی تایبەتمەندیی خۆیەتی ، بەشێكیان دەچنە سەر (ناو) بەشێكیان دەچنە سەر (كار). هەندێ پاشگریش هەن لەگەڵ (ناو، ئاوەڵناو،كار)یش بەكاردێت : -

(ەك) :

١- دەچێتە سەر ناو : دەستەك

٢- دەچێتە سەر ئاوەڵناو : كورتەك

٣- دەچێتە سەر ڕەگی كار : نوسەك، كوڵەك.

٥ – مۆرفیم هەیە لە هەمان كاتدا پێشگرو پاشگریشە وەك مۆرفیمی (ڤە) كە لە كرمانجی ژووروودا وەكو (پێشگرو پاشگر ) یش دەردەكەوێت. دواتر باسی دەكەین.

٦- مۆرفیمە وشە دارێژەكان لە چالاكیاندا بۆ دارشتنی وشە جیاوازیان هەیە، هەندێكیان لەگەڵ ژمارەیەكی زۆر وشە یەكدەگرن و بەرهەمدارن بە وێنە لەو پێشگرانەی كە دەچنە سەر (كار ) دەبینین پێشگری (هەڵ ) لەگەڵ ژمارەیەكی زۆر لە (كار ) یەكدەگرێت و وشەی نوێ دروست دەكات وەك :- هەڵكەوت، هەڵچوو، هەڵنیشت، هەڵفڕی، هەڵخست، هەڵدا، هەڵكرد، هەڵبەزی، هەڵهێنا، هەڵقرچا، هەڵتروكا، هەڵماڵی .... هتد. بەپێچەوانەشەوە هەندێ مۆرفیمی وشە دارێژ لەم ڕووەوە سستن و لەگەڵ ژمارەیەكی كەم وشەدا دەردەكەون، وەك :-

مان : نیشتمان، خەرمان

ست : زانست، توانست.

٧- پێشگرو پاشگر بەپێی ئـەرکیان دوای وشـەی ئـەو تـۆ دەکەون،کەلەگەڵیدا بگـونجێن، بەوێنـە:- کـاری وا هەیـە زۆریـەی پێـشگرو پاشـگرەکانی سەربەبەشـە ئاخـاوتنی (کـار) وەردەگرێت، وەك :- (کەوتن ) :- هەڵکەوتن، داکـەوتن، پێکـەوتن، تێکـەوتن، لێکـەوتن، بەرکوتن، وەرکەوتن، ژێرکەوتن، بن کەوتن، سەرکەوتن، پێداکەوتن، تێداکەوتن ...

٢- دوو پێشگر بە یەکەوە وەردەگرێت :-

(لێ ) + (وەر) + کەوتن ⟵ لێوەرکەوتن.

٣- پێشگرو پاشگر بەیەکەوە وەردەگرێت، وەك :-

(پێ - ) + کەوتن + (- ەوە ) ⟵ پێکەوتنەوە

کاری واش هەیە، چەند پێشگرێکی کەم وەردەگرێت، وەك : - ( خواردن).

٨- هەرچەندە مۆرفیمی وشە دارێژ، لە پەیوەندی ستونی ( جێنشینی ) یشدا، کاردەکەن، بەلاّم بەتەواوی ((پەرادایم ))[١]پێکناهێنن. واتە هیچ یـەکێ لـەو مۆرفیمانـە ناتوانێـت بـچێتە سەر هەموو ناوێك، یان ئاوەڵناوێك، یـان هـەرپۆلێکی دیکـەی وشـە، بـە وێنـە :- پاشـگری (خانە ) لەگەڵ هەموو ناوێکدا ناوی شوێن سازناکات، وەك :-

أ- دەچێتە سەر ئەم ناوانە :-

کتێب + (- خانە ) ⟵ کتێبخانە

چاپ + (- خانە ) ⟵ چاپخانە

ب - بەلاّم ناچێتە سەر ئەم ناوانە :-

* دار + ( خانە ) ⟵ دارخانە

* چاو + (- خانە ) ⟵ چاوخانە

٩- هەندێ لە مۆرفیمە وشە دارێژەکانی بچوککردنەوە بە ئاشکرا تێکەڵ بە قالبەکانی بچوککردنەوە دەبن وەك لە وشەکانی :-

کرم + (- یلە ) ⟵ کرمیلە

---

(١) شێرکۆ حەمە ئەمین قادر، مۆرفیمە بەندە رێزمانی ولێکسیکیەکان و ئەرکیان لە دیالێکتی گۆراندا،ل٢٧.

له هەندێکی دیکەیاندا ئارەزوومەندیەك هەیە، فۆرمە نوێیەکە لە ڕووی ڕێزمانەوە لە گەڵ وشە یەکی سادە یەکسانە، بەوێنە :

ئەم { باخە } جوانە.

ئەم { باخچە } جوانە.

گۆڕینی (باخ) بە (باخچە) کارناکاتە سەر بەهای سینتاکسی ڕستەکە، بەمەدا بۆمان دەردەکەوێت کە وشە داڕێژراوەکان دەبنە دانەی پەیوەندی جێنشینی و دەتوانرێت جێگۆڕکێیان پێ بکرێت، بێ ئەوەی کاربکەنە سەر لایەنی سینتاکسی ڕستەکە.

((ئەمەش وای لەهەندێ زمانەوان کردووە، کە بڵێن یاسای داڕشتن سەرپشکییە (optional)، لەژێر ویست و ئارەزووی مرۆڤدایە))[١].

١٠- (( یەکێك لە سیماگرنگەکانی مۆرفیمی وشەداڕێژ لە زمانی کوردیدا ئەوەیە کە بە زۆری بەهێزن، واتە هێزی سەرەکی وشەداڕێژراوەکە بۆ خۆیان ڕادەکێشن، لە دۆخێکدا دووانیان دەچنە سەر وشەیەك ئەوا ئەوەی دووەم هێزەکە ڕادەکێشێ ))[٢].

١١- هەندێ وشەی داڕێژراوی کوردی بەیاریدەی دووپێشگری داڕشتن سازدەبن، وەك :-

تێ + وەر + پێچان ⟵ تێوەرپێچان، پێوەرکردن.

نا + لە + بار ⟵ نالەبار، نابەجێ .... هتد [*]

هەروەها دەگونجێت (پێشگرو پاشگر ) بەیەکەوە وشەیەك دابڕێژن

دا + مر + ( - اندن ) + (- ەوە ) ⟵ دامراندنەوە

بەلام ئەوەی لە هەموویان بلأوترو بەرهەمهێنترە سازکردنی زاراوەیە بە یاریدەی یەك مۆرفیمی وشە داڕێژ.

١٢- مۆرفیمە وشە داڕێژەکان کە دەنوسێن بە ( ڕەگ ) ی وشەوە واتای نوێ بۆ وشەکە زیاد دەکەن :-

( ڕا - ) + هێن ⟵ ڕاهێن

( هەڵ - ) + کرد ⟵ هەڵکرد

---

(١) Scalise,G enerative Morphology , p. ١١٢

(٢) صباح رشید قادر، هاوبێژی و فرەواتایی لە ( گیرەك ) دا، ل٦٢.

* ئەم ڕێگایە لە ئێستادا بەرهەم هێن نییە.

بەشی زۆری پێشگرەکانی کار (ناوی کارا ) لەگەڵ کاری تێپەڕدا دروست دەکەن :

هەڵگر، لێدەر، ڕاسپێر، داهێن ... هتد.

١٣- هەندێ مۆرفیمی وشەدارێژکاتیێ کە دەچنە سەر بناغەیەك ، دەبنە هۆی دروستبوونی فرەواتایی ، بەمەش واتاکانیان لە چوارچێوەی قسەکردندا نەبێت پێشبینی ناکرێت ، بەوێنە:-

((هەڵهات
١- ڕاکردن
٢- دەرکەوتن ( بەرزبوونەوە )
٣- ترشان)) [1]

وەشاندن :
١- بڵاوکردنەوە ( تۆ وەشاندن )
٢- لێدان ( کوتەك وەشاندن )

١٤- ئەو پێشگرو پاشگرانەی کە لە زمانی کوردیدا هەن، ژمارەیان زۆرە، لەڕووی پێکهاتەی دەنگیشەوە لە مۆرفیمە بەندە ڕێزمانییەکان گەورەترن، بەڵام ئەرکیان سنووردارەو بەرهەمیان کەمە.

| مۆرفیمی وشە دارێژ | مۆرفیمی ڕێزمانی |
|---|---|
| - دار | بـ |
| - وەر | ێ |
| - مەند | ان... هتد. |

١٥- مۆرفیمەکانی داڕشتن، سەرەی وشە دارێژراوەکە پێك دەهێنن و گشت تایبەتییەکانی خۆیانی بۆ دەگوێزنەوە، سەرە بەزۆری لای چەپ دەگرن، بەڵام هەندێکیان بەلای ڕاستدا دێن، وەك :-




(١) طالب حسین علی، هەندێ لایەن لە پەیوەندی نێوان ڕستەو واتا لە کوردیدا، ل٦١.




لە کۆتاییدا ئەوە دەردەخەین کە (پێشگرو پاشگر)ی دارِشتن، لە ڕووی ئەرکەوە چوونیەکن، بەلاّم لەوەداجیاوازن کە :–

١– (( پاشگر لە زمانی کوردیدا هەمیشە بە دوای بناغەی وشەوە دەلکێ و کۆتاییەکی کراوە جێ دەهێڵێ بۆ گیرەکە ڕێزمانیەکان، واتە بەم شێوەیە ڕیز دەبن :–

وشە ( بنکە ) + مۆرفیمی وشە دارِێژ + مۆرفیمی ڕێزمانی))[2]

ئاسن + (–گەر ) + (ەکە ) + ( ان ) ⟵ ئاسنگەرەکان

منداڵ + (–ۆچکە ) + ان ⟵ منداڵۆچکەکان.

٢– (( بەلاّم پێشگر هەمیشە بە پێش بناغەی وشەوە نالکێ ))[3]، لە کاتی هەبوونی گیرەکە ڕزمانییەکان دا شوێنی خۆی چۆڵدەکات بۆیان، بە وێنە : – کردن – هەڵکردن هەڵکردن – هەڵمکرد – هەڵمان کرد.

## یەکەم : ناوی دارِێژراو

ناوی دارِێژراو :– ئەو ناوە ناسادەیە کە لە مۆرفیمێکی سادەو زیادی یەك پێك دێت، ئەمەش بە دوو ڕێگا دەبێت :–

أ- بە یاریدەی پاشگر.

ب- بە یاریدەی پێشگر.

ناوی دارِێژراو لە زمانی کوردیدا دەکرێتە چەند جۆرێك وەك :– (ناوی پیشە، ناوی واتایی، ناوی شوێن، ناوی بچوککراوە) باسی هەر یەکێکیان بە جیا دەکەین :–

أ– دارِشتنی ناو بە یارێدەی پاشگر

---

(١) صباح رشید قادر، هاوبێژیی و فرەواتایی لە گیرەکدا،ل ٦٢.

(٢) کەوسەر عەزیز ئەحمەد، بیردۆزی مۆرفیم و هەندێلایەنی وشە سازی کوردی،ل ٣٠.

(٣) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، نوسینی کوردی بە ئەلف و بێی عەرەبی،ل ٢٩.

## ناوی پیشە :-

لە زمانی کوردیدا ژمارەیەك پاشگر هەیە، کە بەشداری لە دارشتنی ناوی پیشەدا دەکەن بەمەش فەرهەنگی زمان بە پەیدابوونی زاراوەی نوێ دەوڵەمەند دەکەن، وەك :-

(– کەر، – گەر، – ەوان، – چی، – مەند،– بەند، – دار، – باز، – کار، – یار،هتد....)

بە کورتی باسی هەر یەکێکیان دەکەین :-

### ١/ پاشگری (– کەر) :-

پاشگرێکی چالاکە، ناوی دارێژراو بە مەبەستی پیشەو کاری کەسێك ردروست دەکات :-

أ- دەچێتە سەر ناوی سادە :- نان + (– کەر) ⟵ نان کەر

دار + (– کەر) ⟵ دار کەر

تەون + ( – کەر ) ⟵ تەوەنکەر

ئیشکەر، سواڵکەر، بژارکەر، کارەکەر... هتد.

ب – لەگەڵ ئاوەڵناودا دێت و واتای (بکەر = Agent) دەبەخشێت، وەك :-

((خۆش +(– کەر) ⟵ خۆش کەر

تیژ +(– کەر) ⟵ تیژ کەر

سوێر +(– کەر) ⟵ سوێر کەر))[1]

### ٢/ پاشگری (– گەر) :-

ئەم پاشگرە زۆر چالاك نییە، تەنیا دەچێتە سەر (ناو)و واتای پیشە دەگەیەنێت :-

برین +(– گەر) ⟵ برینگەر

تێبینی ئەوە دەکەین کە زۆربەی ئەو ناوانەی لەگەڵ ئەم پاشگرەدا خراونەتە کار کانزان و لە فەرهەنگدا فیلدێك پێك دەهێنن کە دەکرێت ناوی بنێین فیلدی کانزا، وەك :-

ئاسنگەر، چەقۆ گەر، مسگەر، شیرگەر....... هتد.

پاشگری (گار) :-

کردگار، پەروەردگار.

### ٣ / پاشگری (وان / ەوان)

ئەم پاشگرە دەچێتە سەر هەندێك ناوو واتای پیشەو کاری کەسێك دەگەیەنێت، وەك :-

---

(١) نوری عەلی ئەمین، گرتنی کەلێنێکی تر لە رێزمانی کوردی،ل ٢٤

شاخ + (– وان) ⟵ شاخەوان

دار + (– ەوان) ⟵ دارەوان

((دیدە + (– وان) ⟵ دیدەوان ((ئێشك گر))[1]

بە هەندێ واتای دیکە ناوی دارێژراو دروست دەکات، وەك :–

١ – (دەچێتە سەر ناوو واتای پارێزەری (محافظ) دەبەخشێ [2] :–

باغ + (– وان) ⟵ باغەوان

– یان لێزانی لەو بوارە دەگەیەنێ، بۆیە دەتوانین ڕەگی کاری (زانین) کە (زان)ە لە جیاتی بەکار بهێنین، وەك :–

مەلەوان (کارامەیی لە مەلە کردندا) : مەلەزان ، زمانەوان : زمانزان

٣ – ئەم پاشگرە جگە لە ڕاگەیاندنی پیشەی کەسێك، هەندێ جار دەچێتە سەر ناوی شت و پیشەی ئەو شتە ڕادەگەیەنێت :–

(سایە + (– وان) ⟵ سایەوان (سەیوان)، ((پیشەی دروستکردنی سێبەرە))[3].

٥ – بە هۆی گۆڕانی فۆنیمی (و) بۆ (ڤ)، ئەم پاشگرە لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا لە شێوەی (ڤان) دەردەکەوێت، وەك :–

((شیڤان، نێچیرڤان، بیریڤان..... هتد)) [4]

٤ / پاشگری (– چی) :–

(پاشگری (– چی)) لە هەردوو دیالیکتی سەرەکی زمانی کوردیدا، کرمانجی خواروو، کرمانجی ژووروودا دەبیندرێ دەچێتە سەر ناوو پیشەی کەسێك نیشان دەدات):– [5]

١ – ناوی بەرجەستە :–

بۆیاغ + (– چی) ⟵ بۆیاغچی

قاوە + (– چی) ⟵ قاوەچی

---

(١) هەژار موکریانی، هەنبانە بۆرینە،ل ٣٢.

(٢) نوری عەلی ئەمین، گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردی،ل ٢٣.

(٣) گیو موکریانی، فەرهەنگی مەهاباد،ل ٣٤٧.

(٤) محەمەد تاهیر گوهەرزی، ڕێزمانا کوردی زارێ کرمانجی،ل ٣٣.

(٥) د. ئەو ڕەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی – ناو،ل ١٠٩.

٢ – ناوی واتایی :–

فێڵ + (– چی) ⟵ فێڵچی

ساختە + (– چی) ⟵ ساختەچی

<u>چەند تێبینییەك :–</u>

١ – پاشگری (– چی) لەگەڵ پاشگری (–ەوان) هەندێك جاردەچنە سەر هەمان وشەو واتای پیشە دەگەیەنن :– توتنەوان – توتنچی نۆبەتەوان – نۆبەتچی

بەلأم ئەمە هەموو كاتێك ڕوو نادات، بە وێنە قسە پێكەرانی كورد دەڵێن (باخەوان)، بەلأم (باخچی) ناوترێت، یاخود (چایچی) دەبیسترێت، بەلأم (چایەوان) نابیسترێت.

٢ – لەگەڵ هەندێ پاشگری دیكەدا، هەندێك جار دەچنە سەر هەمان وشەو هەمان واتا دەگەیەنن :– (– كار)

ڕیاچی – ڕیاكار

ساختە چی – ساختە كار

(– كەر)

قومارچی – قومارکەر

(– ساز)

تەنەكەچی – تەنەكەساز ...هتد

٥ / پاشگری (– وا / –ەوا) :–

– ئەم پاشگرە چالاك نییە، لەگەڵ چەند وشەیەكی كەمدا دەبیندرێ و واتای پیشە دەدات:–

١ – لەگەڵ (ناو) :– نان + (– ەوا ) ⟵ نانەوا

((دەست + (– ەوا) ⟵ دەستەوا))[1]

٢ – لەگەڵ (ئاوەڵكار) دێت و ناوی پیشە دروست دەكات، وەك :–

پێش + (–ەوا) ⟵ پێشەوا

<u>تێبینی</u> :– ئەم پاشگرە لەگەڵ هەندێ وشەی دیكەدا دەبیندرێ، بەلأم واتای پیشە نادات، بەڵكو ناوی خواردن دروست دەكات، كە دوا تر باسی دەكەین.

٦ / پاشگری (– مەند)

---

(١) لیژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە، فەرهەنگی قوتابی،ل ٦٨.

ب- ((ئاوەڵناوی چۆنیەتی، ژمارەیەکی زۆریان سیفەت، یان شێوەی گیانلەبەر ( زیندوو ) نیشان دەدەن، وەك ( ئاودار، دەوڵەتمەند، خەمگین.... هتد ).

هەندێکی دیکەشیان تایبەتن بە نازیندوو، وەك ( تەختانی، ڕووتەن،..... هتد ) کە ئەمانە بە گشتی سیفەتی شوێن دەردەخەن))[1].

٣- ئاوەڵناوەکانی وەك ( جوانکیلە، سورکەلە، وردیل... هتد ) سیفەت بە بچوککراوەیی نیشان دەدەن، لەهەمان کاتیشدا پلەی ڕێزو ناسکیان تێدایە، هەندێ جاریش بۆ شکاندن بەکاردێت، لەهەردوو باردا دەورووبەری قسەکردن ڕوونی دەکاتەوە، بەگشتی ئەم ئاوەڵناوانە، ڕواڵەت نیشان دەدەن و (( سیمایەکی کاتین ))[2].

جـ - ڕەگ + پاشگر : -

ژمارەیەك پاشگر هەیە لەزمانی کوردیدا، دەچنە سەر ڕەگ و ئاوەڵناوی چۆنیەتی دروست دەکەن، وەك : -

( - ەوار، - ۆك، - ا، - وو، - ندە، - دە، - یدە.... )

١- ( - ەوار ) : خوێند + ( - ەوار ) ⟵ خوێندەوار

٢- ( - ۆك ) : گەڕ + ( - ۆك ) ⟵ گەڕۆك

٣- ( - ا ) : زان + ( - ا ) ⟵ زانا

٤- ( - وو ) : مرد + ( - وو ) ⟵ مردوو ، کەوتوو

٥- ( - ندە ) : کوش + ( - ندە ) ⟵ کوشندە، دڕندە، بڕندە

٦- ( - دە / -یدە ) : گەڕ + ( - یدە ) ⟵ گەڕیدە

## ٢- ئاوەڵناوی نیسبی : -

هەندێك پاشگر هەیە دەچنەسەر ناو، ئاوەڵناوی نیسبی دروست دەکەن : -

- ین : شەرم + ( - ین ) ⟵ شەرمین، زیوین

- ن : توکن، وورگن، چڵکن، چڵمن، فڕین، جڕین.

---

(١) شێرکۆ حەمەئەمین قادر، مۆرفیمە بەندە لێکسیکی و ڕێزمانییەکان و ئەرکیان لە دیالێکتی گۆراندا، ل٥٩.

(٢) پ. د. محەمەد مەعروف فەتاح، زمانەوانی و فەرهەنگسازی و دەوڵەمەندکردنی دەروازە فەرهەنگییەکان، نوسەری نوێ، ژ(١٩)،ل١٧٨.

پاشگری ( – ن ) زیاتر حەز لە ووشەی یەك برگەیی دەكات، ((ئەو سیفەتەش لەنمای خۆڕسكی وشەكەوە پەیدابووبێ نەك لەلاوە بۆی هاتبێ، بە وێنە دارێك كرمی بێ پێی دەڵێن : (–كرمژن) نەك

( كرمن ) چونكە لەلاوە بۆ دارەكە هاتووە)).[1]

– انە : پیاوانە، ژنانە

– انی : كچانی، پیاوانی

– اوی : كرماوی، تۆزاوی، ئارداوی

– ەكی : پولەكی، خێڵەكی، دەشتەكی

– ۆكی : خەمۆكی، نازۆكی

– چەند پاشگرێكی دیكەش هەن، كە ئاوەڵناو دادەرێژن، وەك : –

١– ( – بار ): گوناح + ( – بار ) ⟵ گوناحبار، تاوانبار، غەمبار

٢– ( – كەش ) : ناز + ( – كەش ) ⟵ نازكەش، گەردنكەش

٣– ( – اڵو ) : ( خەو + ( – اڵو ) ⟵ خەواڵو )[*].

٤– ( – ون ) : ئەسپێ + ( – ون ) ⟵ ئەسپێون، كرمیون

٥– ( – باز ) : مەكرباز، فێڵباز، تەلەكەباز

٦– ( – یك ) : بار + ( یك ) ⟵ باریك

٧– ( – ك ) : نازك، شلك، گەرمك، ڕەشك

٨– ( – گ ) : ساز + ( – گ ) ⟵ سازگ

٩– ( – كاڵ ) : سوور + ( – كاڵ ) ⟵ سووركاڵ، سپیكاڵ

١٠– پاشگری ( – گیر ) : دڵگیر، كەنارگیر، پەرگیر

١١–( – ەنگ ) : ئاست + ( – ەنگ ) ⟵ ئاستەنگ، تاسەنگ

١٢–( – ۆنی ) : ( ڕك + ( – ۆنی ) ) ⟵ ڕكۆنی

١٣–( – واز ) : لانەواز، مەكرواز، فێڵواز

---

(١) مەسعود محەمەد، زاراوەسازی پێوانە،ل ١٦٥.

(*) هەندێك جار ئەم پاشگرە لەشێوەی ( ارو ) دەردەكەوێت :– خەو + (– ارو) ⟵ خەوارو.

ئەمەش بۆگۆڕانی فۆنیمی / ڵ / بۆ / ر/ لەهەندێك جێدا لەناوچەكانی سۆراندا دەگەڕێتەوە.

١٤-( – تك ) : مۆرتك، سۆرتك، زەرتك

١٥- ( – كۆك ) : سوركۆك

١٦- ( – فل ) : سور + فل ⟵ سورفل

١٧- ( – كە ) : جوانكە، سوركە، شينكە

١٨- ( – كيلانە ) : جوانكيلانە، خڕكيلانە

١٩- ( – باو ) : سورباو، تازەباو، زەردباو

٢٠-( – چك ) : شیرین + ( – چك ) ⟵ شیرینچك، بەرینچك، سپیچك

٢١- ( – ەڵ ) : گەندەڵ، پوچەڵ، فشەڵ

٢٢- ( – كۆڵە ) : درێژ + ( – كۆڵە ) ⟵ درێژكۆڵە

٢٣- ( – اوە ) : ڕووت + ( – اوە ) ⟵ ڕووتاوە، پوكاوە، پوچاوە

٢٤-( – ژە ) : تەنگ + ( – ژە ) ⟵ تەنگژە

٢٥- ( – ۆلكە ) : (( تەختۆلكە، تەپۆلكە، بەرزۆلكە ))[1].

٢٦-( – ەلانە ) : باریك + ( – ەلانە ) ⟵ باریكەلانە

٢٧-( – كۆ ) : پیس + ( – كۆ ) ⟵ پیسكۆ

٢٨- ( – پات ) : سپی + ( – پات ) ⟵ سپیپات

٢٩-( – ۆڵە ) : خەپ + ( – ۆڵە ) ⟵ خەپۆڵە، نەرمۆڵە

٣٠- ( – كەلانە ) : سپی + ( – كەلانە ) ⟵ سپیكەلانە، خڕكەلانە.

٣١- (– ەرە) : شێت + ( – ەرە ) ⟵ شێتەرە

٣٢- (– ێنچك ) : خوار + ( – ێنچك ) ⟵ خوارێنچك

٣٣- (– كو) : كار + ( – كو ) ⟵ كاركو (كارباش)

٣٤- (– كانی ) : كشت + ( – كانی ) ⟵ كشتكانی، خڕكانی

---

(١) نوری عەلی ئەمین، گرتنی كەلێنێكی تر لە ڕێزمانی كوردی، ١٨.

## سێ یەم : ئاوەڵکاری داڕێژراو

ئاوەڵکار وەك بەشێکی ئاخاوتن، بەشداری لە دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی زماندا دەکات بەڵام زۆر چالاك نییە وەك ناوو کار، تاڕادەیەکیش ئاوەڵناو.

دروست کردنی ئاوەڵکاری داڕێژراو بەسێ ڕێگا دەبێت : –

١– بەیاریدەی پاشگر.

٢– بەیاریدەی پێشگر.

٣– بەیاریدەی پێشگر و پاشگر.

یەکەم : – بەیاریدەی پاشگر : –

أ– ناو + پاشگر : –

١– پاشگری (( ئاسایی )) : [1]

شێر ئاسایی، پیاو ئاسایی، کوڕئاسایی....

٢– پاشگری ( – ان ) :

مۆرفیمی ( ان ) کە لەبنەڕەتدا نیشانەی کۆیە، دەچێتە سەرناوی کات و دەیکاتە ئاوەڵکاری داڕێژراوی کات و وەکو پاشگر خۆی دەنوێنێ : –

بەهاران، چەژنان،ساڵان، شەوان.....

٣– پاشگری ( – انە ) :

پیاوانە، شێرانە، دوژمنانە....

دروست کردنی ئاوەڵکار بەیاریدەی پاشگری ( – انە ) بەزۆری لە ڕستەدا دەردەکەوێت، بەوێنە :–

( سەربازەکان هێرشێکی مەردانەیان کرد ) ئاوەڵناوە، بەڵام ( سەربازەکان مەردانە دەجەنگن ) ئاوەڵکارە.

٤– پاشگری ( – ێ ) :

ئەم مۆرفیمە دەچێتە سەر ناوی کات و ئاوەڵکاری کات دادەڕێژێت ( ناوی کات نابێتە ئاوەڵکار هەتا لەڕستەدا لایەنی کات بەمەبەست دەگیرێ )، کە دەڵێین : (هاوین گەرمە ). لێرەدا (( هاوین )) ناوە، بەڵام کەدەوترێت هاوینێ گەشتێك دەکەم لێرەدا

---

(١) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، وشەسازی، ژمارە و ئاوەڵکردار، ١٥٨.

((هاوین)) بووه به ئاوه‌ڵکار. به‌م جۆره ئه‌م پاشگره ده‌چێته سه‌ر کۆمه‌ڵێك ناوی کات و ئاوه‌ڵکاری کات دروست ده‌کات : –

(( زستانێ، به‌هارێ، شه‌وێ، ڕۆژێ، سبه‌ینێ، چێشته‌نگاوێ، عه‌سرێ، پایزێ )) [1]

ب– ئاوه‌ڵناو + پاشگر :

پاشگری ( – انه ) :

ژیرانه، مه‌ردانه، هه‌ژارانه...

## دووه‌م : به‌یاریده‌ی پێشگر : –

له‌زمانی کوردیدا دووپێشگری ( به –، بێ – ) به‌شداری دروست کردنی ئاوه‌ڵکاری داڕێژراو ده‌که‌ن:–

١– پێشگری ( بێ – )، وه‌ك : – بێگومان، بێشك، بێباك....

٢– پێشگری ( به – )، وه‌ك : – به‌گوڕ، به‌کوڵ، به‌ته‌نیا، به‌ئاسته‌م... هتد.

## سێ یه‌م : به‌یاریده‌ی پێشگر و پاشگر : –

((بۆ دروست کردنی ئاوه‌ڵکاری داڕێژراو چه‌ند پێشگر و پاشگرێکمان هه‌یه، به‌یه‌که‌وه ده‌چنه سه‌ر هه‌مان وشه)) [2]، وه‌ك : –

١– پێشگری ( بێ – ) له‌گه‌ڵ پاشگری ( – انه )، وه‌ك : –

بێباکانه، بێشه‌رمانه، بێئاکامانه، بێئه‌قڵانه.... هتد.

٢– پێشگری ( بێ – ) له‌گه‌ڵ پاشگری ( – ی )، وه‌ك : –

بێ باکی، بێ نازی.

٣– پێشگری ( به – ) له‌گه‌ڵ پاشگری ( – ی ) وه‌ك : –

به‌ژیری، به‌چاکی، به‌خۆشی، به‌خراپی.... هتد.

٤– پێشگری ( به – ) له‌گه‌ڵ پاشگری ( – ایه‌تی ) : –

به‌دۆستایه‌تی، به‌دوژمنایه‌تی....

---

(١) مه‌سعود محه‌مه‌د، زاراوه‌سازی پێوانه، ١٤٤.

(٢) د. نه‌وره‌حمانی حاجی مارف، ئاوه‌لکردار، ١٥٨ – ١٥٩.

٥- پێشگری ( بە - ) لەگەڵ پاشگری ( - ەتی )، وەک : -

بەپیاوەتی

٦- پێشگری ( بە - ) لەگەڵ پاشگری ( - ایی ) وەک : -

بەقولایی، بەپانایی، بەتاریکایی.... هتد.

## چوارەم : کاری دارێژراو

کاری دارێژراو بەبەشێکی گرنگی ئاخاوتن دادەنرێت، لەڕووی زاراوە سازی یەوە چالاکەو ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێ لە دەوڵەمەند کردنی فەرهەنگی زمان، ئەمەیش بەدوو ڕێگا دەبێت:-

١- بەیاریدەی پێشگر.

٢- بەیاریدەی پاشگر.

یەکەم : پێشگرەکان :

ژمارەیەک پێشگر لەزمانی کوردیدا بەشداری دروست کردنی کاری دارێـژراو دەکـەن، کـە دەکرێت بەسەر دوو گرووپدا دابەشیان بکەین : -

أ- پێشگری سادە. ب- پێشگری ناسادە.

أ- پێشگرە سادەکان : -

١/ پێشگری ( هەڵ - ) :

هەڵچوون، هەڵهاتن، هەڵکردن.....

١- پێشگری ( هەڵ - )، یەکێکە لە پێشگرە چالاکەکان، بەزۆری بزووتنەوەی بەرەو ژوورو بڵندایی دەگەیەنێ وەک لەم نموونانەی سەرەوەدا دەردەکـەوێت، بـەڵام وەهـاش دەبـێ بزوتنەوەکە بەرەوژێر بروات، وەک هەڵوەرین، هەڵدێران، هەڵداشتن.... هتد.

٢- پێشگری ( هەڵ - ) لەگەڵ هەندێ کاردا فرەواتای دروست دەکات، وەک : -

هەڵکرد : ١- چراکەی هەڵکرد

٢- ئاڵاکەی هەڵکرد

هەڵچوو : ١- پیاوەکە هەڵچوو.

٢- شیرەکە هەڵچوو.

٢/ پێشگری ( ڕا – ) :

أ– ئـەم پێـشگرە ( ڕا – ) بزووتنـەوەی ئاسـۆیی، چ مەعنـەوی بێـت، چ بەرهەسـت (محسوس) بێت، ڕادەگەیەنێ [1] وەك ڕامالین، ڕاتەکان، ڕاکێشان.

ب– بەواتای دیکەش دێت : – ڕامان ((استغراق))[2]، ڕاهات (( تعود ))[3]، ڕاگوشین.

<u>تێبینی</u> : – ئەم پاشگرە مەیدانی بەکارهێنانی هەر لەگەڵ کارە، بەڵام لە وشەی (( ڕاناو )) دا ئـەم سـنورەی بەزانـدووە، دروسـت کردنـی ئـەم زاراوەیـە لەلایـەن هەنـدێ نووسـەرەوە دووچاری ڕەخنە بۆتەوە، هەر بۆیەش لەم دواییەدا زاراوەی (( جێناو )) داڕێژراوە.

٣/ پێشگری ( دا – ) :

زۆربەی واتاکانی ئەم پێشگرە ( بەرەو ژێر بوونەوە ) دەگەیەنێ، وەك : –

دابەزین، داگرتن، داپلۆسین،.... هتد، بە واتای دیکەش دێت : –

دا + ڕشتن ⟵——— داڕشتن، داهێنان

لەگەڵ پاراستنی ئـەم چـەمکە سـەرەکییە، بـەڵام جیاوازییـان هەیـە لـە هەنـدێ تایبەتیـەتی واتایی بواری بەکارهێنانەکەو بەمەش فرەواتایی دروست دەکەن.

جگە لەوە هەندێکیان لەگەڵ مانا خوازەیی یەکانیاندا فرەواتایی دروست دەکەن : –

ئەم پیاوە داچۆڕاوە (( واتە پیربووە ))[4]

٤/ پێشگری ( ڕۆ – ) :

١– ((ئـەم پێـشگرە لـەڕووی واتـاوە دەورێکـی نزیـك لـە دەوری پێـشگر ی ( دا – ) دەگێڕێ))[5] واتا بزووتنەوەی بەرەو خوارو ناوەوە نیشان دەدات، وەك : –ڕۆکردن، (( ڕۆچوون : چوونە خوارەوەی شتێك بەناو ئاو یان بەناو زەویدا))[6]، ڕۆنیشتن....

٢– بەرانبەر بەم واتادیارەی ئەم پێشگرە، هەندێ واتای دیکەش دەگەیەنێ : –

---

(١) لێژنەی زمان و زانستەکان، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری، ب٦،ل ٤١٥.

(٢) مەسعود محەمەد، زاراوەسازی پێوانە،ل ٩٧.

(٣) صادق بەهائەدین، ڕێزمانا کوردی کرمانجی یا ژۆری و ژێریا هەڤبەرکری،ل ٢٩٦.

(٤) صباح رشید قادر، هاوبێژی و فرەواتایی لە گیرەکدا، ٨٤.

(٥) لێژنەی زمان و زانستەکان، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری، ب٥،ل ٤٠٠.

(٦) شێخ محەمەدی خاڵ، فەرهەنگی خاڵ،ل١٨٣.

ڕۆناندن، ڕۆهاتن، ڕۆیاندن....

٥/ پێشگری ( وەر - ) :

١- ((ئـەم پێـشگرە لەواتاکانیـدا، بزوتنـەوەیێکی کەوانـەیی ( قەوسـی ) تێـدا بـەدی دەکرێ))[1].

هەندێکجار واتای بەرەو دوواوەش دەگەیەنێ

وەك : - وەرسوڕان، وەرپێچان.

٢- پێشگری ( وەر - ) جگە لەم واتایەی، بەواتای دیکەش دێت : -

(( وەرزاندن : ( دباغه الجلود ) پێستەکاری

وەرهاتن : دابەزین ( ترول ))[2]

٦ / پێشگری ( پێ - ) : پێچوون، پێکردن، پێبوون، پێگەیاندن.

٧/ پێشگری ( تێ - ) : تێکەوتن، تێگەیشتن، تێگرتن، تێخستن.

٨/ پێشگری ( لێ - ) : لێخوڕین، لێدان، لێکەوتن.

ئەم پێشگرە لە کرمانجی ژووروودا لە شێوەی ( - ژێ ) دا دەردەکەوێت : -

ژێپرسین، ژێستاندن، ژێبڕین.

٩/ پێشگری ( وێ - ) : وێچوون، وێکەوتن.

پێشگری ( وێ - ) لە کرمانجی ژووروودا بەهۆی گۆڕانی فۆنیمی ( و ) بۆ فونیمی ( ڤـ ) لـە شێوەی

( ڤێ ) دەردەکەوێت وەك : - (( ڤێخستن، ڤێستاندن ))[3]

١٠/ پێشگری ( ڤە - ) :

ئـەم پاشـگرە لـە کرمـانجی ژووروودا بەکاردەهێنـدرێ، بەرانبـەر بـە پاشـگری ( - وە ) لـە کرمانجی خوارووودا دەوەستێت : -

(( دان - ڤەدان

بوون - ڤەبوون ))[1]

---

(١) لیژنەی زمان و زانستەکان، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، ٢٣٧.

(٢) گیوموکریانی، فەرهەنگی مەهاباد، ٦٣٩ - ٦٤٢.

(٣) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، وشەسازی، کردار،ل ٧٤.

لەهەندێ شوێنی ناوەڕاستیشدا بەرچاو دەکەوێت.

ب- پێشگرە ناسادەکان : -

١- ئەو پێشگرانەی لە ئەنجامی تێکەڵبوونی ( پێ، تێ، لێ ) لەگەڵ پێشگری ( - دا، - وە، - ڕا ) دا دروست دەبن، وەك : -

( پێدا، تێدا، پێوە، تێوە، لێوە، پێڕا، تێڕا ) : -

١- پێشگری ( پێدا - ) : پێداچوون، پێداهاتن، پێداڕۆیشتن

٢- پێشگری ( تێدا - ) : تێدابوون، تێداکردن، تێداچوون

٣- پێشگری ( پێوە ) : پێوەکردن، پێوەچوون، پێوەبوون، پێوەخستن

٤- پێشگری ( تێوە - ) : تێوەگلان، تێوەئاژنین، تێوەخستن، تێوەهاتن

٥- پێشگری ( پێڕا - ) : پێڕاگەیشتن، پێڕاهاتن، پێڕاگەیاندن

٦- پێشگری ( تێڕا - ) : تێڕامان، تێڕابردن، تێڕاکردن

٧- پێشگری ( لێڕا - ) : (( لێڕابردن، لێڕاچوون، لێڕاهاتن ))[٢]

٢- ئەو پێشگرە ناسادانەی بەیاریدەی پریپۆزیشنی ( دە، بە، لە، وە، ڕە ) لەگەڵ (ێك، یەك ) دا دروست بوون :

( پێك - )، ( بە + یەك ) : پێکهاتن، پێکزانین، پێککردن

( تێك - )، ( دە + یەك ) : تێکچوون، تێکدان، تێکشکان

( لێك - )، ( لە + یەك ) : لێکدان، لێکبوون، لێکچوون

( وێك - )، وێککەوتن، وێکخستن، وێکدان

( ڕێك - )، ( ڕە + یەك ) : (( ڕێك گوشین، ڕێکخشاندن))[٣]

دووەم : پاشـــــــگرەکان :

لەزمانی کوردیدا دووپاشگر هەن، بەشداری دروست کردنی کاری داڕێژراو دەکەن، ئەوانیش: -

---

(١) لیژنەی زمان، چەمکێکی دی لە ڕێزمانی کوردی،ل ٨٢.

(٢) سەرچاوەی پێشوو،ل ٨٢.

(٣) لیژنەی زمان و زانستەکان، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، ل٤٨١.

پاشگری (( – وه / – ەوه ))، (( – اندن – andin ) ن.

لەبەر گرنگی و ڕۆڵی ئەم دووپاشگرە لە بواری زاراوە سازیدا کەمێك بەدرێژی باسیان دەکەین :–

١/ پاشگری ( – وه / – ەوه ) :

پاشگری ( – ەوه ) ڕۆڵێکی گرنگ و سیمایەکی تایبەتی هەیە، لەزمانی کوردیدا، ئەم ڕەگەزە ڕێزمانییە گشتییە دەچێتە سەر زۆربەی کارەکان، لەهەر کارێکیش دا دەچێتەسەر هەر ڕێژەیەك یان هەر ناوێك لەسەر بنجەکەی دروست کرابێت، جگە لە کاری (مردن) و دارشتنە هاوڕێزمانییەکەی.

مردن – * مردنەوە،

پاشگری ( وه / ەوه ) هەڵدەگرێ لەبارەی وشەسازی و واتاسازییەوە لێك بدرێتەوە : –

١– لەڕووی وشەسازییەوە : –

لەزمانی کوردیدا ئەم ڕەگەزە بە چوار ڕوخسار دەردەکەوێت : – ( – ڕەوە )، (– تەوە)، ( – یەوە )، ( – وە )، لە شێوە زاری سلێمانیدا مۆرفیمی ( – ەوانی ) ش دەبیندرێ، کە بەکارهێنانی بەئەرکێکی قورس بۆ سەر زمان دادەندرێت، لەبەر ئەوەی لە هەموو کاتێکدا دەتوانرێ پاشگری

( – ەوه ) ی لەشوێن بەکاربهێندرێ.

وەك : – نەسرین هاتەوانێ – نەسرین هاتەوە.

٢– لەڕووی واتاسازییەوە : –

– پاشگری ( – ەوه ) لەئاستی واتاسازییدا ((ڕووداوەکاتە مۆرکی تایبەت و ئاکارە دەگمەنەکانی زمانی کوردی، گەلێك واتا دەگەیەنێ))[1]، وەك :

١– دووبارە بوونەوە : – هەڵسان – هەڵسانەوە

٢– گەڕانەوە : – ڕۆیشتن – ڕۆیشتنەوە

٣– گۆڕانی واتای وشە : – خوێندن – خوێندنەوە

---

(١) د. شێرکۆ بابان، ڕێزمانی پاشگری دووپاتیی ( – ەوه )،ل ٥.

(( خوێندن ) بەتەنیا واتای ( دراسة ) یان ( غناء ) دەگەیەنێت، بەڵام ( خوێندنەوە ) واتای (قراءة ) یان (( مطالعة )) دەگەیەنێت ))[1].

٤- گۆرینی چەمك ( مفهوم ) ی وشە، وەك سوتان، سوتانەوە

٥- گۆڕان لە حالەتێکەوە بۆ حالەتێکی دیکە، یان گەڕانەوە بۆ دۆخی جاران : -

(( چوون - چونەوە ))[2]

٦- واتا دەبەخشێ بە هەندێ کاری لێکدراو : - لێبوون - لێبوونەوە

تاقی کردن - تاقی کردنەوە

٧- دەبێتە هۆی دروست بوونی پێشگری نادادە، وەك : -

( پێ - ) + ( - وە ) ⟵ پێوە

( لێ - ) + ( - وە ) ⟵ لێوە

٨- لەگەڵ هەندێ وشەدا، فرەواتایی دروست دەکات : -

شکانەوە : - ١- دووبارە شکان.

٢- شکانەوەی دارو شتی ڕەق.

٣- شکانەوەی منداڵ.

دروونەوە : - ١- درۆێنەکردن، بڕینەوە.

٢- بەتەقەڵ شتی دڕاو پێکەوەنان.

((هێنانەوە : - ١- گێڕانەوە ( منداڵەکەم هێنایەوە )

٢- هێنانەوەی جێ ئەندامی وەرگەڕاو ))[3]

- لەگەڵ چەند بەشە ئاخاوتنێکی دیکەش دەردەکەوێت، جگە لەکار : -

١- دەبێتە پاشپرتکی ئامرازی پەیوەندی : - بە.. وە، لە... هوە، بەنانەوە

٢- لەگەڵ ئاوەڵکار : - سەرەوە، ژێرەوە، خوارەوە

٣- لەگەڵ وشەی وشەی ( دیسان ) - ( دیسانەوە )

---

(١) جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی،ل ٢٩.

(٢) شێخ محەمەدی خاڵ، پێشگر و پاشگر، گۆڤاری کۆڕی زانیاری، ب٢،بەشی یەکەم،ل ٢٦٢.

(٣) هەژار موکریانی، هەنبانەبۆرینە،ل ١٠٢١.

٩- نووسـەران لەبارەیـەوە نووسـیویانەو گرنگیـان پێـداوە، (( ئـەم پاشـگرە گـرنگترین پاشـگرەکانە چـونکە زۆرتـر بـەکارهاتووە و لـە ئـەرکێك پـتر دەبینـێ لـە کارەکـان و ناوەکاندا))[1].

١٠- دەبێتە هۆی زیندوو کردنەوەی ئەو چاوگانەی کە بەبێ ئەم پاشگرە واتا نابەخشن : -

لیستێك لەم چاوگانە دەخەینەروو کە بەبێ ئەم پاشگرە واتا نابەخشن : -

| چاوگی بێ واتا | چاوگی واتادار |
|---|---|
| (( بریسکان | بریسکانەوە |
| بووران | بوورانەوە |
| بووژان | بووژانەوە |
| پەرچان | پەرچانەوە |
| پەنگان | پەنگانەوە |
| پاڕان | پاڕانەوە |
| پلیشان | پلیشانەوە |
| پلیکان | پلیکانەوە |
| پووچان | پووچانەوە |
| پووکان | پووکانەوە |
| تلیسان | تلیسانەوە |
| توان | توانەوە |
| حەوان | حەوانەوە |
| چەمان | چەمانەوە |
| خولان | خولانەوە |
| درەوشان | درەوشانەوە |
| ڕازان | ڕازانەوە |
| ڕووتان | ڕووتانەوە |

(٢) ئەحمەد حەسەن، پێشگر و پاشگر، گۆڤاری کۆڕی زانیاری، ب٣،بەشی یەکەم،ل ٣٢٨.

| | |
|---|---|
| زرنگان | زرنگانەوە |
| شەكان | شەكانەوە |
| فليقان | فليقانەوە |
| بووژان | بووژانەوە |
| پونگان | پونگانەوە ))[1] |

تێبینی : – پاشگری ( – ەوە )، لە دیالێكتی كرمانجی ژووروودا لە شێوەی ( ڤە ) دا وەكو پێشگر خۆی دەنوێنێ، هەندێك جاریش وەكو پاشگر دەردەكەوێت : –

((أ– وەك پێشگر : بوون – ڤەبوون

ب– وەك پاشگر : هات – هاتەڤە

ج– وەك پێشگر و پاشگر لەهەمان كاتدا : ڤەخارڤە ))[2].

٢– بیرو بۆچوونی جیاواز لەبارەی ئەم پاشگرە هەیە، ((چ لە رووی ئەرك و واتاوە چ لە رووی ئەوەی بە پاشگری دادەنێین، یان نا ؟ ))[3] سەبارەت بە پاشگرێتی ( – ەوە )، ئەوە دەڵێین كەوا چاوگ لەزمانی كوردیدا بەگشتی كۆتایی بە ( ن ) دێت (( جگە لە هەورامی كە بە ( ی ) یان بە ( ەی ) كۆتایی دێ ))[4]، جا لەبەرئەوەی دوای ( ن ) دێت، دەبێ پاشگربێ.

---

(١) د. شێركۆ بابان، رێزمانی پاشگری دووپاتیی (( ەوە ))، ل ٧٦.

(٢) صادق بەهائەدین، رێزمانا كوردی، كرمانجی یا ژۆری و ژێریا هەڤبەركری،ل ٢٩٧ – ٢٩٨.

(٣) صباح رشید قادر، هاوبێژی و فرەواتایی لە گیرەكدا،ل ٧٤.

(٤) فەرەیدون عەبدول محەمەد، هەندێ لایەنی رستەسازی زاری هەورامی،ل ٦٠.

## ٢- پاشگری ( – اندن ) : –

١- ئەم مۆرفیمە ( اند، تن، دن ) نی یە، بەڵکو ( اندن ) ە.

٢- ئەرکی سەرەکی ئەم پاشگرە ئەوەیە کە کاری تێنەپەڕ دەگۆڕێ بۆ تێپەڕ ((ئەمەش ڕێگەیەکی دەستوریە بۆ گۆڕینی ئەم کارە ))[١]

| کاری تێنەپەڕ | بناغەی چاوگ | پاشگر | کاری تێپەڕ |
|---|---|---|---|
| ڕژان | ڕژ | ( + اندن ) | ڕژاندن، سوتاندن، گشتاندن، گریاندن گونجاندن، تەقاندن، قەپاندن، پەڕاندن وەراندن، چواندن، بزواندن. |

٣- لەگەڵ ناوی دەنگە سروشتییەکان کاری تێنەپەڕ دروست دەکات : –

میاوە + ( – اندن ) ←——— میاواندن

بارە + ( – اندن ) ←——— باڕاندن، گرماندن، باڕاندن، شیڕاندن، زیڕاندن، قیڕاندن

((ئەم ناوانە دەبن بە چاوگ و فرمانی سادە (بسیط) بەمە ژمارەی چاوگ و فرمانی سادەی دروست کراو زیاد دەکاو دەچێتە پاڵ چاوگ و فرمانە سادە بنجییەکانی ئەم زمانە.

گۆڕینی ئەم ناوانە بۆ چاوگ و فرمان بەیاریدەی پاشگری (( اندن)) لە زمانی کوردیدا بەلگەیێکی ئاشکراو بەهێزە لەو بەڵگانەی سەربەخۆیی ئەم زمانە دەردەخەن.چونکە پاشگری (( اندن)) پاشگرێکی فرمانی و ئێرانی یەو لە هەردوو زمانی کوردی و فارسی دا بەکار دێ، بەلاّم ئەم پاشگرە لە فارسیدا ناوی دەنگ ناکا بە چاوگ و فرمان، واتا ئەم تایبەتیە تەنیا لەزمانی کوردی دا هەیە ))[٢].

٤- جگە لە ناوی دەنگی سروشتی، دەچێتە سەرناوی دیکەش چاوگ و کاری تێپەڕدروست دەکات : –

---

(١) کەوسەر عەزیز ئەحمەد، بیردۆزی مۆرفیم و هەندێ لایەنی وشە سازی کوردی،ل ٨٥.

(٢) د. نەسرین محەمەد فەخری، فەرهەنگی ناوی دەنگ لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات، ژ(١٨)،ل ١١٠.

نرخاندن،دەماندن، کورداندن، ڕەنجاندن...... هتد.

٥- دروست کردنی هەندێك چاوگ بە تێپەڕی بەبێ دیار بوونی ئەو بنچینەی کە لێوەی وەرگیراوە، ( ئەمەش پێویستی بە لێکۆڵینەوەی مێژوویی هەیە ).

دركاندن، سەلماندن، سەپاندن، خەیاندن.... هتد.

٦- دەچێتە سەر هەندێك لەو وشانەی کە بنجیان کوردی نییە، لە زمانێکی دیکەوە هاتوونەتە ناو زمانی کوردی، زۆربەیان بوونەتە کاری تێپەڕ، وەك : -

٧- (( خەلق + ( - اندن ) ⟵ خەلقاندن

بوغز + ( - اندن ) ⟵ بوغزاندن، عیلماندن، هەقاندن))[1].

وەرگرتنی ئەم چاوگانە و سازدانیان بەم شێوەیە لەگەڵ زمانی کوردی، ئەگەر سەرەنجامی پێویستی بێ و نەبێتە هاوبێژ یاخود هاوواتا لەگەڵ چاوگ و کارە کوردییەکاندا دەبێتە هۆی دەوڵەمەند کردنی زمانی کوردی.

٨- پاشگری ( - اندن ) هەندێك جار لەگەڵ پاشگری (( - ەوە )) دا دەچێتە سەر وشەیەك و واتای نوێ بە ووشەکە دەبەخشێت : -

(( لاو + ( - اندن ) + ( - ەوە ) ⟵ لاواندنەوە

٩- پاشگری ( - اندن ) نەك هەر دەچێتە سەر کاری تێنەپەڕ و دەیکاتە تێپەڕ، بەڵکو دەچێتەسەر کاری تێپەڕیش :

ناسین / کارێکی تێپەڕە

(( ناس + ( - اندن ) ⟵ ناساندن ))[2]

١٠-پاشگری ( - اندن ) کاری لێکدراویش دەکاتە سادە، بەتایبەتی ئەو کارە لێکدراوانەی بە ( کردن ) و ( بوون ) دروست دەبن، دوای لابردنی ئەم بەشانە لەکارەکە، وەك :-

(( نەخش کردن - نەخشاندن لوڕەهاتن - لوڕاندن

سازکردن - سازاندن گشت بوون - گشتاندن ))[3]

---

(١) د. نەسرین محەمەد فەخری، پاشگری ( اندن ) لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری، ب٣،بەشی یەکەم،ل ٢٢١.

(٢) مەسعود محەمەد، زاراوەسازی پێوانە،ل ١٠١.

(٣) جەمال عەبدول، بەرکوڵێکی زانستە زاراوە سازی کوردی،ل ٨٦.

١١–دەچێتە سەر ناوەڵناو و وشەی نوێی لێ دادەڕێژرێت : –

ڕووت + ( – اندن ) ⟵ ڕووتاندنەوە

لەکۆتاییدا، ئەوە دەردەخەین کە:–

١– ( – اندن ) مۆرفۆسینتاکسییە، کە دەچێتە سەر دەنگی سروشتی ، وەکو پاشگرێک یاخود مۆرفیمێکی وشە دارێژ وایە.

بارە + (–اندن) ⟵ باڕاندن.

پاشگرە

کە کاری تێنەپەڕیش دەکات بەتێپەڕ وەکو مۆرفیمێکی ڕێزمانی کار دەکات.

خەوتن ـ خەواندن

مۆرفیمێکی ڕێزمانییە

ا ⟵ م. کات

ن ⟵ م. تێپەڕاندن.

د ⟵ م. کات

ن ⟵ (ن)ی چاوگ

٢– ئەم پاشگرە پاشگرێکی چالاک و بەبڕشتە، بەتایبەتی لە سازدانی زاراوەی زانستیدا تاوەکو ئێستا دەیان زاراوەی زانستی بە هۆی ئەم پاشگرەوە داڕێژراون بەتایبەتی لە کتێبی خوێندنگاکاندا ڕۆڵیان بینیوە، لێرەدا هەندێك لەو زاراوانە بەرچاو دەخەین کە

کاتی خۆی کۆڕی زانیاری کورد بەهۆی ئەم پاشگرە دایڕشتووە : –

(( چەسپاندن – اثبات

تۆقاندن– إرهاب

نواندن – استعراض

درکاندن – افشاء

نوساندن – الصاق

خەملاندن – تخمين

نرخاندن – تقدير

گەیاندن – الدلالة

ناساندن – تعريف )) [1].

(( زاناندن – الادراك المعرفي

سازاندن – إصلاح)) [2]

ئۆکساندن... هتد.

٣– لەگەڵ هەندێك ( ناو ) دا زاراوەی دارێژراوی دروست کردووە : –

نەخشاندن، ڕەنگاندن،.... هتد.

---

(١) ئەنجومەنی کۆڕ، لیستەی یەکەمی زاراوی کارگێڕی،ل ٤٢٤، ٤٢٨، ٤٢٩، ٤٣٣، ٤٣٥، ٤٤٣، ٤٤٥، ٤٤٩، ٤٥١، ٤٥٤.

(٢) لیژنەی زاراوە زانستیەکان، زاراوە زانستیەکان،ل ٤٦٤، ٤٦٦.

## مۆرفیمی دوولانه

هەندێ پێشگر و پاشگر لە زمانی کوردیدا هەیە، لە ڕێزماندا کاردەکەن و ئەرکی سینتاکسی دەبینن، وەکو مۆرفیمێکی وشە داڕێژیش بەشداری دەکەن، وەك : –

**یەکەم : پاشگرەکان : –**

– ان : –

أ– ئەرکی سینتاکسی مۆرفیمی ( ان ) ئەوەیە کە : – بە مۆرفیمێکی چالاکی کۆکردنەوەی ( ناو – ئاوەڵناو ) دادەندرێت، لە زمانی کوردیدا، وەك : –

کچ + ان ⟵ کچان

جوان + ان ⟵ جوانان

دەچێتە سەر هەندێك وشە و پاشبەندی سیفەتی کاراییە، وەك : –

(( ڕەو + ( – ان ) ⟵ ڕەوان ))[1].

ب– مۆرفیمی ( – ان ) وەك پاشگرێکی وشە داڕێژ، بەشداری دەکات لە داڕشتنی هەندێك بەشە ئاخاوتن، وەك : – ( ناوی داڕێژراو، ئاوەڵکاری داڕێژراو )

یەکەم : – ناوی داڕێژراو : –

١– لەگەڵ هەندێ وشەی سادە، ناوی تایبەتی مرۆڤ دروست دەکات : –

أ– ناو + ( – ان ) : – ڕێز + ( – ان ) ⟵ ڕێزان، مەردان، لێوان، پەخشان

چاو + ( – ان ) ⟵ چاوان، کێوان

باو + ( – ان ) ⟵ باوان

ب– ئاوەڵناو + ( – ان ) : – مەست + ( – ان ) ⟵ مەستان

٢– پاشگری ( – ان ) دەبێتە هۆی سازکردنی ناوی گشتی داڕێژراو : –

أ– ناو + ( – ان ) : – سەیر + ( – ان ) ⟵ سەیران، زیوان، یاران، هێلان. ب– ئاوەڵناو + ( – ان ) : گەوج (( گۆج )) + ( – ان ) ⟵ گۆچان

٣– لەگەڵ هەندێ وشەدا، ناوی شوێن و جێگە سازدەکات : –

أ– ناو + ( – ان ) : –

---

(١) عەبدولرەحمانی زەبیحی، قاموسی زمانی کوردی،ل ٧٠.

بەشێك لە ناوی ئاوایی و دێهاتەكانی كوردستان، بەهۆی مۆرفیمی ( – ان ) ەوە دروست كراون، لە هەندێكیاندا مۆرفیمی ( – ان )، مۆرفیمی كۆكردنەوەنییە، بەڵكو پاشگرێكە وەك ( اوا – اوە ) كەناوی شوێنی دروست كردووە، وەك : – (ئاشوران، خدران، خەلەكان، حاجی ئۆمەران، گەڕاوان، قلیاسان، كاولان، عەودالان،..... هتد )، لە هەندێكی دیكەیاندا مۆرفیمی كۆكردنەوەیە وەك : – (( قەبران ))[1]، شەكران ، سیدەكان، ((كەڵەكان، دووگردان، شیواشان، قامیشان ))[2]

لەگەڵ ناوی هەندێك هۆز یاخود تیرە، شوێن و جێگە نیشان دەدات، وەك : –

مەنگوڕ + ( – ان ) ⟵ مەنگوڕان

ب– دەچێتە سەر ئاوەڵناوی سادە، ناوی شوێن دروست دەكات : –

نەرم + ( – ان ) ⟵ نەرمان

تەخت + ( – ان ) ⟵ تەختان

وشك + ( – ان ) ⟵ وشكان، ڕاستان، ڕەقان...

لەگەڵ هەندێك ئاوەڵناودا جگە لە واتای شوێن و جیگە بەواتای دیكەش دێت : –

(( باریكان : ١– لووتەكێو لە بنارەوە بەرەو دەشت

٢– ڕیسی زۆر باریك و ناسك )) [3].

ج– دەچێتە سەر ڕەگی كار، ناوی داڕێژراو بەواتای شوێن دروست دەكات : –

(( چەق ( چەقین ) + ( – ان ) ⟵ چەقان ))[4].

٤– مۆرفیمی ( – ان ) بەم واتایانەی خوارەوەش دێت، وەك : –

أ– نیشانەی درێژخایەنی كارێكە : – گەڵا + ڕێز + ( – ان ) ⟵ گەڵاڕێزان

میوە + گەن + ( – ان ) ⟵ میوەگەنان

گوڵ + ( – ان ) ⟵ گوڵان

ب– نیشانەی جەژن و ئاهەنگە : – خەنە + بەند + ( – ان ) ⟵ خەنەبەندان

---

(١) عەبدولرەحمانی زەبیحی، قاموسی زمانی كوردی،ل ٧٠.

(٢) مەسعود محەمەد، زاراوە سازیی پێوانە،ل ١٧٤.

(٣) هەژار موكریانی، هەنبانە بۆرینە،ل ٤١.

(٤) نوری عەلی ئەمین، وشەی ناسادە لە زمانی كوردیدا،ل ٢٤٦.

خەتەنە + سوور + ( – ان ) ← خەتەنەسووران

٥- لەگەڵ هەندێ ناوی سادەدا، جگە لەوەی ناوی دارێژراو دروست دەکات، دەبێتە هۆی دروست بوونی فرەواتایش : – سەر + ( – ان ) ← سەران.

سەران : ١- پیاو ماقوڵان.

٢- بڵندایی یەکان.

<u>چەند تێبینییەك : –</u>

١- پاشگری ( – ان )، لەگەڵ هەندێك ناوی سادەدا، ناوی دارێژراو دروست دەکات، وەك:–

هۆز + ( – ان ) ← هۆزان.

(( هۆزان )) ناوێکی تایبەتییە : – هۆزان خوێندکارە.

٢- ( – ان ) : پاشگری کۆکردنەوەیە : – سەرۆك هۆزانی کورد کۆبوونەوە.

پاشگری ( – ان )، لە وشەی ( هۆزان ) دا، واتای کۆکردنەوە، واتای دارشتن دەدات، هەروەها لە وشەکانی : – کیژان، خوشکان، مەشخەڵان، ڕۆژان ... هتد.

بوونی دوو واتا لەم وشانەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دوو ئەرکە جیاوازەی مۆرفیمی (ان) دەیبینێ جارێك وەکو پاشگری دارشتن و جارێك وەکو نیشانەی کۆکردنەوە، واتە مۆرفیمی ڕێزمانی.

٣- ( هەندێك جار مۆرفیمی ( – ان ) لە ڕووی ئەرکەوە گۆڕانی بەسەردادێت، لە سینتاکسی یەوە بۆ وشە دارێژ، بەپێی گەشە و گۆڕانی زمان، وەك

( أ- مسلم + ان ← موسڵمان

بناغە م. سینتاکسی کۆ

ب- ئێسك + ان ← ئێسقان

بناغە م. سینتاکسی کۆ

ئەم دوو وشەیە بوونەتە ( موسڵمان، ئێسقان )، وەك دوو وشەی سادە ڕەفتار دەکەن، کە لە ڕووی ژمارەوە تاکن، ئەمیش لەکاتی کۆکردنەوەدا دەردەکەون، کە مۆرفیمی سینتاکسی کۆ وەردەگرن :–

موسوڵمان + ان ← موسوڵمانان

ئێسقان + ەکە + ان ⟵ ئێسقانەکان ))[1]

دووەم : ئاوەڵکاری داڕێژراو : –

پاشگری ( – ان ) لەگەڵ هەندێ وشەدا، ئاوەڵکاری داڕێژراو دروست دەکات، وەك : –

١– لەگەڵ ناوی سادەدا، ئاوەڵکاری داڕێژراو دروست دەکات : –

چێشت + ( – ان ) ⟵ چێشتان

٢– دەچێتە سەر ناوی کات، ئاوەڵکاری کات سازدەکات : –

شەوان، ئێواران، بەیانیان، جەژنان، جاران....

٣– لەگەڵ ئاوەڵکاری شوێن، ئاوەڵکاری کات دروست دەکات، وەك : –

پێش + ( – ان ) ⟵ پێشان

پاش + ( – ان ) ⟵ پاشان

٤– لەگەڵ ئاوەڵکاری شوێن، ئاوەڵکاری داڕێژراو بەمەبەستی شوێن دروست دەکات، وەك:–

ناو ( نێو ) + ( – ان ) ⟵ ناوان ( نێوان )

٥– دەچێتە سەر ئاوەڵناو، ئاوەڵکار بە مەبەستی کات دروست دەکات : –

تاریك + ( – ان ) ⟵ تاریکان

ڕۆناك + ( – ان ) سسسس ⟵ ڕۆنان ( ڕۆناکان ). (تاریك و ڕۆنان).

( کاروانەکە بە تاریك و ڕۆنان بە ڕێکەوتن )

<u>دووەم : مۆرفیمی ( ە )</u> : – ئەم مۆرفیمە ئەرکی سینتاکسی جۆراوجۆر دەبینێ، وەك:–

١– [ ە ] : مۆرفیمی کاتی ئێستایە : کرپومە

ئازاد زیرەکە

٢– [ ە ] پاشبەندی نیشانەیە :

ئەم گوڵە

ئەم + گوڵ + ە ↗

٣– [ ە ] مۆرفیمی ناسیاوییە.

---

(١) شێرکۆ حەمە ئەمین قادر، مۆرفیمە بەندە لێکسیکی و ڕێزمانییەکان و ئەرکیان لە دیالێکتی گۆڕاندا،ل ٣٠.

کوڕەکەی ترساند

کوڕ ە ی ترساند

٤- مۆرفیمی [ ە ] وەکو مۆرفیمێکی بەند، شوێنی مۆرفیمی پەیوەندی ( بۆ ) دەگرێتەوە:-

(( دەڕۆم بۆ زانکۆ.

دەڕۆمە زانکۆ ))[1]

٥- [ ە ] : مۆرفیمی دۆخی بانگ کردن و ئاگادار کردنەوەیە لە کرمانجی خوارووداد : -

کوڕە نەچیتە کۆڵان.

ئاگادارکردنەوە

مامە وەرە بۆ ئێرە

بانگکردن

٦- [ ە ] : لە فرەیزی ناویدا، ئەرکی ڕێکخستنی دیارخەر و دیار خراو دەبینێ : -

کچە کورد. کچ + ە + کورد

دیار خراو م.خستنە پاڵ دیارخەر

دووەم : - ئەرکی داڕشتن : -

مۆرفیمی ( - ە ) وەکو پاشگرێکی وشە داڕێژیش، وشەی نوێ دادەڕێژێ : -

١- دەچێتە سەر ناوی سادە، ناوی داڕێژراو دروست دەکات : -

ئاواز + ( - ە ) ⟵ ئاوازە، کۆمەڵە ( الجمعية )، بەرە، دەستە

ئاسمان + ( - ە ) ⟵ ئاسمانە، بازنە، بەرگە، جەرگە (مەرکەن)

باغ + ( - ە ) ⟵ باغە

لەرە، خڵتە، هەریسە، واژە، ژاڵە، هەنارە، ئاوێزە، شەوە، مەرگە... هتد.

پاشگری ( - ە ) لەم وشانەدا، دەبێتە هۆی گۆڕینی فۆرم و ناوەڕۆکی وشەکە، بەوێنە:-

---

(١) ئەبو بەکر عومەر قادر، بەراوردێکی مۆرفۆسینتاکسی لە زمانی کوردی و فارسی دا،ل ٥٢.

وشەی ( شەو ) ناوی کاتە بە پێچەوانەی ڕۆژ، بەڵام کە دەووترێت ( شەوە ) مەبەست لەو گیاندارە ئەفسانەیی یە کە بەشەو منداڵ دەبات.

٢- دەچێتە سەر هەندێك ناو، بە مەبەستی بچوککردنەوە یاخود نازو خۆشەویستی : -

نازدار - نازە

گوڵاڵە - گوڵە

خدر - خلە ... هتد.

٣- لەگەڵ هەندێ ناوی سادەدا، ناوی داڕێژراو بە مەبەستی شوێن و جێگە دروست دەکات:-

سماق + ( - ە ) ⟵ سماقە ( شوێنێکە سماقی لێ یە )

گەو + ( - ە ) ⟵ گەوە ( شوێنێکی چڕ )

٤- لەگەڵ ئاوەڵناوی سادە، ناوی داڕێژراو دروست دەکات، وەك : -

ناسك + ( - ە ) ⟵ ناسکە

تەخت + ( - ە ) ⟵ تەختە

ڕاست + ( - ە ) ⟵ ڕاستە، پوختە

لەگەڵ هەندێ ئاوەڵناوی دیکەدا، ناوی واتایی سازدەکات، وەك

چاکە، خراپە، چەپە....

پاشگری ( - ە ) لەگەڵ ئاوەڵناویشدا بەهەمان شێوە دەبێتە هۆی گۆڕینی فۆرم و ناوەڕۆکی وشەکە، بە وێنە : - (( درۆزن : بەواتای درۆکەر دێت.

درۆزنە : ئاوێکە کە بەهاوین وشك دەکات ))[1].

٣- پاشگری ( - ە ) لەگەڵ ژمارەدا دێت : -

أ- ناوی واتایی دروست دەکات : هەزار + ( - ە ) ⟵ هەزارە

ب- ناوی بەرجەستە دروست دەکات : - پەنج ( پێنج ) + ( - ە ) ⟵ پەنجە

٤- دەچێتە سەر ئاوەڵکار، ناوی داڕێژراو دروست دەکات، وەك : -

بن + ( - ە ) ⟵ بنە

---

(١) هەژار موکریانی، هەنبانە بۆرینە،ل ٢٩١.

٥- (( مۆرفیمی ( ـ ە ) ی خستنەپاڵ، بە پێچەوانەی مۆرفیمی ( ـ ی ) یەوە پێکهاتەی ئاستی فرەیز نزم دەکاتەوە بۆ پێکهاتەی ئاستی وشە ))[1]، وەك : -

مێردی پیر ⟵ پیرە مێرد

پیازی تەڕ ⟵ تەڕە پیاز

تێبینی : - مۆرفیمی ( ە ) لە وشەی ( پیرە مێرد )، ( تەڕە پیاز ) دا بە دوو واتا دێت. ئەوەیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دوو ئەرکەی کە ئەم مۆرفیمە دەیبینێ، جارێك وەکو ناوبەندێکی داڕشتن وشەیەکی تازەی دروست کردووە، جارێك وەکو مۆرفیمی خستنە پاڵ ئەرکی ڕێکخستنی دیارخەرو دیارخراوی بینیوە، واتە مۆرفیمی ڕێزمانی.

٦- پاشگری ( ـ ە ) دەچێتە سەر ڕەگی کارو ناوی داڕێژراو دروست دەکات، وەك : -

پێچ ( پێچان ) + ( ـ ە ) ⟵ پێچە،

خواز ( خواستن ) + ( ـ ە ) ⟵ خوازە

پرس ( پرسین ) + ( ـ ە ) ⟵ پرسە

تاس ( تاسان ) + ( ـ ە ) ⟵ تاسە

بەست ( بەستن ) + ( ـ ە ) ⟵ بەستە

بێژان ( بێژ ) + ( ـ ە ) ⟵ بێژە

٢- ئاوەڵناوی داڕێژراو : -

أ- پاشگری ( ـ ە ) لەگەڵ هەندێ ناوی سادە، ئاوەڵناوی داڕێژراو دروست دەکات : -

بەهار + ( ـ ە ) ⟵ بەهارە

زستان + ( ـ ە ) ⟵ زستانە

ب- لەگەڵ ئاوەڵناوی سادە، ئاوەڵناوی داڕێژراو دروست دەکات : -

پیس + ( ـ ە ) ⟵ پیسە. (پیاوێکی پیسەی قرچۆکە).

خڕ + ( ـ ە ) ⟵ خڕە. ( منداڵێکی خڕەیە ).

ڕەق + ( ـ ە ) ⟵ ڕەقە. ( ژنێکی ڕەقەیە ).

٣- مۆرفیمی ( ی ) : - وەکو مۆرفیمێکی ڕێزمانی چەند ئەرکێك دەبینێ : -

---

(١) ئەبو بکر عومەر قادر، بەراوردێکی مۆرفۆسینتاکسی لە زمانی کوردی و فارسی دا،ل ٤٨.

١- ( ی ) :مۆرفیمی ئیزافەیە، لە دۆخی خستنە پاڵدا دەرخەر بە دەرخراو دەبەستێتەوە:-

قوتابی زیرەك : - خوێندكار + ی + ژیر

ژن + (ی)+ ئازا ⟵ ژنی ئازا دیارخراو م.خستنەپاڵ دیارخەر

٢- ( ی ) : مۆرفیمی كاتی ڕابردووە : -

كڕین ⟵ كڕی

بڕین ⟵ بڕی

٣- ( ی ) :، لە كرمانجی ژووروو، هەندێ شێوە زاری كرمانجی خواروو ، ناوی كارا دروست دەكات:-

مرد - مری - مردی

كەوت - كەتی - كەوتی

هات - هاتی - هاتی

٤- ( ی ) : وەكو پاشگری دۆخ بە ناوی نێرەوە دەنوسێ ئەمە لە كرمانجی خواروو زیاتر لە ناوچەی سۆران ماوەو لە شێوەزارای سلێمانی ئەمڕۆدا بەدی ناكرێ.

دەچمە شاری

مۆرفیمی دۆخ

٥- ( ی ) : مۆرفیمی كەسی دووەمی تاكە : خواردی

ب- مۆرفیمی (- ی ) وەكو پاشگرێكی وشە داڕێژیش ئەرك دەبینێ : -

١- دەچێتە سەر ناوی سادە، ناوی واتایی داڕێژراو دروست دەكات، وەك : -

منداڵ + ( - ی ) ⟵ منداڵی

ئازاد + ( - ی ) ⟵ ئازادی

تیۆر + ( - ی ) ⟵ تیۆری

لەگەڵ ناوی ( زیندان ) كە ناوی شوێنە، ناوی واتایی دروست دەكات : -

زیندان + ( - ی ) ⟵ زیندانی

دەچێتە سەر ناوی واتایی سادە، ناوی واتایی داڕێژراو دروست دەكات، وەك : -

خەیاڵ + ( - ی ) ⟵ خەیاڵی

٢- لەگەڵ هەندێ وشەی داڕێژراو، ناوی واتایی سازدەکات، وەك : -

داخواز + ( - ی ) ⟵ داخوازی

تێبین + ( - ی ) ⟵ تێبینی

شکۆ + مەند ( - ی ) ⟵ شکۆمەندی

٣- دەچێتە سەر ئاوەڵناو، ناوی واتایی سازدەکات، وەك :-

بڵند + ( - ی ) ⟵ بڵندی

بەرز + ( - ی ) ⟵ بەرزی، گەرمی

مەست + ( - ی ) ⟵ مەستی

٤- پاشگری ( - ی ) دەچێتە سەر ئاوەڵکار، ناوی داڕێژراو سازدەکات : -

ناوەند + ( - ی ) ⟵ ناوەندی

٦- پاشگری ( - ی ) کەناوی واتایی سازدەکات، جیاوازە لەگەڵ پاشگری ( - ی ) سیفەتی نیسبی)

٧- دانەپاڵ )، کە دەچێتە سەر ناوو بەشداری لە گۆڕینی واتایدا ناکات : -

١- بەخشینی نەسەب بەهۆی شوێنەوە : -

هەولێر + ( - ی ) ⟵ هەولێری

( جیهان + ( - ی ) ⟵ جیهانی )[١].

٢- دەچێتە سەر ناوی میللەت، وەك : - کورد + ( - ی ) ⟵ کوردی

٣- دەچێتە دوای ناوی مەزهەب و تەریقەتی ئاینی : قادری، نەقشبەندی

٤- هەردینێك کە بە ناوی پێغەمبەرەکەیەوە هەڵدرابێتەوە : - محەمەدی، زەردەشتی

دەچێتە سەر هەندێك ناو، ئاوەڵناوی داڕێژراو دروست دەکات: -

گەنم + (- ی) ⟵ گەنمی

بەهار + ( - ی ) ⟵ بەهاری

٥- مۆرفیمی ( - ی ) لەگەڵ ڕەگی کاری ( بوون )، ناوی واتایی سازدەکات : -

(( نە + بوو + ی ⟵ نەبووی ))[٢].

---

(١) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی ( وشەسازی ) - ئاوەڵناو،ل ٧٧.

(٢) گیوموکریانی، فەرهەنگی مەهاباد،ل ٦٠٩.

٤– مۆرفیمی ( ەکە ) : –

١– نیشانەی ناسراویە، بەدوای ناوو ئاوەڵناوەوە دەنووسێ و دەیانکاتە ناسراو : –

گوڵ + ەکە ⟵ گوڵەکە

جوان + ەکە ⟵ جوانەکە

٢– وەکو پاشگرێکی وشە دارێژیش ئەرك دەبینێ : –

أ– دەچێتە سەر ناوی سادە، ناوی دارێژراو دروست دەکات : –

ئاگر + ( – ەکە ) ⟵ ئاگرەکە

ب– پاشگری ( – ەکە ) بۆ بچووککردنەوەو وێکچواندن بەدوای هەندێ ناوو ئاوەڵناوەوە دەنووسێ : – ١– لەگەڵ ناو

(( پوول + ( – ەکە ) ⟵ پوولەکە ))[1]

٢– لەگەڵ ئاوەڵناو : – قووچ + ( – ەکە ) ⟵ قووچەکە

قووت + ( – ەکە ) ⟵ قووتەکە

سەوز + ( – ەکە) ⟵ سەوزەکە

هەروەها مۆرفیمی ( ەکە ) لە شێوە زاری سلێمانیدا دەچێتە سەر ناوی جێگە :–

کۆنەکە، باتەکە، سەهۆڵەکە، ئەمنەسوورەکە....

٥ – مۆرفیمی ( و ) : – وەك مۆرفیمێکی رێزمانی چەند ئەرکێکی سینتاکسی دەبینێ : –

١– ((هەموو بەشەکانی ئاخاوتن بە مەرجێك لەیەك پۆل بن بەیەکەوە دەبەستێتەوە، وەك:–

ناو + ناو " ئاوەڵناو + ئاوەڵناو " چاوگ + چاوگ " ئاوەڵکار + ئاوەڵکار " جێ ناو + جێ ناو " ئامراز + ئامراز ))[2]

٢– دوو گرێ : ماستی مەڕ و شیری مانگا خۆشە

٣– دوو ڕستەی هاوشان : – (( باوکم چوو بۆ بازاڕ و ئێمە لە ماڵەوە ماینەوە. ))[3]

٤– وەك ئامرازی لێکدەر دوو ڕستە بەیەکەوە دەبەستێتەوە : –

---

(١) صباح رشید قادر، هاوبێژی و فرەواتایی لە گیرەك دا،ل ١٠٥.

(٢) بەکر عومەر عەلی، بەستن و کرتاندن لە زمانی کوردیدا،ل ٨ – ١٢.

(٣) دیار علی کمال، د. طالب حسین علی، یاساکانی ڕۆنان و گوێزانەوە لە ڕستەی کوردیدا،ل ٢٦٠.

هات و گەڕایەوە.

٥- وەك ئامرازی پەیوەندی بەشەکانی ڕستە بەیەکەوە دەبەستێتەوە : -

کوڕان و کچان بەیەکەوە تێدەکۆشن.

٢- ئەرکی وشە داڕشتن : -

أ- پاشگری ( - و ) لەگەڵ هەندێ وشەدا ناوی داڕێژراو دروست دەکات :

دان + ( - و ) ⟵ دانو

ڕۆژ + ( - و ) ⟵ ڕۆژو، داسوو، بازوو، ماسوو

واتای بچووککردنەوە دەگەیەنێت : - بان + ( - وو ) ⟵ بانوو

ب- لەگەڵ ئاوەڵناوی ( جوان ) ناوی داڕێژراو دروست دەکات، وەك : -

جوان + ( - وو ) ⟵ جوانوو

ت- ناوی کارا لەگەڵ کاری تێنەپەڕی خوازەکی دا دروست دەکات : -

هاتوو، نووستوو.... لێ هاتوو

پ- ناوی بەرکار دروست دەکات لەگەڵ کاری تێنەپەری ڕوودان‌دا :

( نوستوو، مردوو )(١)

ج- دەچێتە سەر ئاوەڵناو، ناوی داڕێژراو دروست دەکات، وەك : -

تاڵ + ( - وو ) ⟵ تاڵوو

زەرد + ( - وو ) ⟵ زەردوو

٦- مۆرفیمی ( - ا ) :

أ- مۆرفیمی ( ا ) مۆرفیمی کاتی ڕابردووە، وەك : -

خز + ا ⟵ خزا

وەست +ا ⟵ وەستا

ب- لەگەڵ ڕەگی کار ئاوەڵناوی داڕێژراو دروست دەکات : -

زان + ( - ا ) ⟵ زانـا

---

(١) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی، ئاوەڵناو،ل ٨٥.

توان + ( – ا ) ⟵ توانا

ج– دەچێتە سەر ئاوەڵناو، ئاوەڵناوی دارێژراو دروست دەکات : –

گەرم + ( – ا ) ⟵ گەرما

د– دەچێتە سەر ژمارەی سادە : –

هەشت + ( – ا ) ⟵ هەشتا

هەفت + ( – ا ) ⟵ هەفتا

٧– مۆرفیمی ( ێ ) : –

١–( ێ ) : جێناوی کەسی سێ یەمی تاکە : – نانەکە دەخورێ

ئەو دەچێ
↑
( ێ )

٢–( ێ ) : دەچێتە سەر ناوی گشتی و نەناسیاوی دەکات :

پیاوێ، کچێ، ژنێ.....

٣–( ێ ) : مۆرفیمی دۆخی بانگ کردنە ((بۆ ڕەسەنی مێ))[1] : – کچێ، خوشکێ، پورێ، کابانێ، نەنێ....

٤–هەندێ جار وەکو مۆرفیمی ئیزافەش دەور دەگێڕێ : – ماڵێ نەسرینێ
↑
ئیزافە

جگە لەم ئەرکانە، ئەرکی وشە دارێشتنیش دەبینێ : –

١– لەگەڵ ناوی کاتدا، ئاوەڵکاری کات دروست دەکات : هاوینێ، بەهارێ، شەوێ

٢– لەگەڵ هەندێ ناوی سادە، ئاوەڵکاری شوێن دروست دەکات : – ژوورێ، ماڵێ، سەرێ

٣– دەچێتە سەر هەندێك ناو و واتای بچوککردنەوە دەدات : – گوڵێ، خەجێ، نازێ

٤–دەچێتە سەر ئاوەڵناو : – پیر + ( – ێ ) ⟵ پیرێ.

٥– دەچێتە سەر ناوی سادە، ئاوەڵناوی دارێژراو دروست دەکات : –

کرم + ( – ێ ) ⟵ کرمێ.

---

(١) د. کوردستان موکریانی، سینتاکسی ڕستەی کوردی،ل ١٦.

٨- مۆرفیمی ( ۆ ) : -

١- مۆرفیمی دۆخی بانگ کردنی نێرینەیە : -

لاوۆ، باقۆ، خالۆ، مامۆ..... هتد.

هەروەها ئەم ئەرکانەی خوارەوەش دەبینێ : -

١- دەچێتە سەر هەندێك ناوی سادە، ناوی دارێژراو دروست دەکات، وەك : -

قاش + ( - ۆ ) ⟵ قاشۆ

بانگ + ( - ۆ ) ⟵ بانگۆ ، گوت + ( - ۆ ) ⟵ گوتۆ

(( کیس + ( - ۆ ) ⟵ کیسۆ ))[1] ، کورد + ( - ۆ ) ⟵ کوردۆ

٢- دەچێتە سەر ناوی بچوککراوە : -

جەمیلە ⟵ جەمۆ

(( خەجیجە ⟵ خەجۆ ))[2]

هەندێك بۆچوونی وادێتە کایەوە کەئەمانە نیشانەی نێرن و دراون بەمێ وەك ئەوەی هەندێك باوك بەکچ دەڵێن (کوری بابە)

٣- دەچێتە سەر ئاوەڵناوی سادە، ئاوەڵناوی دارێژراو دروست دەکات : -

پیس + ( ۆ ) ⟵ پیسۆ، ڕەشۆ

پاك + ( ۆ ) ⟵ پاکۆ

٩- ( م ) :

١- مۆرفیمی ( م ) جێ ناوی لکاوە بۆ کەسی یەکەمی تاك : خواردم، چووم

٢- لەگەڵ ناوی ( خانم، بەگم ) بە دوو واتا دێت : -

بەگ + ( - م ) ⟵ بەگم ١- گەورەم

خانم + ( - م ) ⟵ خانم ٢- ناوی تایبەتی ژنانە. (بەگم چوو بۆ سەر کانی).

١٠- ( تا ) : ئەرکی سینتاکسی :

١- دوو کات بەیەکەوە دەبەستێتەوە : - شەو تا بەیان ناخەوم.

٢- دوو شوێن : - کۆیە تا هەولێر ٧٠ کیلۆ مەترە.

---

(١) گیو موکریانی، فەرهەنگی مەهاباد،ل ٥٠٤.

(٢) نوری عەلی ئەمین، گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردی،ل ١٠.

٣- دوو گرێ : - جوانی تۆ تا جوانی ئەو فەرقی هەیە.

٤- بەراوورد کردنی دوو ناو : - شار تا شار جیاوازە.

٥- ئـامرازی ( تـا ) وەك ئـامرازێکی ( پـەرگر ) دەچـێتە سـەر نـاو و بـە کـاری دەبەستێتەوە:-

تا مردن لەگەڵی ئاشت نابمەوە.

٦- دەچێتە سەر گرێی ناوی ( شت، دیاردە، ڕادە ) نیشان دەدات : -

تا پێغەمبەرانیش دەمرن.

١١- ( ین ) : -

أ- مۆرفیمی ( ین ) چەند ئەرکێکی سینتاکسی دەبینێ، وەك : -

١- ( ین ) دەچێتە پاڵ پلەی بەراورد، بۆ باڵاکردنی :

جوانتر + ین ←——— جوانترین

٢- ( ین ) وەك مۆرفیمی ڕێزمانی دەبێتـە پاشـگر بـۆ ژمـارە و سیفەتی پلـەداری پـێ دەبەخشێ : -

یەکەم + ( - ین ) ←——— یەکەمین.

ب- مۆرفیمی ( - ین ) لەگەڵ چەند وشەیەکدا ئەرکی داڕشتن دەبینێ، وەك:-

١- دەنووسێ بە ناوەوە و شوێنی بۆ دروست دەکات

سەر + ( - ین ) ←——— سەرین ( پێداویستی خەوتن )

٢- دەچێتە سەر ئاوەڵکاری شوێن و دەیکاتە ئاوەڵناو :

( بەر + ین ) ←——— بەرین

٣- دەچێتە سەر ناوو دەیکاتە ئاوەڵناو، وەك : - زێر + ( - ین ) ←——— زێرین

١٢- هەروەها هەندێ وشە کە بـەهۆی مـۆرفیمی ڕێزمـانی کۆکراونەتـەوە، بوونـە بـە وشـەی فەرهەنگی، وەك : ( ات ) : - مۆرفیمی کۆکردنەوەیە، کە لە زمـانی عـەرەبی بـەوە هاتۆتـە نـاو زمـانی کـوردی، هەنـدێك جـار مـۆرفیمی ( و، هـ، جـ ) یـش دەچـێتە نێـوان وشـەکەو ئامرازەکە. هەنـدێك لـەو ناوانـەی کـە بـەهۆی ئـەم ئامرازەوە کۆکراونەتـەوە، چـوونەتە نـاو فەرهـەنگ و بـوون بـە وشـەی فەرهـەنگی، وەك : (مـاڵات )، دێهـات، سـەوزەوات، خـێڵات، میوەجات، ئاغاوات....

گەل : – گا + ( – گەل ) ⟵ گاگەل

مێ + ( – گەل ) ⟵ مێگەل

وشتر + ( – گەل ) ⟵ وشترگەل

ڕان / ڕۆن:– گا + ( – ڕان ) ⟵ گاڕان / گاڕۆن.

## دووەم : پێشگری دوولانە

١– مورفیمی ( نا – نە ) : – ئەم دوو مۆرفیمە ئەرکی سینتاکسی دەبینن کە بۆ ناکردن بەکاردێن، بەڵام واتای نەرێی ( نە ) بە هێزترە تا ( نا ) ئەمەش لە دوو خاڵدا دەردەکەوێت : –

١– ( نە ) واتای نەهی ڕادەگەیەنێ ( نەخۆی، نەکەی ) نەهیش بەهێزترە لە نەفی.

٢– لە ڕابردوودا ( نە ) بۆ نەفی بەکاردێت، وەك : – نەچوو، نەهات، نەیبرد.

نا : لەگەڵ ڕانەبردوو بەکاردێت شوێنی مۆرفیمی ( دە ) ی بەردەوامی یان ( بـ ) ی ئیلزامی دەگرێتەوە، نەفی ڕانەبردوو زیاتر جێی شك و گومانە وەك لە هی ڕابردوو، کە دەڵێین : –

دارا ئەمساڵ دەرناچێت. ( لەوانەیە دەریش بچێت )

بەڵام کە دەڵێین : – دوێنێ باران نەباری. (( لەوانەیە بەڕاستی نەبارییبێت ))[1].

٢– ئەرکی دارشتن : –

أ– نا : – مۆرفیمی ( نا – ) دەتوانێت وەکو پێشگر وشەی نوێ دابڕێژێت، لەگەڵ گەیاندنی واتای نەفی بۆ ئەو وشەیەی کە دەچێتە سەری : –

١– لەگەڵ ناودا بەکاردێت، ئاوەڵناوی داڕێژراو دروست دەکات : –

( نا – ) + مرۆڤ ⟵ نامرۆڤ، نائینسان

( نا – ) + پیاو ⟵ ناپیاو

٢– لەگەڵ ئاوەڵناوی سادە، ئاوەڵناوی داڕێژراو دروست دەکات : –

( نا – ) + ڕێك ⟵ ناڕێك

( نا – ) + پاك ⟵ ناپاك

( نا – ) + شیرین ⟵ ناشیرین، ناڕاست، ناساغ....

٣– دەچێتە سەر ئاوەڵناوی داڕێژراو، واتای نەرێ دەگەیەنێ : –

---

(١) مەسعود محمد، زاراوەسازی پێوانە،ل ٣٧.

(( نابەجێ، نالەبار، نابەدڵ، نابەکار.... ))[1]

٤- دەچێتە سەر هەندێك لەو وشانەی لەکار وەرگیراون : -

نا + بینا ⟵ نابینا

نا + دیتە ⟵ نادیتە

٥- ((بەرانبەر بەو وشانەی کە پێشگری ( نا ) یان بۆ بەکاردێت لە کرمانجی خوارووودا، لە کرمانجی ژووروودا پێشگری ( نە ) بەکاردێت، وەك : -

ناپاك - نەپاك

ناچار - نەچار))[2]

٦- ((مۆرفیمی ( نا ) دەچێتە سەر هەندێك وشە کە لەزمانی کوردی ئەمڕۆدا بەتەنیا واتایان نییە، وەك : - ( ناچیزە، ناقۆڵا، ناشێ ) بەشی دووەمی وشەکان ( چیزە، قۆڵا، شێ ) بەتەنیا واتایان نی یە، هەندێ نووسەر ناو لەو جۆرە مۆرفیمانە دەنێن مۆرفیمی ( بێ هاوتا) ))[3]

مەبەست لە مۆرفیمی ( بێ هاوتا ) ئەو مۆرفیمانەیە کە تەنیا لەیەك نموونەدا دەبینرێ و جارێکی دیکە لە زمانەکەدا بەم واتایە بەکارنەهاتووە.

٢- مۆرفیمی نە : - ئەرکی سینتاکیی : نەفی کردنە لە ڕابردوودا، نەهی کردنە لە ڕانەبردوودا:- ئەرکی وشە دارشتن:- وەکو پێشگرێکی نەفی بەشداری دەکات لەدروست کردنی زاراوەی دارێژراودا : -

١- لەگەڵ ڕەگی کار، ئاوەڵناوی دارێژراو دروست دەکات، وەك : -

| چاوگ | ڕەگ | ئاوەڵناو |
| --- | --- | --- |
| زانین | زان | نەزان |
| ناسین | ناس | نەناس |
| (( وێران | وێر | نەوێر ))[4] |

(١) لێژنەی زمان و زانستەکان، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی،ل ٣٩٨.

(٢) سەرچاوەی پێشوو،ل ٤٠٠.

(٣) کەوسەر ئەحمەد عەزیز، بیردۆزی مۆرفیم و هەندێ لایەنی وشەسازی کوردی،ل ٧.

(٤) لێژنەی زمان و زانستەکان، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی،ل ٤٠٤.

نەمر، نەبەز، نەدیو....

٢- دەچێتە سەر ئاوەڵناوی دارێژراو، ئاوەڵناوی دارێـژراو بـەواتای نـەفی سـازدەكات، وەك:-

(( بەكار، نەبەكار ))[١]

٣- لەگەڵ ئاوەڵناوی سادە دا دێت و ئاوەڵناوی دارێژراو دروست دەكات: -

( نە - ) + خۆش ⟵ نەخۆش

( نە - ) + ساغ ⟵ نەساغ

٤- لەگەڵ كاری سادە، كاری دارێژراو دروست دەكات بەنەفی : -

هێشتن - نەهێشتن ، سرەوتن - نەسرەوتن.

زانین - نەزانین

مان - نەمان

٥- دەچێتە سەر ناوی واتایی، ئاوەڵناوی دارێژراو دروست دەكات، وەك : -

نە + فام ⟵ نەفام

٦- لەگـەڵ كـاری ڕابـردوو، ئاوەڵنـاوی دارێـژراو دروسـت دەكـات : - هـات - نـەهات (هاتونەهات)

٧- وادەبێت ئەو وشەیەی كە پێشگری ( نە ) دروستی دەكـات، هاوواتایـە لەگـەڵ ئـەو پێشگرەی كە مۆرفیمی ( نا ) دروستی دەكات : -

شارەزا، نەشارەزا، ناشارەزا

٨- هەندێك جاریش ئەو وشەی كە مۆرفیمی ( نە - ) دروستی دەكات لە واتادا كـەمێك جیاواز دەبێت لەو وشەیەی كە پێشگری ( نا ) دروستی دەكات : -

| | | |
|---|---|---|
| خۆش | نەخۆش | ناخۆش |
| (( پیاو | نەپیاو | ناپیاو |
| ساز | نەساز | ناساز ))[٢]. |

---

(١) گیو موكریانی، فەرهەنگی مەهاباد،ل ٦١٠.

(٢) لێژنەی زمان و زانستەكان، ڕێزمانی ئاخاوتنی كوردی،ل ٤٠٧.

# پرێپۆزیشنەکانی ( بە – بێ – بۆ – لە )

زمانەوانان و نووسەرانی کورد دەمێکە هەستیان بەوە کردووە، کە ئەم مۆرفیمانە سەرەڕای ئەوەی کە پرێپۆزیشنن و ئەرکی سینتاکسی دەبینن لەگەڵ هەندێ وشەدا وەکو پێشگریش دەور دەبینن، د. ئەورەحمانی حاجی مارف لەم ڕووەوە دەڵێ : – (( هەندێ لە پرێپۆزیشنەکان وەکو پێشگر و ئینتەر فێکس خۆیان دەنوێنن ))[1].

لەڕووی ئەرکی وشەو داڕشتنەوە باسیان دەکەین، کە سوودیان هەیە بۆ دروست کردنی زاراوە و دەوڵەمەند کردنی فەرهەنگی زمانی کوردی : –

١– مۆرفیمی ( بە ) : –

عەبدولرەحمانی زەبیحی ( ١٢ ) بەکارهێنانی بۆ مۆرفیمی ( بە ) دیاریکردووە، بەڵام وەك ئامراز ناوی بردووە نەك پێشگر.[2]

مامۆستا خاڵ لە فەرهەنگەکەیدا لە دەیەم بەکارهێنان کە بۆ ( بە ) ی دیاریکردووە دەڵێ :

– (( إسم دەکات بە صفة ))[3] بەبێ ئەوەی ناوی پێشگری لێ بنێ.

مامۆستا توفیق وەهبی لە لاپەڕە ( ٨ – ٩ ) ی فەرهەنگەکەیدا باسی ( بە ) بە درێژی دەکات، لەخاڵی شەشەمی بەکارهێنانەکاندا ئەم مۆرفیمەی بە پێشگر داناوە نموونەی بۆ هێناوەتەوە، وەك : –

(( بەئاگا، بەرِق، بەکەڵك، بەرێ و جێ ))[4]

مامۆستا نوری عەلی ئەمین لە لاپەڕە ( ١١٢ ) ی ڕێزمانەکەیدا ( بە ) ی بە ئامرازی پەیوەندی داناوە و دەڵێ : – ((ئاوەڵناوی پێ لە ناو دروست دەکرێت)).[5]

مۆرفیمی ( بە ) لەم بەکار هێنانانەی خوارەوەدا بەشداری لە داڕشتنی وشەی نوێدا دەکات و واتای نوێی پێ دەبەخشێت : –

---

(١) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی،ل ٦٧.

(٢) عەبدولرەحمانی زەبیحی، قاموسی زمانی کوردی،ل ١٢٨.

(٣) شێخ محەمەدی خاڵ، فەرهەنگی خاڵ،ل ١٣٨.

...ی زمان و زانستەکان، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی،ل ٣٨١.

(٥) نوری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی،ل ١١٢.

١–لەگەڵ ناودا ئاوەڵناو دروست دەکات، وەك : –

( بە – ) + هێز ⟵ بەهێز

( بە – ) + ناز ⟵ بەناز

بـەئالۆش، بەئەنـداز...، بەدەسـت ( تێبینـی : – هەنـدێ جـار دەبێتـە نـاوی تایبـەتی ((بەهەست))

٢–لەگەڵ ناوی سادە، ئاوەڵکار دروست دەکات : –

بە + گوڕ ⟵ بەگوڕ

بە + تەنیا ⟵ بەتەنیا

٣–لەگەڵ ڕەگی کار، ئاوەڵکار دروست دەکات : –

بە + کوڵ ( کوڵان ) ⟵ بەکوڵ

بە + جۆش ⟵ بەجۆش

٤–بەیاریدەی پاشگر ( ی – ایەتی ) ئاوەڵکار دروست دەکات کە پێشتر باسمان کردووە.

٥–مۆرفیمی ( بە ) کاری لێکدراو دروست دەکات، وەك : –

بەجێهێشتن، بەجێهێنان، بەجێگەیاندن، بەتەنگەوەبوون

٦– ((پێشگری ( بە ) لەگەڵ پریپۆزیشنی ( بۆ ) دێت، وەك:– بە + بۆ ⟵ بەبۆ))[1]

٧– لەگەڵ پۆستپۆزیشنی ( –ەوە ) ئاوەڵکار دروست دەکات، وەك : –

بەگومانەوە، بەتەوسەوە، بەداخەوە، بەپێوە

٨– مۆرفیمی ( بە ) دەچێتە سەر هەندێ وشەو دەبێتە هۆی دروست بوونی فرەواتایی:–

بەبرشت : ١– دەغڵ و دانێك کەزۆری لێ هەڵبگیرێ.

٢– کەسێك سەری لەکار دەربچێ.

بەباچوون : ١– بەفیڕۆ چوونی ماندوو بوون و ڕەنج.

٢– بەبا ڕۆیشتنی شتی مادی (( وەك دەغڵ و دان ))[2]

بەدەسەڵات : ١– خاوەن زۆر و توانست.

٢– کەسێکی قسەی بڕوات.

---

(١) عەبدولرەحمانی زەبیحی، قاموسی زمانی کوردی،ل ١٣٤.

(٢) سەرچاوەی پێشوو،ل ١٣٤.

٩–دەچێتە سەر ئەو وشە لێکدراوانەی کە بەپاشگری ( کێ ) کۆتاییان هاتووە، وەك:–

بەسکە خشکێ، بەدەمەلاسکێ

وەهاش دەبێ بەپاشگری ( ێ ) کۆتاییان هاتووە، وەك : –

((بەدڵە لەرزێ، بەلنگەفرتێ)). [1]

## ٢–مۆرفیمی ( بێ – ) : –

ئەمەش وەك مۆرفیمی ( بە ) لە داڕشتنی هەندێ وشـەدا دەور دەبینـێ، یەکـەمیان بـۆ ئەرێنبەتی یە، دووەمیان بۆ نەرێیەتی یە.

هـەردووکیان لەگـەڵ هـەموو جـۆرە ناوێکـدا دەگـونجێن چ نـاوی واتـایی بـێ یـان نـاوی بەرجەستەبێ یان ناوی کات و جێگابێ، ئاوەڵناو پێك دەهێنن : –

ئەم دوو مۆرفیمە لە زۆر وشەدا بەواتای پێچەوانە بەرانبەر یەك دێن : –

بەناز – بێ ناز

بەدەست – بێ دەست

بەزمان – بێ زمان

بەلاّم مەرج نییە لە هەموو وشەیەکدا ئەم دوو مۆرفیمە بەرانبەر یەك بووەستن : –

| | | |
|---|---|---|
| بێ تاوان | نابێتە | * بەتاوان |
| بێ باك | – | * بەباك |
| بێ وار | – | * بەوار |
| بێ هاوتا | – | * بەهاوتا |

بەپێچەوانە شەوە : –

| | | |
|---|---|---|
| بەلێزمە | نابێتە | بێ لێزمە |
| بەگوڕ | – | * بێ گوڕ |

پێشگری ( بێ – ) لەگەڵ مۆرفیمی ( – ەوە ) یەك دەگرێت : –

بێوە + ژن ⟵ بێوەژن.

دوای گۆڕانی مۆرفینی (بە) بۆ مۆرفینی (وە)

بێ + بەژن > وە

---

(١) لێژنەی زمان و زانستەکان، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی،ل ٢٨٣.

٤- مۆرفیمی ( بێ ) لەهەندێ وشەدا بەشێکی بنجی وشە کەیە، وەك : -

بێگانە، بێدار..... هتد.

٣- مۆرفیمی ( لە - ) :

مۆرفیمی ( لە - ) لەگەڵ هەندێ وشەدا وەکو پێشگر دەوردەبینێ، وشەی دارێژراو دروست دەکات. بەڵام زۆر چالاك نی یە و لەبواری زاراوە سازیدا، بواری بەکارهێنانی لە دارشتنی وشەدا بەرتەسکە.

- مۆرفیمی ( لە - ) دەچێتە سەر ئەم بەشە ئاخاوتنانەی خوارەوەو وشەی نوێ دروست دەکات:-

١- ناوی دارێژراو : -

لەمێژ، لەبار

٢- ئاوەڵناوی دارێژراو : -

لەڕوو، لەبار، لەناوبەر، لەجێ، لەبەردڵان، لەڕك

٣- کاری ناسادە : - لەناوچوون، لەبەرکردن، لەجێ چوون

٤- ئاوەڵکاری چۆنیەتی : - (( لەپڕ، لەناکاو ))[١]، لەتاو.

٥- لەگەڵ پریپۆزیشنی ( بۆ ) بەکاردێت : - (( لە + بۆ ⟵ لەبۆ ))[٢]

٤- مۆرفیمی ( بۆ - ) : -

پێشگری ( بۆ - ) بەبەریەوە هەیە زاراوەی دارێژراو دروست بکات لەگەڵ بەشێك لەو کارانەی کە بزووتنەوەیان تێدایە، وەك : - بۆچوون....

بەڵام دەبێ زاراوە ساز لەم ڕووەوە وشیار بێ و بەتایبەتی تێبینی ئەوەبکات کە مەیدانی بەکارهێنانی هەر لەگەڵ کارە.[٣]

لەگەڵ ناودا تەنیا لەزاراوەی ( بۆناو ) دادەبیندرێ کە لەبری ( جێناو ) دانراوە، بەڵام نەیتوانیوە بچەسپێ و بەزاراوەیەکی سەرکەوتوو دابندرێت.

---

(١) گیو موکریانی، فەرهەنگی مەهاباد،ل ٥٤٨ - ٥٥٢.

(٢) نوری عەلی ئەمین، وشەی ناسادە لەزمانی کوردیدا،ل ٢٤٤.

(٣) مەسعود محەمەد، زاراوەسازیی پێوانە،ل ٢٦.

پێشگری ( بۆ ) لە وشەی ( بۆچوون ) دا دوو واتای بۆ وشەکە دروست کردووە : -

بۆچوون : ١- بەرەو کەسێك یان شتێك ڕۆیشتن.

٢- لێکدانەوەو گەیشتنە ئەنجام لەسەر مەسەلەیەك.

وشـەی وەك (( بۆخـواردن، بۆفرۆشـتن، بـۆکرێ، بۆهـەڵگرتن، بۆداتاشـین، بـۆبرین، بۆخانمان..... نەبونەتە وشەی فەرهەنگی مۆرفیمی ( بۆ ) لەگەڵیانـدا هـەر پرێپۆزیـشنە بـە پێشگر دانانرێ))[1].

هەندێ وشەی سادە هەیە لەزمانی کوردیدا لە هەندێ بەکار هێنانـدا ڕووەو پێـشگر بوونەتەوە، وەك : - ( لا، بەر، سەر، ژێر، بن، دوا، پێش، پاش، پشت، ناو، بەست،.... ) ئەمەش هـەنگاوێکی گرنگە بەتایبـەتی کاتـێ وەکو پێشگری نـاو خۆیـان دەنوێنن، لەبـەر ئەوەی لەزمانی کوردیدا ژمارەی ئەو پێشگرانەی کە دەچنە سەر بەشە ئاخاوتنی ( ناو ) بـە بەراوورد لەگەڵ پاشگرەکان کەمە.

زمانەوانان لەبارەی ئەم مۆرفیمانە بۆچوونێکی یەکگرتوویان نی یە : -

هەنـدێکیان لـەو بـاوەڕەدان کـە ئەمانـە تـەنیا وشـەی سـادەن، هەنـدێکی دیکـەیان وا دادەنێن، کە ئەم مۆرفیمانە وشـەی سـادەن بـەڵام لـە هەنـدێ بەکارهێنانـدا وەکـو پێـشگر خۆیان دەنوێنن. لێژنەی زمان و زانستەکان بە درێژی لێکۆڵینەوەی لە بارەی ئەم مۆرفیمانە کردووە، بەڵام بڕیارێکی یەکگرتوو، کۆتایی نەداوە.

بۆچوونی ئێمە لەگەڵ ئەو بۆچوونانەدا یەکدەگرێتەوە کە پێی وایە : -

ئەم مۆرفیمانە بەر لە هەموو شتێك وشەی واتادارن، بەڵام دەتوانن وەکو پێـشگریش خۆیـان بنوێنن.

((زمانی کوردی زمانێکی زیندووە دەستووری زمانەوانی تایبـەت بـەخۆی هەیـە، بەوێنـە لەزمانی کوردیدا دیاردەی گوێزانەوەی وشـە لـە بەشـێکی ئاخاوتنـەوە بـۆ بەشـێکی دیکـەی ئاخاوتن یان بوونی وشە بە ئافیکس و ئینتەرفێکس زۆر کاریگەرە))[2].

لێرەدا ئاماژە بەئەرکی دارشتنی هەریەکە لەو مۆرفیمانە دەکەین : -

---

(١) لێژنەی زمان و زانستەکان، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی،ل ٥٠.

(٢) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی بە ئەلف و بێی ی عەرەبی،ل ٦٠ - ٦١.

١- مۆرفیمی ( لا ) :

وەکو پێشگر دەتوانێ وشە و زاراوەی نوێ دروست بکات : -

أ- لەگەڵ ناوی سادە دادێت، زاراوەی نوێ دادەرێژێت :

لاسەنگ، لاچاوە، لایەنگر، لاکێشە، لاپاڵ، لادێ، لاتەریزە

ب- لەگەڵ ناوی سادە، ئاوەڵناوی دارێژراو دروست دەکات :

لاسار، لاشەڕ، لادین، لامل، لاتەریك

ج - لەگەڵ ئاوەڵناوی سادە، ئاوەڵناوی دارێژراو دروست دەکات: لاچەپ

د - لەگەڵ ڕەگی کار، ناوی کارا سازدەکات : - لابەن، لامژ، لاکوت، لاکێش

چەند زاراوەیەك لە فەرهەنگی قوتابی کە فەرهەنگێکی پەروەردەیی یە دەخەینە بەرچاو، کە مۆرفیمی ( لا ) تێیاندا ڕۆڵی پێشگری بینیوە : - (( لالوت، لاجانگ، لاپاڵ، لاسەر، لاشان، لاگوپ، لاڕێ، لاملی، لایەکسان، لابەلا، لایەنگر، لادان، لاڕوو، لاکردن... ))[1].

لەبەرگی چوارەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاریدا، زاراوەی(( ( لاسار ) بەرانبەر (جناح) هاتووە، زاراوەی ( لاساری ) بەرانبەر ( الجنوح ) ( Delinquncy ) هاتووە)).[2]

پێشگری ( لا ) لەگەڵ چەند چاوگێکی سادەدا دێت و چاوگی دارێژراو دروست دەکات : -

لاچوون، لاگرتن، لاکەوتن، لابردن.... هتد.

٢- مۆرفیمی ( شا ) : -

ئەم مۆرفیمە زیاتر لە دارشتنی ئەو زاراوانەدادێت کە مەدح هەڵدەگرن، یان پلەی باڵای شتێك دەگەیەنێ.

مۆرفیمێکی چالاکەو دەتوانێ زاراوەی نوێ بەدەستەوە بدات.

---

(١) لیژنەیەك لەوەزارەتی پەروەردە، فەرهەنگی قوتابی،ل ١٣٥.

(٢) ئەنجومەنی کۆڕ، زاراوە زانستییەکان، گۆڤاری کۆڕی زانیاری،ل ٤٦٨ .

مۆرفیمی ( شا ) لەم وشانەی خوارەوە وەکو پێشگر دەردەکەوێت : –

(( شاباز، شابەندەر، شاپەڕ، شاباش ))[1] هەروەها لە وشەکانی شاناز، شاجوان، شاهێن شاکەل، شادی، شاگوڵ، شاکار، شادەمار، شاگەشکە.

مۆرفیمی ( شا ) لەم وشانەدا وەك مۆرفیمی ( شا ) نییە لە وشەکانی (( شاژن، شازادە.... هتد ) کە وشەیەکی سادەیە.

هەندێك جار پێشگری ( شا ) لەگەڵ وشەی ( سەرەکی ) یەکدەگرنەوە : – شاپرۆژە – پرۆژەی سەرەکی جاری واش هەیە لێك دەترازێن، وەك ( شاکار، شاگوڵ ) بەرانبەر هەمان واتا ناوترێت: – کاری سەرەکی، گوڵی سەرەکی )).[2]

٣– <u>مۆرفیمی ( بەر – )</u> : –

١– مۆرفیمی ( بەر ) لەم وشانەی خوارەوەدا پێشگرە : –

بەردان ( بەردانەوە )، بەرکەوتن، بەربوون ( بەربوونەوە ).

((مۆرفیمی ( بەر – ) لەم کارانەدا هەمیشە لەگەردانداندا دەردەکەوێتەوە، وەك : –

بەرم دا، بەرتدا، بەری کەوت، بەرتان کەوت، بەربوویت..... هتد )).[3]

٢– مۆرفیمی ( بەر ) دەچێتە سەر ناوی سادە، زاراوەی دارێژراو دروست دەکات، وەك : –

( بەر – ) + چاو ⟵ بەرچاو

(( ( بەر – ) ئەنجام ⟵ بەرئەنجام ))[4]

( بەر – ) + دەست ⟵ بەردەست

لە بواری زاراوەسازیدا یەکێك لە بەکارهێنانە بەبرشتەکەی ( بەر ) ئەوەیە کە ناوی بەرکار دروست دەکات، وەك بەرپرس، بەرکوت، بەرهەست، بەربار، بەرشەق، بەرترس

ت– ناوی کارا دروست دەکات وەکو پێشگر خۆی دەنوێنێ : – بەرهەڵست، بەرگر.

---

(١) گیو موکریانی، فەرهەنگی مەهاباد،ل ٢٧٩.

(٢) مەسعود محەمەد، زاراوەسازیی پێوانە،ل ١٣٨.

(٣) لێژنەی زمان و زانستەکان، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری،ل ٢٥٣.

(٤) لێژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە، فەرهەنگی قوتابی، ل٢٧.

٣- دەچێتە سەر ئاوەڵناو : - ( بەر - ) + تەنگ ←——— بەرتەنگ

(( ( بەر - ) + چەپ ←——— بەرچەپ ))[1]

٤- دەچێتە سەر ئاوەڵکار : - ( بەر - ) + تەك ←——— بەرتەك

لەبەکار هێنانەکانی ( بەر ) وەکو پێشگر چەند زاراوەیەك پێشنیاز کراوە : - بەرچێژ، بەرسەنگ، بەرگوت، بەرپرس، بەرزانست، بەرشۆر، بەرتوانا.....، هەندێکیان کەوتوونەتە مەیدانی بەکارهێنان و ڕۆیشتوون، بەڵام هەندێکی تریان بەکار ناهێنرێن.

٤- مۆرفیمی ( دەر - ) :

لەهەندێ وشەدا وەکو پیشگر خۆی دەنوێنێ و وشەی داڕێژراو دروست دەکات، وەك : -

دەرهێنان، دەرکەوتن، دەرخستن، دەرنان

لەگەڵ ڕەگی کاردا ناوی کارا دروست دەکات، وەك : -

دەرخەر، دەرکێش، دەرهێنەر

٥- مۆرفیمی ( سەر ) :

مۆرفیمی ( سەر ) لەگەڵ هەندێك وشەدا وەکو پێشگر دەردەکەوێت : -

سەرکەوتن، سەرگرتن، سەرلێ دان، سەرکەوتوو، سەرکۆنە، سەرسەری، سەرتوو، بەسەرکردنەوە، بەسەرگرتنەوە، بەسەرچوون، بەسەرهاتن، سەربەخۆ

مۆرفیمی ( سەر ) بەکارهێنانی زۆرە و لە هەریەکێك لەم وشانەی سەرەوەدا بەواتای ڕاستەقینەی خۆی بەکارنەهاتووە، بەوێنە کە دەڵێین : -

لەشاخ سەرکەوتم. ( سەر ) ئاوەڵکارە، بە واتای ڕاستەقینە بەکارهاتووە.

بەڵام کەدەڵێین : - لە ئەزموون سەرکەوتم ( سەر ) وەکو پێشگر خۆی دەنوێنێ - واتای مەجازییە.

هەروەها کە دەڵێین : - سەری مەنجەڵەکە دەگری،مۆرفینی (سەر ) بەواتای ڕاستەقینە بەکار هاتووە.

جیاوازە لەگەڵ:- کێشەکە سەردەگری[2] ، مۆرفیمی (سەر) بەواتای خۆی بەکارنەهاتووە.

---

(١) هەژار موکریانی، هەنبانە بۆرینە،ل ٧٢.

(٢) محەمەد مەعروف فەتاح، زمانەوانی،ل١١٣.

### ٦- مۆرفیمی ( ژێر ) :

لەگەڵ هەندێ وشەدا، کە زاراوەیەکی نوێی دروست کردووە وەکو پێشگر دەردەکەوێت : -

ژێرکەوتن، ژێردەست، ژێرچەپۆك، ژێرخان

بەوێنە : - ( ژێرکەوتن ) لەشەڕدا جیاوازە لە ژێرکەوتنی خانوو.

### ٧- مۆرفیمی ( بن ) :

لەم وشانەدا وەکو پێشگر دەرکەوتووە : - بنبڕ، بنەتۆ، بنەکێش.....

مۆرفیمی ( بن ) لەوشەی ( بنەمۆم ) دا مەبەست ( بنی مۆم ) نییە، بەڵکو مەبەست مرۆڤی کورتە.

لەبواری زاراوە سازیدا دەتواندرێت زاراوەی نوێی لێ سازبکرێت، بەوێنە : - زاراوەی (بنەبڕکردن ) بۆ إستئصال ( extermination ) بەکاربێت.

(( بنەبڕکردنی نەخۆشی، نەخوێندەواری هەژاری ))[1]

### ٨- مۆرفیمی ( دوا ) :

وەکو پێشگر دەردەکەوێت لە وشەکانی : - دوارۆژ، دواکەوتن، دواکەوتوو.

### ٩- مۆرفیمی ( پێش ) :

١- لەگەڵ ( ناو ) دا بەکاردێت وەك ئاوەڵکار : -

پێش نوێژ، پێشکار، پێشمەرگە

٢- لەگەڵ ڕەگی کار بەکاردەهێندرێت، وەك : - پێش بەست.

٣- لەهەندێ وشەدا وەکو پێشگر ڕۆڵ دەبینێ و وشەی داڕێژراو دروست دەکات، وەك:-

(پێشکەوتن، پێشخستن، پێشگرتن، پێشبین، پێشڕەو )[2]

### ٩- مۆرفیمی ( پاش ) : -

١- لەگەڵ ڕەکی کار دەردەکەوێت : - پاشگر، پاشەکەوت

٢- وەکو پێشگر لە چەند بەکارهێنانێکدا دەردەکەوێت : -

---

(١) مەسعود محەمەد، زاراوە سازی پێوانە، ل٦٨.

(٢) سەرچاوەی پێشوو، ٦٥.

پاشکەوتن، پاشەڕێ، پاشگەز، پاشبینی، پاشخستن ((پاشەکشە، پاشکەوتوو))[1].

## ١١– مۆرفیمی ( پشت ) : –

لەگەڵ هەندێ کاردا وەکو پێشگر دەردەکەوێت و زیاتر لە واتایەك دەبەخشێت، وەك : –

پشت گرتن : ١– گرتنی ( پشت ) وەکو ئەندامێکی لەش.

٢– لایەنگرتنی کەسێك.

پشت شکان : ١– شکانی پشت وەکو ئەندامێکی لەش.

٢– مردنی کەسێك یان خزمێکی نزیك کە لە پشتەوە بێت.

لەگەڵ ئاوەڵناو دەردەکەوێت : – پشت ئەستوور، پشت قایم، پشت کوڕ....

## ١٢– مۆرفیمی ( ناو )[*] :

ناوبەند، ناوڕێژە.

## ١٣–مۆرفیمی ( بەست ) :

وەکو پاشگر لەگەڵ هەندێ وشەدا دەردەکەوێت ئەم واتایانە دەدات : –

١– پەیمان و پەیامداری و، بەتەنگەوە بوون بۆ کاری کەسێ یان شتێ نیشان دەدات:–

دەر + بەست ← دەربەست

گرێ + بەست ← گرێبەست

٢– بێ ئیلتیزامی و نەبەستراوە بەهیچ شتێ، هیچ کەسێ : –

سەربەست. ( سەری نەبەستراوە ( ئازادە ) )

٣– لەگەڵ هەندێ وشەی دیکەدا، وشەی لێکدراو دروست دەکات : –

(( بەند + و + بەست ← بەندوبەست ))[2]

---

(١) گیو موکریانی، فەرهەنگی مەهاباد، ١١٤ – ١١٥.

(*) مەبەست لە مۆرفینی (ناو) بەواتای (الأسم = name، noun) نییە ، بەڵکو مەبەست لە مۆرفینی (ناو) بەواتای (ضمن ، داخل ) دێت.

(٢) عەبدولرەحمانی زەبیحی، قاموسی زمانی کوردی،ل ٤٥٨.

## بەشی دووەم

### سەرچاوەکانی دیکەی دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی زمان

### یەکەم : - ڕێبازی وەرگرتن

زمان کە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە، هۆیەکە بۆ دەربڕینی هەستو نەستو کارو بارو پێویستییەکانی ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤ، بە تێپەڕ بوونی کاتو لەگەڵ گۆڕانکارییە خێراکانی هزرو تەکنۆلۆژیادا، گۆڕانی بەسەردادێت و بەردەوام پێویستی بە تازە کردنەوەو داهێنانی زاراوەی نوێ دەبێت.

(( هەرکەسێك زمانی کوردی بزانێ، بێ ئەوەی ئەرکێکی ئەوتۆ بکێشێ، دەتوانێ چەندین وشەی نوێی وەها ناوبێنێ، کە لەم سەردەمەی ئێمەدا پەیدابوون. لەم قۆناغەدا، کە ژیانی ڕووناکبیری و زانستی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی... ی میللەتی کوردی لە برەوەدایەو تێکڕای جیهان لە پێشکەوتندایە، بێ گومان زمان پێویستی بە وشەی نوێ دەبێ و ڕۆژ بە ڕۆژ وشەی نوێ پەیدا دەبێ))[1].

بۆیە هیچ زمانێك بێ کێشە نییەو لە دەست کەم و کوڕی ڕزگاری نابێت، لەبەر ئەوەی یەکچینی و هاوڕێژەیی لە نێوان چەمکە زانستییەکان و ئەو زاراوانەدا نییە کە دەریان دەبڕن.

ژمارەی وشە لە هەموو زمانێکدا سنووردارە، لەبەرانبەردا ژمارەیەکی بێ سنوور لە واتا لە ئارادایەو هەمیشەش لە زۆر بوون دایە، بە وێنە : -

(( لە بواری ئەندازەی کارەباییدا، پتر لە چوار ملیۆن چەمك هەیە، کەچی گەورە ترین فەرهەنگی هەر زمانێك لە شەش سەد هەزار دەروو تێپەڕ ناکات))[2].

لەبەر ئەوە زمانەکان پەنا دەبەنەبەر وەرگرتنی زاراوە لە زمانەکانی دیکەوە و بەو هۆیەوە پێویستییەکانی فەرهەنگی زمانەکەیان دەستەبەر دەکەن.

ڕێبازی وەرگرتن بۆ دانان و سازکردنی زاراوە لە هەموو زمانێکی پێشکەوتوودا کارێکی ڕەوایەو زۆربەی زاناکان لەسەری کۆکن.

---

(١) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، زمانی کوردی و خەوشی هەندێ وشە و زاراوەی کوردی،ل ٤.

(٢) د. علي القاسمي، مقدمة في علم المصطلح،ل ١٠.

هیچ زاناو زمانەوانێك نكۆڵی لەوەدا ناكەن، كە ئەم كارە لە چاخەكانی كۆن و نوێدا ڕووی داوە.

دەتوانین وەرگرتنی زاراوە، لەچەند شێوەو كارتێكردنێكدا دیاری بكەین:-

١- لاسایی كردنەوە :-

یەكێك لە هۆیەكانی وەرگرتنی زاراوە لە زمانانی دیكە، هەبوونی ئەو ئارەزووەیە لە مرۆڤدا كە بەلاسایی كردنەوە ناودەبرێت، هەروەكو چۆن منداڵ لاسایی دایك و باوكی دەكاتەوە، بەهەمان شێوەش تاكە گەورەكان حەز بە وەرگرتن و لاسایی كردنەوەی هەندێ لە وشەو زاراوەی زمانەكانی دیكە دەكەن. بەڵام لاسایی كردنەوەی منداڵ بۆ كەسانی دەوروبەری و خواستنی وشە و زاراوەكانیان، لاسایی كردنەوەیەكی هەمەكییە، كەچی خواستنی زاراوە لە لایەن كەسانی گەورەو زمانەوان و زانایان و پێگەیشتوواندا، لاسایی كردنەوەیەكی جۆری و بەشییە، تەنیا هەندێ ڕەگەزی تایبەتی دەگرێتەوە.

بۆیە ئەگەر سەرنج بدەین زمانەكان هەر لە كۆنەوە زاراوە لە یەكدی وەردەگرن، ئێستاش بەهەمان شێوەیە.

وەرگرتنی زاراوە هەروەكو چۆن كارێكە كە تاكەكەس پێی هەڵدەستێ، بە هەمان شێوە دەزگا زانستییەكانیش پێی هەڵدەستن، وەكو كۆڕی زمانەوانی و زانیاری و ڕاگەیاندنەكان و سەرجەم بوارەكانی دیكەی زانیاریش.

وەرگرتنی زاراوە لەلایەن تاكەكەس، سەرەتا وەكو كارێكی تاكی دەست پێدەكات دواتر كۆمەڵ و كەسانی دیكەش لەوانەیە وەریبگرن و بەكاریبهێنن و ببێتە موڵكی هەموو كۆمەڵ، ئەو كاتە دەبێتە ڕەگەزێك لە ڕەگەزەكانی ئەو زمانە كە وەری دەگرێت.

وەرگرتنی زاراوە زۆربەی جار لەبەر پێویستییە، یان دەگەڕێتەوە بۆ ڕادەی سەرسام بوون و كاریگەری بەو زمانەی كە زاراوەی لێ وەردەگیرێت، بەتایبەتی ئەو كەسانەی كە جگە لە زمانی دایك فێری زمانی دیكەش دەبن. بۆیە لەوانەیە گۆڕان لە شێوەی زمانەكەیدا ڕووبدات و زاراوەكانی تێكەڵ بە زمانە ڕەسەنەكەی خۆی بكات.

بۆیە هەندێ جار (( گۆڕانی زمان دەگەڕێتەوە بۆ كاری دوو زمان یان زیاتر لەسەر یەكتری. ئەوانەی فێری زمانێكی بێگانە دەبن دیارە بەر لەمەش زمانی دایكی خۆیان

دەزانن. ئینجا یان زمانی دووەم بەتەواوی فێرنابن یان زمانەکەی خۆیان دەگۆڕێ ))[1].

مرۆڤ زمانەکەی خۆی، بە مۆڵکی خۆی دادەنێ، بۆیە پێشی وایە مافی خۆیەتی ئەگەر ئەو زمانە دەوڵەمەند بکات بە وشەی زمانەکانی دیکە، بۆیە دەبینین مرۆڤ کە بەزمانی خۆی قسە دەکات لە ناو کۆمەڵگای خۆی، پێی ئاساییە، کە وشەی زمانانی دیکە بەکاربهێنێت، بەڵام کاتێك هەر ئەو مرۆڤە بە زمانێکی بێگانە قسە دەکات، بوار ناداتە خۆی کە هەندێ وشەو ڕەگەزی زمانیی، لە زمانەکەی خۆی وەربگرێ و لە زمانی دووەم بەکاریبهێنێ، نەوەك بێتە جێگەی دەرکەوتنی بێ توانایی ئەو لەو زمانەدا.

هەروەها دەتوانرێ سەرنجی ئەوە بدرێ، کە هەندێك لەو نووسەرو ئەدیبانەی کە زمانێکی بیانی بەتەواوی فێربوون، هەندێ جار پێشی دەنووسن، کاتێك بە زمانە ڕەسەنەکەی خۆیان دەدوێن، وشەی ئەو زمانانە بەکاردەهێنن، بەڵام کە بەزمانی بێگانە دەنووسن ئەم ڕێبازە بەکارناهێنن،

( ئەمەش شتێکی ڕوون و ئاشکرایە، کە لەسەرەتای بڵاوبوونەوەی ئیسلامدا، ئەو نووسەرو کتێب دانەرە فارسانەی، کە بەچاکی فێری زمانی عەرەبی ببوون و جگە لە زمانی فارسی، بە زمانی عەرەبیش دەیاننووسی، لەو نوسینانەدا کە بە زمانی فارسی دەیاننوسی، چەندین وشەو زاراوەی عەرەبییان بەکاردەهێنا، بەڵام پێچەوانەکەی وانەبوو )[2].

بەڵام وەرگرتنی بەکۆمەڵ لە زمانی دیکە، کاتێك ئەنجام دەدرێ کە ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە هەست دەکەن کەوا پێویستیان بەم وشانەهەیە، یاخود بەهۆی هەندێك هۆکاری وەك :- ڕووداویی مێژوویی، کۆمەڵایەتیی وەك شەڕو جەنگی بەربڵاوو داگیرکردن و برسێتی و نەخۆشی و کۆچ و بارکردن و باری نائاسایی و نوێکردنەوەی وڵات و داهێنان و دۆزینەوە مەزنەکان و هۆکاری ئەدەبی و ئاینی و چەندین بواری دیکە، ڕوودەدات.

لێرەدا کەسان هەریەکەیان بەتاك بەم کارە هەڵدەستن، بێ ئەوەی، پەیوەندییان بەیەکەوە هەبێ، یان لەسەری ڕێککەوتبن.

---

(١) محەمەد مەعروف فەتاح، زمانەوانی،ل ١٠٤.

(٢) د. ابراهيم أنيس، من أسرار اللغة،ل ١١٨.

پێویسته، ئاماژه بەوه بدەین، که زۆر گرانه دەستنیشانی لێپرسراوی یەکەم بکەین لەوەرگرتنی ئەو وشانەدا، دەگمەنە ئەوە بزانین کە یەکەم جار کێ بووە، ئەو زاراوەیەی لە زمانێکی دیکەوە وەرگرتووە و بەکاریهێناوە.

مرۆڤ کاتێ وشەیەکی بێگانە وەردەگرێ، لە زمانەکەی خۆیدا بەکاریدەهێنێ، لەقسەکردندا یان لە نوسیندا، هەوڵ دەدا تابۆی دەکرێ لەگەڵ زمانە ڕەسەنەکەی خۆیدا بیگونجێنێت، لە ڕووی دەنگ و پێکهاتە زمانەوانییەکانی خۆی. ( چ لەلایەنی دەنگەوە، چ لەلایەنی داڕشتنەوە ). بەم شێوەیە وشە وەرگێراوەکە، بەئاسانتر بڵاو دەبێتەوەو قسەی پێ دەکرێ لەناو ئەو کۆمەڵەی وەریانگرتووە. بەمەش وشەی وەرگێراو لە هەموو زمانەکاندا شێوەی ئاسایی وەردەگرێ لەو زمانەدا، زۆر کەم وایە ئەم وشە وەرگێراوە لەسەر شێوەی ڕەسەنی خۆی بەبێ گۆڕان و دەستکاری بمێنێتەوە.

وشەی وەرگێراو، بەبێ دەستکاری بە زۆری لەسەر زاری ئەو کەسانە دەبیسترێ، کە بروایان بەخۆیان هەیە لەوتنەوەی وشە وەرگێراوەکە بە وێنە:-

زۆرجار مامۆستایانی زمانی ئینگلیزی کاتێ زاراوەی ئینگلیزی لە زمانی کوردیدا بەکاردەهێنن، هەوڵ دەدەن زاراوە ئینگلیزیەکە وەکو خۆی بەبێ گۆڕان گۆبکەن، یان ئەو کەسانەی زمانی عەرەبی باش دەزانن، هەروەها پزیشکەکان بۆ دەرخستنی تایبەتمەندی خۆیان، لەبوارە پزیشکییەکاندا، هەندێ جار زاراوە پزیشکییەکان وەك خۆی بەبێ گۆڕانکاری دەڵێنەوە. وە یان کاتێك کە ئارەزووی هەیە، توانای خۆی دەربخا لە ناو دەوروبەرو ژینگەکەی خۆیدا.

هەندێك جار، دەزگاو کۆڕە زانیارییەکانیش، کاتێ کە ( زاراوەیەکی زانستی ) وەردەگرن، بۆ هێشتنەوەی شێوەی تایبەتمەندییە زانستییەکەی زاراوەکە، هەوڵ دەدەن نەیگۆڕن و وەکو خۆی بەکاریبهێنن.

((دیاردەی وەرگرتن وەنەبێ هەر تایبەت بێ بە زمانێکی دیاریکراو، بەڵکو لە نێوان هەموو زمانەکانی جیهان ڕوودەدات، لە زمانە ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاواییەکان و زمانە دواکەوتوو، پێشکەوتووەکانیش دا هەیە.

لەبەر ئەوەی، لەم سەردەمەی ئێستادا، کە سەردەمی شۆرشی تەکنۆلۆژی و گەیاندن و سەرتاپا گیری زانست و بەجیهانیبوونە، هیچ نەتەوەیەك ناتوانێ بە گۆشەگیری و دوور لە نەتەوەو زمانەکانی دیکەی جیهان ژیان بەسەر ببات و لەناو بازنەیەکی تەسکدا بخولێتەوە.

بۆیە، ئەمڕۆ وەرگرتنی زاراوە لە ولاتە پێشکەوتووەکان، زمانە ئەوروپاییەکانیش کارێکی ئاساییە، بە ئاسانی کەسانی پسپۆڕ دەتوانن وشە وەرگیراوەکان لە وشە ڕەسەنەکانی زمانەکە جیابکەنەوە. فەرهەنگنووسەکان لە فەرهەنگە کانیاندا ئاماژە بە وشە وەرگیراوەکان دەکەن و لە وشە بنچینەییەکانی زمانەکە جیایان دەکەنەوە.

لەبەر ئەوەی زمان هەمیشە لە گۆڕانێکی بەردەوام و بێ وەستان دایە، وەرگرتنیش لە زمانێکی دیاریکراودا بەپێی قۆناغ و سەردەمی ئەو زمانە دەگۆڕێت، بەپێی بواری ڕامیاریی و کۆمەلایەتیی و ئابوریی ئەو زمانە، پێشکەوتنەکانی و چۆنیەتی پەیوەندی لە گەلّ زمانە دراوسێ و جیهانییەکان و چەندێتی و ڕادەی ئەو پەیوەندییە دەگۆڕێت))[1].

بەوێنە:- ئەگەر چاوێك بە ڕۆژنامە و گۆڤارو نامیلکە و کتێبە کوردییەکانی ((سەرەتای سەدەی بیستەم دا))[2] بگێڕین، سەرنج لەو زاراوە عەرەبیانە بدەین، کە وەرگیراون، بە بەراوورد لەگەلّ ڕادەو چۆنیەتی ئەو زاراوانەی کە ئێستا لە زمانی عەرەبی وەردەگیرێن و لەلایەن نوسەران و ڕۆژنامە نووسانەوە بەکاردەهێندرێت، دەبینین، گۆڕانێکی بەرچاو ڕووی داوە ئێستا لە بری زاراوەکانی وەك :- ( بەلاغەت، قەوم، عالەم، علیم، قافیە، مەدرەسە، جامیعە، بەیت، عەصر،..... هتد ). زاراوەی کوردی ڕەسەن بەکاردەهێندرێت، وەك : -

( ڕەوانبێژ، نەتەوە، جیهان، زانست، سەروا، خوێندنگا، زانکۆ، دێر، چاخ.... هتد )

هەروەها وەرگرتنی زاراوە کە لە زمان دابە کارێکی سروشتیی دەندرێت، لە توانای تاکە کەس تەنانەت دەسەلاتیش دانییە، ڕێگە بە هاتنە ناوەوەی زاراوە بۆ زمانی خۆمالّی بگرێت، بە وێنە:-

(( لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا، ئەوروپاییەکان دیاردەی وەرگرتنی زاراوەیان بۆ سەر زمانی خۆمالّی بە نیشانەی کەم و کوری و دواکەوتنی زمان دانەدەنا، بەلّکو پێیان وابوو، ئەمە کارێکی ڕۆشنبیری و ئالوگۆڕی زانیارییە.

---

(١) د. ابراهيم أنيس، من أسرار اللغة،ل١١٨-١١٩.

(٢) د. کامل حەسەن بەسیر، زاراوەی کوردی،ل ٤٨.

کاتێ کە هەندێ نەتەوەی ناوچەیی لە ئەورووپا سەری هەڵدا، دیاردەی دەمار گیری لەلایەن خەڵکەکە هاتەکایەوە، هەندێ لە پێشەواو سەرکردەکانیان، توانای خۆیان بەکارهێنا، بۆ ئەوەی زمانەکەیان، لە هەموو وشەیەکی بێگانە پاك بکەنەوە.

(( هیتلەر )) لە ئەڵمانیا، هەندێك لە سەرکردەکانی ڕوسیای سۆڤیەتی و ((مستەفا کەمال)) لە تورکیا، ئەو کارەیان کرد، بەڵام ئەنجامی کارەکانیان بێ هوودە دەرچوو.

ئێستا کەس ناتوانێ، بڵێ ئەو زمانە پاکە بێگەردە هەیە، کە خاڵی یە لە هەموو وشەو ڕەگەزو خەوشێکی زمانانی دیکە، ئەمە ئەگەر تەنیا لەو زمانە سەرەتاییە دوورە پەرێزانە بەدی بکرێت کە لەو پەڕی گۆی زەمیندا دەژین ))[1].

زمانەکان لەم سەردەمەی ئێستادا، جیاوازییان هەیە، لە ڕادەی چەندێتی ئامادەییان بۆ وەرگرتنی زاراوە. هەندێك زمان هەیە، کە قسە پێکەرانی حەز بە وەرگرتنی زاراوە ناکەن. ئەمە بە نەنگی و نیشانەی دواکەوتنی زمان دادەنێت، بەتایبەتی ئەو گەلانەی کە تاوەکو ئێستا قەوارەیەکی سیاسی یەکگرتوویان نییە و زمانەکەیان تاکە چەکی پاراستن و بەرگریکردن لە مافی خۆیانە.

(( کەچی هەندێ زمانی دیکە، ئاسایی ئەم وشانە وەردەگرن و دەیخەنە سەر زمانی خۆیان هەروەکو زمانی ئینگلیزی، کە وەك توێژەرەکان دەڵێن نیوەی وشەکانی لە بێگانەوە وەرگیراوە))[2].

هەروەها زمانی سویدیش زۆربەی وشەکانی بیانییە، زمانی تورکی و فارسیش بەشێکی زۆری زاراوەکانیان لە زمانی عەرەبییەوە وەرگرتووە.

زاراوەبەدوو شێوە وەردەگیرێت : —

١— ئەوانەی کە لەبەر پێویستی زمانی خۆماڵی بە بەکارهێنانی ئەو زاراوانە وەردەگیرێن، (( وەك ئەوەی کە ژینگەیەك لە ژینگەکان جۆرێکی تایبەتی لە ڕووەکێك وەك: دار — یان گوڵ... هتد یان ئاژەڵێکی تایبەت بەو ناوچەیە، یان بابەتێکی جیای خواردن و خواردنەوەی تێدابێت کە لە شوێنی دیکە دەست نەکەوێت، یاخود بیرو باوەڕێکی تایبەت بە خۆی، یان داهێنانێکی مەزنی زانیاری تێدابدۆزرێتەوە، جا کاتێك زمانی

---

(١) د. ابراهيم أنيس، من أسرار اللغة،ل ١١٩ — ١٢٠.

(٢) د. ابراهيم أنيس، من أسرار اللغة،ل ١٢٠.

دووەم هەمان پێویستی بۆ بێتە پێشەوە و ئەو شتانە وەربگرێت، ناوەکان وەکو خۆی بەکاردەهێنێت، کە لە شوێنە ڕەسەنکەی خۆیدا هەیە، وەك:-

( ١- زاراوەی ( Wine ) کە هەموو زمانە ئەورووپایی یەکان لە زمانی لاتینی وەریان گرتووە.

٢- ( Tea ) ئەم زاراوەیە لە زمانی ( چینی ) یەوە وەرگیراوە، کاتێ کە چاخواردنەوە لە ئەورووپا دا پەیدابووە.

٣- وشەی ( Chocolate ) لە زمانی مەکسیکی وەرگیراوە، چونکە چاندنی ( کاکاو ) لەم وڵاتەدا باوەو هەر لەمەش ( شوکەلاتە ) دروست دەکرێت.

٤- لەزمانی فارسی وشەی ( یاسمین ) Jasmine وەرگیراوە.

٥- لە زمانەکانی ناوەڕاستی ئەفەریقیا، وشەی ( شیمپانزی ).

ئەم زاراوانە وەکو جیهانیی‌یان لێ هاتووە، هیچ نەتەوەیەك لای گران نییە، کە وەریان بگرێت و بەکاریان بهێنێت ))[1].

یەکێکی دیکە لەو هۆکارانەی کە بۆ وەرگرتنی زاراوە بە پێویست دادەندرێت، ئەوەیە کە زۆر جار نەتەوەیەك کە ئاستێکی زانیاری و ڕۆشنبیری نزمی هەیە، زاراوە لە زمانی نەتەوەیەکی خاوەن ئاستێکی بەرزتر لەم بوارانەدا وەردەگرێت، ئەمەش لە زمانی سەردەمە کۆنەکان و ئێستاشدا بەرچاو دەکەوێت.

٢- بەڵام ئەو وەرگرتنەی کە هیچ پاساوێك بۆ پێویستییەکەی لە زماندا نادۆزرێتەوە، هەندێ جار بەهۆی مەیلی خۆدەرخستن و دەرکەوتن، دێتە ناو زمانی خۆماڵی، یاخود لە ئەنجامی پلەیەکی زۆری کاریگەر بوونی نەتەوەیەك بە نەتەوەیەکی دیکە، حەزکردن بە لاسایی کردنەوەی زۆربەی دیاردەو بوارە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو نەتەوەیە کە یەکێکیان زمانە، نموونەش بۆ ئەمە لە زمانە کۆن و نوێیەکانیش زۆرە. هەندێ لەو زاراوە وەرگیراوانەی کە بەبێ هۆکاری پێویستی دێنە ناو زمانەوەو بە ڕانبەر بە هەمان واتا وشەی زمانە ڕەسەنەکە هەیە، تێبینی دەکەین کە وشە خوازراوەکە شانبەشانی وشە خۆماڵییەکە دەڕوات، تا لە ئاکامدا یەکێکیان شوێنی ئەوی دیکەیان دەگرێتەوە.

---

(١) سەرچاوەی پێشوو،ل ١٢٠ - ١٢١.

وە هەندێ جار تێبینی ئەوە دەکرێ، کە وشە وەرگیراوەکە و وشە خۆماڵیەکە هەردووکیان وەکو یەك لە زماندا بەکاردەهێندرێن، بەڵام بە ڕادەو پلەی جیاواز.

زۆربەی جار خاوەن کارگە و دەزگا بازرگانییەکان، زاراوەی زمانانی دیکە لەگەڵ وەرگرتنی کاڵاو سەوداکانیان دەهێننە ناو زمانەوە، بۆ ناو بانگ و پێداهەڵگوتنی کەل و پەلەکانیان بەو زمانانە، بەو بەڵگەیەی کە مرۆڤ ئاسایی حەز بە شت و ناوی دەگمەن و کەم وێنە دەکات.

هەندێك جار وەرگرتنی زاراوە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ڕوودەدات، لە زمانی یەکەمەوە بۆ دووەم لە دووەمیشەوە بۆ سێیەم.

وەرگرتن : – زۆر واتا لە خۆی دەگرێت، بەڵام لە بواری زاراوەسازیدا ((گواستنەوەی بێژەیەکی بیانییە بۆ زمانی خۆماڵی ( دووەم ) ))[1].

وشەی وەرگیراو، بریتییە لەو (( وشەیەی کە زمانێك لە زمانێکی دیکەوە وەری دەگرێت هەروەها پێشی دەووترێ خواستراو ))[2].

جا ئەگەر هاتوو ئەم بێژەیە گۆڕانی بەسەر دا نەهات پێی دەووترێت ( هاوردە )، وەك : ئیمەیڵ، ئینتەرنێت، قەدەر، وەهم، کۆمپیوتەر، هایدرۆجین.... هتد

بەڵام ئەگەر بەپێی سازگەی زمانی دووەم بگۆڕێت و بکەوێتە ژێر دەستووری ڕێزمان و فۆنەتیکی ئەو زمانە پێی دەووترێت ( کوردێنراو ) یان ( گونجێنراو )، وەك زاراوەکانی :
– سەروەت، سات، کەوسەر، فەلسەفە.... هتد.

---

(١) محەمەد وەسمان، گیروگرفتەکانی زاراوەدانان لە زمانی کوردیدا،ل ٦١.

(٢) د. محمد علي الخولي، معجم علم اللغة النظري،ل ٣٤.

# وەرگرتن لە زمانی کوردیدا

زمانی کوردی، وەکو هەموو زمانەکانی دیکە، زاراوە وەردەگرێت و لە زمانەکەیدا بەکاریدەهێنێت. ئەمەش لە یاسای کاریگەری زمانەکانی دیکەی جیهان بەدەر نییە.

(( لەسەر ڕووی زەمیندا هیچ زمانێك نییە کە زمانی بێگانە کاری لێ نەکردبێ. یاخود تەئسیری زمانی بێگانەی لەسەر نەبێ. هەروەها هیچ میللەتێك یاخود هەلگری هیچ زمانێك بەڕەهایی و بە شێوەیەکی تایبەتی و جیاوازو دوور لە میللەتان ناژی ))[1].

هاتنە ناوەوەی زاراوە بۆ فەرهەنگی زمانی کوردی ئەگەر سەرئەنجامی پێویستی بێ، هیچ زیانێك بە زمانەکە ناگەیەنێت، زمانێکی سەربەخۆ بەو مانایە کە هیچ وشەی هەندەرانی تێدا نەبێ دەست ناکەوێ، (( هیچ گەلێکیش بە تێکەڵاوی چەند وشەی بێگانە لە زمانەکەیدا توشی هیچ زیانێك نابێ و توشیش نەبووە ))[2].

بۆیە لەکاتی نەبوونی زاراوە بۆ هەموو بەشەکانی زانست، نەبوونی زاراوە بەرانبەر بە هەرواتاو دیاردەیەکی زمان، ئەگەر نەمان توانی زاراوەی ڕەسەنی کوردی بدۆزینەوە، بۆ ئەم مەبەستە دەکرێ سوود لە وەرگرتنی زاراوە لە زمانی دیکە ببینین، لەم ڕوانگەیەوە زمانەکانی دیکەش هەمان شتیان کردووە، بەوێنە:-

زمانی عەرەبی کە نزیکەی (( ١٤٢٠ )) ساڵ دەبێ لە هەموو لایەکەوە ڕاژە دەکرێ، تەنانەت گەلێك لە زانایانی کوردیش هەموو ژیانی خۆیان بۆ تەرخان کردووە. کەچی هێشتا بە هەزاران وشەی لە زمانەکانی دیکەی جیهان وەرگرتووە. لەو بارەیەوە د. ((جەمال نەبەز))،

دەڵێ:- (( بۆتەیەکە بۆ تواندنەوەی هەزاران وشەی عیبری و ئارامی ی کۆن و ئێرانی و یۆنانی و هیندی و.... هتد. زمانی فارسیش لەم ڕووەوە لە عەرەبی (( خاوێنتر)) نی یە)) [3].

---

(١) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، بارێزی لێکۆڵینەوەی زانستی بگرین،ل ١٠٢.

(٢) هەژار موکریانی، کوردو سەربەخۆیی زمان، گۆڤاری کۆڕی زانیاری،ب٢، بەشی یەکەم،ل ٢٨٥.

(٣) د. جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی،ل ٧٦.

(( لە ڕۆژهەلاتی نزیك تورك و فارس و ئەفغان و هیند و پاکستان بەسەدان و هەزاران وشەی عەرەبی ڕەسەنیان خواستووەو لە فەرهەنگی زمانەکەیان بەکاریاندەهێنن و بەهی خۆیانیان دەزانن.

پسپۆڕانی زمانی فارسی لە ئێران چاکەی سەعدی و حافزی شیرازی بەسەر ئێرانەوە بەوە باس دەکەن کە زۆر وشەی عەرەبییان هێناوەتە ناو شیعری فارسی وا یان گۆڕانکاری تێداکردووە بەو کارەیان زمانی فارسییان دەوڵەمەند کردووە ))[1].

هەروەها زمانە ڕۆژئاوایی و ئەورووپاییەکان و زمانانی دیکەش هەمان شتن بەوێنە : - لە فەرهەنگی ئینگلیزی و ڕوسی و ئەڵمانی وشەی وەرگیراو بەرچاو دەکەوێت.

لە لاپەڕە ( ٣ ) ی (( فەرهەنگی زمانی ڕووسی )) دا، ( ٣٦ ) وشە تۆمارکراون، کە (٣٣) یان بێگانەن.

کەواتە، هیچ زمانێکی نەتەوەیی نییە، سودی لە زمانە جیاوازەکانی دیکەی گەلانی جیهان وەرنەگرتبێ. وەرگرتنی زاراوە زۆر هۆکاری هەیە، وەکو ئەوەی لەلایەن نەتەوەی باڵا دەستدا بسەپێندرێت، یان زمانی وڵاتانی پێشکەوتوو لە بواری زانست و تەکنۆلۆژیا و داهێنان، زاراوەگەلێك دەسەپێنێتە سەر زمانی نەتەوەکانی دیکە بەهۆی ئەم پێشکەوتن و داهێنانەیان، بەڵام ئەمڕۆ بەهۆی زیاد بوونی پەیوەندی نێوان گەلان و هۆکارەکانی ڕاگەیاندن و ئاسان بوونی هاتوو چۆ، وەرگرتن لە نێوان گەلە هاوشێوەکانیش لە بواری پێشکەوتنی زانیاری و ئاستە ڕامیارییەکان، ڕوودەدات.

لەگەڵ خستنە ڕووی ئەو ڕاستیانە، دەبێ سەرنج بۆ خاڵێکی گرنگ ڕابکێشین، ئەویش ئەوەیە کە وەرگرتنی زاراوە لە زمانانی دیکەو هێنانیان بۆ ناو فەرهەنگی زمانی کوردی کارێکی بێ سنوورو بێ دەستوور نییە، بەڵکو بەپێی چەند بنەمایەکی واتایی و زاراوەسازیی جێ بەجێ دەکرێت، وەك : -

١- بۆ ئەوەی زاراوەی وەرگیراو بچێتە ناو زمانە نوێیەکەوە، وەك وشەی خۆماڵی هەڵس و کەوت بکات، دەبێ لەگەڵ دەستوری زمانە نوێیەکەدا بگونجێندرێت، بەواتایەکی

---

(١) هەژار موکریانی، کوردو سەربەخۆیی زمان،ل ٢٨٧.

دیکە دەبێت ((وشەکە بچێتە ناو یەکێك لەو پۆلە ڕێزمانیانەی کە زمانە نوێیەکە جیایان دەکاتەوە ))[1].

٢- ( هەموو زمانێك دەستووری زاراوەسازیی و زمانەوانیی تایبەتی خۆی هەیە، بۆیە کاتێك زاراوەیەك وەردەگرین دەبێ دەنگەکانی بخەینە ژێر کارتێکردنی فۆنەتیکی زمانی کوردییەوە و بەرگێکی خۆماڵی بەبەریاندا بکەین.

زمانی کوردی زۆر سودی لەم دەستورە وەرگرتوەو چەندین وشە دەبینین کە بەم ڕێبازە لەگەڵ زمانی کوردیدا سازێندراون، بوونەتە خۆماڵی، وەك : -

(( وشەی ( تەواو )، ( دەوڵەت )، ( وڵات ) کە لە عەرەبییەوە هاتوون.

وشەی ( خەبات )، ( خشڵ )، ( لەواشە )، ( ناتر ) لە سریانییەوە هاتوون.

وشەی ( خاکەناز )، ( مەگریت )، ( تیرمیخ ) لە ئەرمەنییەوە هاتوون.

وشەی ( سنور )، ( تەلیسم )، ( سەمتور ) لە یۆنانیەوە هاتوون.

وشەی ( پاپۆڕ )، ( وەردیان ) لە فەرەنسییەوە هاتوون.

وشەی ( پانتۆڵ )، ( نمرە ) لە ئیتاڵیەوە هاتوون ))[2].

٣- وشەی وەرگیراو بە ڕێنوسی زمانی کوردی بنووسرێت.

٤- ئەگەر زاراوەیەك لەناو کۆمەڵێکدا بۆ بیروباوەڕێکی تایبەتی یان داهێنراوێکی سەربەخۆی سازکرابوو، ئەوا دەکرێ زمانی کوردی وەکو خۆی بەبێ ئەوەی دەنگەکانی بگۆڕێت وەری بگرێت و لە زمانەکەیدا بەکاریبهێنێت، بە مەرجێك بە ڕێنوسی زمانەکە خۆی بنوسرێت.  (مەبەست زمانی کوردییە ).

٥- ئەگەر وشەیەکی خۆماڵی و بێگانە، شانبەشانی یەك لە زمانی کوردیدا هەبوون دەبێ کوردییەکەیان بکەینە زمانی ئەدەبیی بۆ ئەمەش لەهەر دیالێکتێك وەرگیرابێ گرنگ نییە بۆ وێنە : (( (( زیاتر )) و (( پتر ))، (( بەگوێرەی )) و (( بەپێی ))، ((حەمام))و ((گەرماو )).... هتد ))[3] جگە لەم دەستورانە لە وەرگرتنی زاراوەدا، دەبێ چەند بنەمایەکی واتایی و زمانەوانی پەیڕەوبکرێت، وەك : -

---

(١) محەمەد مەعروف فەتاح، زمانەوانی،ل ١٤٠.

(٢) جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی،ل ٧٦.

(٣) جەمال نەبەز ، زمانی یەکگرتووی کوردی ، ل ٧٧.

١- ورد بوونەوە لە واتاو مەبەستی زاراوە وەرگیراوەکە و بەکارهێنانی بۆ هەمان واتاو مەبەست لە زمانی کوردیدا بەبێ دەستکاری کردن.

٢- زاراوەی وەرگیراو (( بەرهەمی درەختی زمانەکە خۆیەتی ))[1] لە بارودۆخێکی کۆمەڵایەتی و ئابوری و دەروونی ئەو نەتەوەیە هەڵقوڵیوە، بۆیە کە وەری دەگرین، تا بۆمان دەکرێ لە زمانە ڕەسەنەکە خۆیەوە بۆی بچین. لەبەر ئەوەی نابێ، ناوی ((ئامێر، زاراوە جۆربەجۆرەکان، ناوی مانگەکان، گوند، شارۆچکە، شارو وڵات )) لە نەتەوە باڵادەستەکانی وەکو ( عەرەب، تورک، فارس ))، وەربگرین، وەك ئەوان گۆیان بکەین و بیاننوسین، بەڵکو پێویستە لە زمانی گەلەکە خۆیانەوە چۆنی دەڵێن و دەنووسن، ئێمەش بەو جۆرە وەریانیگرین و لەگەڵ سازگەی زمانی کوردی ڕێکیان بخەین.

## زاراوەی وەرگیراو لە زمانی کوردیدا دەگەڕێتەوە بۆ : -




### أ- وەرگرتنی زاراوە لە زمانە دراوسێکانەوە

زمان بەپێی دەستوری تایبەتی خۆی گەشە دەکات و پەرە دەسێنێ. لەم ڕەوتی پێشکەوتنەی خۆیدا، کارێکی زۆر ئاساییە، ئەگەر زمانەکانی گەلانی جیهان بە گشتی، زمانە نزیك و دراوسێیەکان، بەتایبەتی کاری لێبکەن و کەڵکیان لێ وەر بگرێت و وشەکانیان تێکەڵ بە یەکدی ببن. چونکە، هیچ زمانێك لە جیهاندا بەدی ناکرێ، لەم یاسایە بەدەربێ.
(( هەر لەو ڕۆژەوە کورد لە ناوچەکەدا پەیدابووە، لەگەڵ چەندین گەل و نەتەوەی وەك: ((فارس، ئاشوریی، کلدانیی، ئەرمەنیی، یۆنانیی، عەرەب، مەغۆل، تورك، ئازەر،بلوچ))

(١) د. کامل حەسەن بەسیر، زاراوەی کوردی،ل ٥٢.

تێکەڵ بووە. لەبەر ئەوە، هەر لە کۆنەوە، هێندێ وشەی ئەو زمانانە، تێکەڵ بە یەکدی بوون. هەروەك چۆن، هێندێ وشەی ئەو زمانانە، لە زمانی کوردییدا، جێگەی خۆیان کردۆتەوە، بەهەمان شێوەش، هێندێ وشەی ڕەسەنی کوردیش، لە فەرهەنگی نەتەوەیی ئەو زمانانەدا جێگیربووە ))[1].

ئاشکرایە کە نابێ هەموو فەرهەنگی زاراوەی زمانەکەمان کوردی ڕەسەن بێ، ناشبێ سڵ لە هەموو وشەیەکی زمانانی دیکەش بکەینەوە، بەتایبەتی لە جیهانی ئەمڕۆدا، هیچ زمانێك لە قالبێکی تەسکی خۆماڵیدا گەشە ناکات. (( جگە لەمە شوێنی کوردستان و مێژووی چەند هەزار ساڵەی گەلی کورد کارێکی وەهایان کردووە ژمارەیەکی زۆر وشەی بێگانە بە تایبەتی ( عەرەبی و فارسی و تارادەیەکیش تورکی ) تێکەڵی زمانەکەمان بن))[2].

-چالاکی کۆمەڵایەتی، ئاخاوتنی مرۆیی و ڕووداوی مێژوویی کە دەبنە هۆی پێشکەوتنی کۆمەڵ دەبنە هۆی ئەوەی کارتێکردنی زمانێك بەسەر زمانێکی دیکەوە دیاربێت، زمانێك لە زمانێکی دیکە شت وەربگرێت، ئەم دیاردەیەش زیاتر لە وشەو موفرەداتی زماندا دەردەکەوێت لەم ڕووەوە ڕێزمان کەمتر خۆی بەدەست گۆڕانکارییەوە دەدات. زاراوەی زمانە دراوسێیەکان بە بەشێکی فەرهەنگی زمانی کوردی دادەندرێن و دەوڵەمەندییان کردووە ( لە نێو زماندا، تێك هەڵەنگوتن و بەربەرەکانێ و ملانێی بۆ مانەوە(تنازع البقا ) و هەوڵ و تەقەلای سەرکەوتن و خۆسەپاندن ڕوودەدات، هەروەك ئەو جۆرەی لە نێوان زیندواندا هەڵدەکەوێ، ئەم ملانێیە زۆر سەبەبی هەیە لەهەموان گرنگتریان دوون یەکیان ئەوەیە خەڵکی بێگانە کە بەزمانێکی جودا لە زمانی خەڵکی وڵات قسەدەکەن بێنە وڵاتەوە، دووەمیان جیرانەتی دوو نەتەوەیە کە زمانیان لێك جیابێ ))[3].

فەرهەنگی زاراوەی زمانی کوردی، کاریگەری زمانە دراوسێیەکانی لەسەرە، فەرهەنگی زمانانی دراوسێی وەکو فارس و تورك و عەرەب کە ناتوانن لە فەرهەنگی میللەتانی تر کاریگەری قبول نەکەن، کەم و زۆر ئەو کاریگەریانە دەگوازنەوە بۆ ناو فەرهەنگی کوردی.

---

(١) حوسێن محەمەد عەزیز، سەلیقەی زمانەوانیی و گرفتەکانی زمانی کوردی،ل ٤٥١.

(٢) ئەنجومەنی کۆڕ، زاراوی کارگێڕی،ب١،بەشی یەکەم،ل ٤٢٠.

(٣) عەبدولرەحمانی زەبیحی، قاموسی زمانی کوردی،ل ٤٦.

بەوجۆرە بۆمان دەردەکەوێت، کە چۆن زمانی کوردی لە ڕووی زمانەوانیی و زاراوە سازییەوە کاریگەری لەسەر زمانە دراوسێیەکان هەیە، بەهەمان شێوە، ئەوانیش کاریگەریان لەسەر زمانی کوردی هەیە.

هەبوونی زاراوەی دراوسێ لە فەرهەنگی زاراوەسازیی کوردیدا، ئەگەر بە پێی پێویستیی زمانەکەمان بێ، دیاردەییەکی خۆڕسکی سروشتییە، نیشانەی دواکەوتوویی گەلەکەمان و بێ پێزی و هەژاری زمانەکەمان نییە، بەڵکو نیشانەی زیندوویەتی زمانەکەمانە.

ئەو زمانە دراوسێیانەی کە زیاتر کاریگەریان لەسەر فەرهەنگی زمانی کوردی هەیە لە ڕووی تێکەڵاو بوون و وەرگرتنی وشەو زاراوەو دەربڕینەوە بریتین لە زمانەکانی : (عەرەبی، فارسی، تورکی )

أ- وشەو زاراوەی عەرەبی : -

پەیوەندی نەتەوەکەمان بە نەتەوەی عەرەب سەرەڕای دێرینی و کۆنی، لەسەر بناغەیەکی ئاینی و ڕامیاری و ئابوریی و ئەدەبی و زانستیی و دراوسێیەتی دامەزراوە.

(( لە زمانی کوردیدا زۆر وشە هەیە کە لەزمانی عەرەبییەوە وەرگیراون. هاتنە ناوەوەی ئەو وشانە بۆ زمانی کوردی دەگەڕێتەوە بۆ پەیدابوونی ئیسلام و دراوسێیەتی و تێکەڵاوی کورد لەگەڵ عەرەبدا ))[1].

- زاراوەی عەرەبی بەپێی چەند بناغەیەك هاتۆتە ناو فەرهەنگی زمانی کوردی:-

١- وەرگرتنی زاراوەی عەرەبی بەبێ دەستکاری : -

بەشێك لەو وشە عەرەبیانە ناوی ئەو شت و دیاردانەن کە لای کورد نەبوون و لەگەڵ هاتنیان بۆ ناو فەرهەنگی زمانی کوردی، ناوەکانیان لەگەڵ خۆیان هێناوە، بۆیە زۆربەیان لەلایەن خەڵکییەوە وەکو خۆیان بەبێ دەستکاری وەرگیراون، وەك : -

( زەکات، حەج، شێخ، عەبا، زیکر، غەفور، کەریم.... هتد ).

٢- وەرگرتنی زاراوەی عەرەبی بە دەستکارییەوە : -

---

(١) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، وشەی زمانی کوردی،ل ٤٢

ئەمەش ئەو وشەو زاراوە عەرەبیانە دەگرێتەوە کە کورد وەریگرتوون و خستووینەتە ژێر باری دەستورسازی زمانی کوردی و خۆماڵی کردوون، یەکێك لەو دەستکاریانەش لە ڕووی دەنگەوەیە. بۆ نموونە ئەگەر لە وشەیەکی عەرەبیدا دەنگێك هەبووبێ کە لەگەڵ یاسای فۆنەتیکی زمانی کوردیدا ڕێکنەکەوتبێ ئەوە گۆڕانێکی بەسەرا هێنراوە.

– ئەم دیاردەیە لە زمانانی دیکەش هەیە، لە زمانی ئینگلیزی پێی دەووترێت (((ترانس لەتەرەیشن) ( Transliteration )))[1] لە زمانی عەرەبی بە (التعریب) ناودەبردرێتو لە زمانی کوردیش دەکرێ بە ( بە کوردی کردنی زاراوە ) ناوی ببەین.

لەم بارەیەوە (( جەمال نەبەز )) دەڵێ : (( هەر وشەیەکی بێگانە هاتە ناو زمانی کوردی، دەبێ بخرێتە ژێر ڕکێفی دەستوری زمانەوانی کوردی یەوەو لە ڕووی مۆرفۆلۆژیو فۆنۆلۆژی و ئۆرتۆگرافی یەوە))[2].

زمانی کوردی، لە مێژە سوودی لەم ڕێگایە وەرگرتووە، ئەو وشە عەرەبیانەی وەرگیراون، کەوتوونەتە ژێر دەستوری دەنگسازی و زمانەوانی کوردیەوەو خۆماڵی کراون، واتە (کوردێنراون )، بە تایبەتی لە ڕووی ئەو دەنگانەی کە لەگەڵ فۆنەتیکی زمانی کوردیدا ناگونجێن. وەك : هەندێ دەنگ کە لە زمانی عەرەبیدا هەیە، لە زمانی کوردی دابەرگوێ دەکەون، بەڵام نەبوون بەفۆنیم بەوێنە (( ث، ذ، ص،ض، ط، ظ ))[3].

---

(١) د. کامل حەسەن بەسیر، زاراوەی کوردی، ل٥٣.

(٢) جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی، ل٧٧.

(٣) دەستەی کورد، ڕێنووسی کوردی بە پێی بڕیارەکانی کۆڕی زانیاری عێراق،ل ٢٧.

لەم بارەیەوە چەند نموونەیەك دەهێنینەوە : –

أ– دەنگی  ث / ت / س

(( دەنگی ( ث )، کە لەسەر زمان ناخۆشە، هەرچەندە ئەم دەنگە لە زمانە ئێرانییە کۆنەکاندا بەتایبەتی لە ( زمانی ئاڤێستا ) دا هەبووە، ئێستاش پاشماوەی لە هەورامیدا ماوە، بەڵام لە زمانی کوردی ئەمڕۆدا نەماوە، یان لەهەندێ وشە دا بووە بە دەنگی (ت) ))[1].

ئەم دەستورە بۆ وشەی عەرەبیش هەروایە، هەندێ جار دەنگی ( ث ) دەگۆڕێ بۆ دەنگی ( ت) و هەندێ جاریش، بۆ دەنگی ( س )، وەك : –

ث / ت

مثل / بووە بە ( مەتەڵ ) – ( مەتەڵۆکە )

ث / س

تمثیل – تەمسیل

أثاث – ئەساس

اثبات – ئیسپات

ثروة – سەروەت

أثر – ئەسەر – ( هەتەر ) ( هەتەریان نەهێشت )

آثار – ئاسار..... هتد.

ب– گۆڕانی دەنگی ( ص ) بۆ دەنگی ( س )

هەرچەندە دەنگی ( ص ) لە هەندێ وشەی کوردی، وەك ( سەوزە، ساڵ، سەد، سەگ.... هتد ) بەرچاو دەکەوێت، بەڵام لە زمانی کوردی ئەمڕۆ دا نەبووە بە ( فۆنیم )، بەڵکو وەك (ئەلۆفۆن) حسابی بۆ دەکرێت. بۆیە زۆربەی ئەو وشە عەەبیانەی کە هاتوونەتە ناو زمانی کوردییەوە، دەنگی ( ص ) یان تێدایە، ئەم دەنگە بۆ دەنگی ( س ) گۆڕاوە، وەك : –

فرصة – فرسەت

خلاص – خەڵاس

---

(١) جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی، ل٦٤.

عصر – عەسر

مقص – مقەست

صابر – سابیر

ج– گۆڕانی دەنگی ( ض )، ( ظ )، ( ذ ) بۆ دەنگی ( ز )

ض، ظ، ذ / ز

قرض – قەرز　　　ارض – ئەرز

((حوض – حەوز　　　امضاء – ئیمزا

ظالم – زاڵم　　　بغض – بوغز

ظاهر – زاهیر　　　ذلیل – زەلیل

ظرف – زەرف　　　ذنب – زەمب

ذخیرة – زەخیرە　　　إذاعة – ئیزاعە ))[1].

هەروەها هەندێ دەنگی دیکە، کە لەهەندێ وشـەی عەرەبیـدا هـەن، هاتوونەتـە نـاو زمـانی کوردی گۆڕانیان بەسەر دا هاتووە، وەکو :–

– گۆڕانی دەنگی ( آ ) بۆ دەنگی ( ح ) یان ( ع )

الآن – ئەلعان، ئەلحان

قورآن – قورعان

الأذیة – عەزیەت.

د – زۆربەی ئەو وشانەی کە لە زمانی کوردیدا دەنگـی ( ع ) یـان تێدایـە، لـە زمـانی عەرەبی وەرگیراون، ئەمەش وادەکات کە زۆر زمانەوان بێنە سەر ئەو باوەڕەی دەنگی ( ع ) لە زمانی کوردیدا نەبێت، وەك :

عەزیەت، عەرش، عەیب، عەشیرەت، عیناد، عیلاقە، عالەم، عاسێ.... هتد.

زۆربەی ئەو وشە عەرەبیانە کـە هاتوونەتـە نـاو زمـانی کـوردی، هەنـدێ گۆڕانکاریـان لەڕووی دارشتن و دەنگسازییەوە تێداکراوە، بە وێنە : –

المعذرة – عوزر

العربة – عەرەبانە

---

(١) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، وشەی زمانی کوردی،ل ٤٣.

العمل – عەمەلە

العلة – عیللەت

..... هتد

– هەندێ وشەی دیکە کە بە دەنگی ( ع ) دەست پێ دەکەن، هاتوونەتە ناو زمانی کوردی، دەنگی ( ع ) بۆتە دەنگی ( ئـ ) وەکو : –

عقیدة – ئەقیدە

عقیق – ئاقیق

عشق – ئەشق

عرق – ئارەق – ئارەقە

عبدالله – ئەبدال

عزیز – ئازیز

.... هتد.

– گۆرانی دەنگی ( أ ) بۆ دەنگی ( ع )، وەکو : –

أنبار – عەمار – عەمبار

– گۆڕانی دەنگی ( أ ) بۆ دەنگی ( ێ ) : –

کتاب – کتێب.

– گۆڕانی دەنگی ( ط ) بۆ دەنگی ( ت )، وەکو : –

طیارة – تەیارە

طماطة – تەماتە

طبر – تەبەر

طباشیر – تەباشیر

طرح – تەرح

طماح – تەماح..... هتد.

( ئەم جۆرە دەستکاری کردنەی وشە کارێکی گرنگ و پێویستە، لەبەرئەوەی وشەی عەرەبی وەردەگیرێ بۆ ئەوەی لەسەر وشەکانی زمانی کوردی کەڵکە بکرێ. بەم

دەستکاری کردنەش هەندێك جار بەجۆرێك جێگیر دەبن و دەچەسپێن، نەك تەنیا تەنگ بە وشەی کوردی هەڵدەچنن، بەڵکو گەلێ جار شوێنیشیان دەگرنەوە.

– هەندێك لەو وشە عەرەبیانەی کە هاتوونەتە ناو زمانی کوردییەوە: بەجۆرێك گۆڕاون و دەستکاری کراون، ئەگەر بەلێکۆڵینەوەی زمانەوانی نەبێت، هەستیان پێ ناکرێت، کە ئەو وشەیە بە ڕەسەن کوردی نییە، وەك :

(( (( المسجد)) – ((مزگەوت))، ((ضبط)) – ((زەوت))، ((حجة)) – ((ئەنجەت، هەنجەت))، ((خدمة)) – ((خزمەت))، ((بحث)) – ((باس))، (( ((متمانە)) – ((مطمئن))، ((تام)) – ((طعم))، ((ئانقەست)) – ((عن قصد))، (( کلۆج)) – ((کل وجە))، ((عەلەتەوار)) – ((على التوالي))، ((مەشخەڵ)) – ((مشعل))، ((سات)) – ((ساعة))…. وە گەلێکی تر)). هەروەها ((شۆم)) – ((شووم))، (( معاملة )) – (( مامەڵە )).

٣– بەشێك لەو وشە عەرەبیانەی هاتوونەتە ناو زمانی کوردی، بۆ هەمان مانا بەرانبەریان وشەی کوردی ڕەسەن هەبووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هاتوونەتە زمانی کوردییەوە، وەك (( فەقیر، ئەرز، فکر، عیلاج، عقل، دەماغ، فەقەرە –….. هتد کە لەزمانی کوردیدا، ( هەژار، زەوی، چارە، هۆش، مێشك، بڕبڕە…. هتد ))[1] هەیە.

٤– (( زۆربەی ئەو وشە عەرەبیانەی کە ناوی مۆرفن، هاتوونەتە ناو زمانی کوردی بەپێی دەنگسازی کوردی گۆدەکرێن و بەپێی ڕێنوسی کوردی دەنووسرێن.

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| عثمان | عوسمان |
| آمینة | ئامینە |
| خدیجة | خەجێ ))[2] |
| عبدالرحمن | ئاورەحمان |
| ظاهر | زاهیر |
| فاطمة | فاتیمە….. هتد. |

(١) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، وشەی زمانی کوردی، ل٤٦.

(٢) دەستەی کورد، ڕێنوسی کوردی بەپێی بڕیارەکانی کۆڕی زانیاری عێراق،ل ٢٩.

٥- موتوربه كردن : -

( واته دروستكردني زاراوەی كوردی به وشەیەكی كوردی و وشەیەكی عەرەبی، وەك:-

(( ( الاتمام، التركيب الاضافي، الشخصية المعنوية ) كه به ( تەواوكردن و لێكدانی ئیزافی و كەسیەتی مانایی ) وەرگیراون و كراون به زاراوەی كوردی ))[1].

- زۆربەی ئەو وشه عەرەبییانەی هاتوونەته ناو زمانی كوردی، بەیاریدەی پێشگرو پاشگر یان وشەی سادەی دیكه، لێكدراون، زاراوەی نوێیان لێ دارێژراوه و بەرگێكی خۆماڵییان بەبەردا كراوه، وەك : - آخر - ئاخر

ئاخرەمین ( ئاخرەمین جار )، ئاخر زمان، ئاخری پیری، ئاخر شەڕ..... هتد

ایمان - ئیمان

ئیماندار، ئیمانبەر، ئیمان هێنان، ئیمان بردن،..... هتد.

عمل + ه ⟵ عەمەله

اصل - ئەسڵ ( ئەسڵ زاده )

لذة - لەزەت

به + لەزەت ⟵ بەلەزەت

عیلم + ( - اندن ) ⟵ عیلماندن

حاجی / حاجی + له ⟵ حاجیله

( حاجی ڕەش ) - ( پەڕه سێلکه )، ( حاجی لەق لەق ).

- هەندێ وشەی عەرەبی كۆكراوەكەشیان هاتۆته ناو زمانی كوردی، وەك : -

خیر - خیرات / خێرات

خێرات + ( - خانه ) ⟵ خێراتخانه

---

(٢) د. كامل حەسەن بەسیر، زاراوەی كوردی،ل ١٣٤.

## ب- وشەی فارسی

لەنێوان ئەو وشە دراوسێیانەی کە کەوتوونەتە زمانی کوردییەوە، بەشێکیان فارسین – کە لەگەڵ زمانی کوردیدا لەیەك خێزانی زمانن. هۆی پەیدابوون و پتەو بوونی ئەو وشانەش لە زمانی کوردیدا، ئەو مێژووە دوورو درێژەیە کە ئەم دوو میللەتە لە تێکەڵاویدا هەیان بووە، بەوێنە وشەی ((سروشت )، ( نمایش)، ( وەرزش )، ( نایاب )، ( ئەندێشە)، ( باڵوێز ))) [1].

– لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین.

کە لە زمانناسیدا ئەوە یەکلاکراوەتەوە، زمانی کوردیی ئەمڕۆ، بەیەکێ لە زمانەکانی هیندۆ ئەورووپایی دادەندرێ. لە هەمان کاتیشدا، لەبنەماڵەی زمانەکانی هیندۆ ئێرانیی و لە خێزانە زمانی ((ئێرانیی )) جیاناکرێتەوە. لەگەڵ زمانی (( فارسیی )) شدا، خزمایەتییەکی نزیکی هەیە.

بەو جۆرە، هەردوو زمانی کوردیی و فارسیی، لەبنەڕەتدا لەیەك سەرچاوەوە هەڵقوڵاون و لەیەك گرووپە زمانن، لەبەر ئەوە، گەلێ وشە لەهەردوو زمانەکەدا هەن، لەڕووی ڕوخسارو واتاوە، وەك یەك وان و یەك شت دەگەیەنن. بۆیە، بەتەواوی ناتوانین، بڵێین ئەو وشانە سەدی سەد کوردین یان فارسین، لەبەر ئەوەی ئاسایی یە ئەگەر وشەی هاوبەش لەنێوان ئەو زمانانەدا هەبێ کە دەچنەوە سەر یەك گرووپەزمان و ڕەچەڵەکێکی هاوبەشیان هەیە. (لێکۆڵینەوەی ئەمەش پێویستی بە چوونەوە ناو مێژووی زمان و بنەڕەتی وشەکانەوە هەیە ).

بۆیە ئێمە ناتوانین بڕیار لەسەر ئەوە بدەین کە ئەو وشانەی ئەمڕۆ لە نێوان زمانی کوردی و فارسیدا هاوبەشن، وەك : – (( ئەنجام، ئاشنا، ئامانج، ئارەزوو، ئازاد، ئاین، ئاخ، بەد، بەخت، بێگانە، بادەم، ئاهەنگ، بەهەشت، بەند، بەهرە، بەستە، بەختیار، تەندروست، باران، بار، تەخت، تەنگانە، پار، پارچە، ڕاست، ڕاستە، ساڵ، سەنگ، سوپا، سرود، شاگرد، شەرم، شەش (شیش )، شاباش، فەرمان، کەم، کەمین، فەرمودە، کەندو، کاروان، کارمەند، کارخانە، سەرکار، سەرین، سەربەست، شەکر، شل، شیرین، ڕەنج، ڕسوا، دارا،

---

(١) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، وشەی زمانی کوردی، ل٤١.

درەخشان، رەنگین، پەیمان، پلێنگ، ترومپا، پیشە، پیشەوەر، پیشەوا.... هتد ))[1].
فارسین یان کوردین.

(( گەلێ جاریش وێکچوون دەبینرێ، کە ڕاست نی یە بەوە دابنرێ، گوایا زمانێك لە زمانێکیدی ئەوەی وەرگرتبێ، بەڵکو راستی ئەوەیە، سروشتی پێوەندیی بەردەوامی نێو زمانانی خێزانێك ئەمەی سازکردووە. گرووپی زمانانی هاوڕەگەز، بەو کۆمەڵە زمانەدەوترێ، کە لە نێوانیاندا وێکچوونی سروشتی لەپێکهاتنی دەنگ و واتای ڕەگی وشەو گیرەك (ناخنکێن)دا دەردەکەوێ))[2].

## ج - وشەی تورکی لە زمانی کوردیدا : -

هەروەك چۆن لە ئەنجامی تێکەڵاویی و دراوسێیەتی کورد لەگەڵ فارس و عەرەب، ژمارەیەك وشەی فارسی و عەرەبی کەوتوونەتە زمانی کوردییەوە، هەر لەو ڕێگەیەشەوە گەلێك وشەی تورکی هاتوونەتە زمانی کوردییەوە، وەك : (( قەرەبالغ ))،(( قاتر))، ((چوخە))، (( یاپراخ ))،((دۆڵمە )).... هتد ))[3].

هۆیەکەی ئەمەیە :

جگە لە هاوسێیەتی کورد و تورك.تورکەکان بۆ ماوەی چەندین سەدە بەناوی ئیسلامەتییەوە دەوڵەتی عوسمانییان دامەزراندووە و کوردستانیش بۆماوەیەکی زۆر لەژێر حکومڕانی ئەواندا بووە، بۆیە وشەی تورکی زۆر لە زمانی کوردییدا دەبینرێت وەك: قەرەداغ، قوشتەپە، قەرەناو،قەرەهەنجیر...

## زاراوەی جیهانی

گرنگترین ئەو گۆڕانکارییانەی لە دەیەکانی دوایی سەدەی بیستەمدا بەسەر ژیانی مرۆڤدا هات، بڵاو بوونەوەی ژمارەیەکی زۆری ئەو وشەو زاراوانە بوو کە مۆرکێکی ئەکادیمیان هەیە و لەنێو نێوەندە رۆشنبیرییە ناپسپۆڕەکانی لقەکانی مەعریفە دا بڵاو بۆوە، بگرە زاراوەکان چوونە ناو زمانە بنەڕەتییەکانی گفتوگۆکردنی رۆژانەی کۆمەڵێکی

---

(١) تایەر سادق، ڕێنوس، چۆنیەتی نوسینی کوردی،ل ١١٢ — ١١٦.

(٢) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی — وشەسازی،ل ٢١.

(٣) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، وشەی زمانی کوردی،ل ٤٤.

فراوانی خەڵکییەوە، ئەوانەی کە هیچ شارەزاییان لە دەلالەت و ڕەهەندە ڕاستەقینەییەکانی ئەم زاراوانە نییە، وەك: –

کۆمپیوتەر، سەتەلایت، ئینتەرنێت، مایکرۆسۆفت، ڕادیۆ، ئەتلەس، داتا، دینەمۆ، ئۆزۆن، یۆرانیۆم، ئۆتۆماتیك، دیموکراسی، ئۆتۆکراسی، ئۆکسجین، هایدروجین، نایترۆجین، سینەما، دینامێت، سایکۆلۆژی،، پراگماتیزم، میتا فیزیك، دیپلۆماسی، فەیلەسوف، مایکرۆسکۆپ، تەلەسکۆپ، مایکرۆسۆفت.... هتد.

(( بڵاو بوونەوەی ئەم وشانە بەم شێوە بەر فراوانە، بەهۆی پێشکەوتنی ئامرازەکانی ڕاگەیاندن و پەیوەندییەوە بوو، کە بەئاسانی یاریدەی هەڵقوڵینی زانیارییەکانی دا. ئەگەر ئەم زاراوە زانیارییانە پێشتر لەلایەن کۆمەڵێکی تایبەت لە زاناو ئەکادیمییە پسپۆڕەکانی کۆمەڵگا پێشکەوتووەکان بڵاو بووبێتەوە، وا ئێستا لە نێو کۆمەڵگا خێڵەکییە دواکەوتووەکانیشدا بڵاوبۆتەوە.

لەلایەکی دیکەوە لە نێو کەرت و چینە جیاوازەکانی یەك کۆمەڵگە دا، لەم ڕووەوە کە ئامرازەکانی ڕاگەیاندن و پەیوەندی زانیاری نوێ سامانێکی گۆکردنی نوێ دەبەخشێتە خەڵکی، بەتایبەتی نەوە نوێیەکان، کە زۆر جیاوازە لەوەی نەوەکانی پێشتر لە ڕێی ئامرازە سادەکانەوە بۆیان ماوەتەوە، هاتنە ناوەوەی ئەم وشەو زاراوەو دەربڕینانە و ئەو بیرۆکەو وێناکردن و چەمکانەی پێیانەوە بەندن، بەهۆکاری دەوڵەمەنبوونی ئەو زمانانە دادەندرێت کە وەری دەگرێت و دەیخاتە نێو فەرهەنگی زمانەکەیەوە ))[1].

زاراوەی جیهانی : – لە فەرهەنگی هەموو زمانەکانی جیهاندا بەرچاودەکەوێت، بەهۆی چەند پێویستییەکی زانستی و کۆمەڵایەتیی و ڕۆشنبیری شارستانیەتی، دێتە ناو زمانەوە.

لەبەر ئەوەی زمانەکانی جیهان، پێویستیان بە واتاو مەبەستی زاراوە جیهانییەکان هەیە و ناو لێنراوەکانیان ئیش و کاریان لەژیانی ڕۆژانەدا بەڕێوە دەبەن.

زاراوەی جیهانی بەوە پێناسە دەکرێت، کە :

---

(١) د. ئەحمەد ئەبو زەید، و : ڕۆشنا ئەحمەد، ئایا یەك زمانی جیهان دادەمەزرێت ؟، گۆڤاری زانستی سەردەم،ژ(٢٣)، ل ٢٤.

(( واژەیەکە ئـەمڕۆ لـە لایـەن نەتـەوە پێشکەوتووەکانەوە بۆیـەك واتـای زمـانی و تاقـە مەبەســـتێکی شارســـتانی یـــاخود ڕۆشـــنبیری و دەربڕینـــی ئـــەرکێکی یـــەکگرتوو بەکاردەهێندرێ))[1].

هۆکاری هـەبوونی زاراوەی جیهانی لـە زمـانی کـوردی و زۆربـەی زمانـەکانی دیکـەی جیهاندا، دەگەڕێتەوە بۆ : –

١– (( زۆربـەی زاراوە جیهانییـەکان بنجێکـی لاتینـی و ڕۆمـانی کۆنیـان هەیـە، ئـەم دوو نەتەوەیە، لەسـەرەتای شارسـتانیەتی و ڕۆشـنبیری مرۆڤایەتیدا بۆگوزارشـتکردن لـە واتای وێژەیی و بیریی و زانستی و بابەتەکانی دیکەی زانیاری دایانناون، وەك : ( تراجیدیا، کۆمیدیا، فەیلەسوف، ئەتۆم ، دیکتاتۆر، دیموکراسی، ئۆتۆگرافی.. هتد ).

٢– بەشێکی دیکـەی زاراوە جیهانییـەکان ئەوانـەن کـە لەسـەردەمی شۆڕشـی پیشەسازی دانراون، پەیوەندییان بـە گـۆڕانی مـادی و ئابورییـەوە هەیە، لەگـەڵ ئـەو پێویـستییە زانستیانەدا هاتوونەتە کایەوە کە لە وڵاتە پێشکەوتووەکانی ( ئەورووپا ) داهێنراون.

٣– ئەمڕۆش لـەناو نەتـەوە پێشکەوتووەکانی جیهانـدا، کاتێـك شـتێك دەدۆزرێتـەوە، یـان مەبەستێك دادەهێندرێ، سـەرەنجام بـەزمانی ئـەو نەتەوەیـە زاراوەیـەك بـۆ مەبەسـتە داهێنراوەکە یان شتە دۆزراوەکە ساز دەکرێت، لەبەر پێویستی نەتەوەکانی دیکە، بەو مەبەست و واتایە، زاراوەکە بەکاردەهێنن و ئیتر دەبێت بە زاراوەیەکی جیهانی.

لە زانستی زاراوەسازی کوردیدا، ئەمڕۆ کێشەیەکی زمانی لە بارەی ئـەو زاراوانـە بـەر پابووە، کە خۆی لە چەند پرسیارێکی گرنگدا دەنوێنێ، وەك : –

١– ئایا لەچ کاتێکدا دەبێ زاراوەی جیهانی وەربگرین ؟

٢– ئایا وەرگرتنی زاراوەی جیهانی سوود بـە فەرهـەنگی زمانەکـەمان دەگەیـەنێت و دەوڵەمەندی دەکات، یان زیانی پێ دەگەیەنێت ؟

٣– ئایا مانەوەی زاراوەی جیهانی لە فەرهەنگی زماندا، کاتییە یان هەمیشەییە ؟

٤– لەچ کاتێکدا هەوڵی وەرگێڕانیان بدەین بۆ سەر زمانی کوردی ؟

---

(١) د. کامل حەسەن بەسیر، زاراوەی کوردی، ل١١٤.

وەڵامی ئەم پرسیارانە لەچەند ڕاستییەکدا جێگیر دەبێ، کە ئەویش ئەوەیە))[1] : –

نەتەوەکانی سەر ئەم زەمینە کە کوردیش یەکێکە لەوان پێویستییان بە مەبەست و واتای زاراوە جیهانییەکان هەیە، لەبەر ئەوە، هەردەبێ ئەو زاراوانە لە زمانەکانیاندا بەکاربهێنن و لە فەرهەنگەکانیاندا بیچەسپێنن.

وەرگرتنیان سوود بە فەرهەنگی زمانەکەمان دەگەیەنێت و دەوڵەمەندی دەکات، لەبەر ئەوە، ئێمە ناتوانین باس لە پێشکەوتن و زانستەکانی سەردەم نەکەین، چونکە زاراوەی پێویست بەو بابەتانە لە زمانەکەماندا دەست ناکەوێت.

دەبێ ئەوەشمان لەیاد نەچێ، کە وەرگرتنی زاراوەی جیهانی مەرجی تایبەتی خۆی هەیە و بەپێی دەستوور ئەنجام دەدرێت، ئەویش ئەوەیە : –

(( کە ئەگەر هاتوو لە زمانی کوردیدا وشەیەکی پڕاوپڕی مەبەست و واتای زاراوەیەکی جیهانی نەبوو دەبێ ئەو زاراوە جیهانیە وەربگرین و پێویست بەوە ناکات، وشەی نابەجێی وای بۆ دروست بکەین کە لەگەڵ مەبەستەکەیدا نەگونجێت و نەتوانێ واتاکەی بەتەواوی بگەیەنێ، بەڵام ئەگەر هات و وشەی ڕەسەنی کوردیی وامان هەبوو، پێویستە وشە کوردییەکە لە بەر تیشکی یەکێك لە ڕێبازەکانی سازکردنی زاراوەدا بکەین بە زاراوەیەك و لە بری زاراوە جیهانییەکە بەکاری بهێنین))[2].

بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێت، کە دەبێ ڕێبازێکی زانستیی لە هەڵبژاردنی زاراوەی جیهانیدا بۆ زمانەکەمان بگرینەبەر : –

ئەگەر هات و لە زمانەکەماندا، باسی بابەتێکی نوێی زانستیی یاخود زمانەوانی، وێژەیی، مێژوویی، ڕامیاریی، ڕۆشنبیری.... هتد بکەین،، بەوێنە کاتێ باسی ( ئەتۆم ) یان زانستی(فرۆکەوانی ) دەکرێت، ئەم بابەتە لە زمانی کوردیدا تازەیەو فەرهەنگو کلتورەکەمان پێی ئاشنا نییە و هیچ تاقیکردنەوەیەکی کۆنمان لەبارەیەوە نییە پێویستمان بە هەڵبژاردنی چەند زاراوەیەکی جیهانی دەبێ.

لەبارەی وەرگێڕانی زاراوە جیهانیەکانیش بۆ چوونی جیاواز هەیە : –

هەندێك لە نوسەران لەو بڕوایەدان : –

---

(١) سەرچاوەی پێشوو ،ل١١٥.

[2] کامل بەسیر ،زاراوەی کوردی،ل ١١٦.

ئەگەر پێویستیمان بە زاراوەیەکی جیهانی هەبوو، بۆ سەر زمانی کوردی، بەهۆی ئەو بابەت و کەل و پەل و ئامرازانە کە دێنە ناو وڵاتەکەمان، لە بوارەکانی زانستی، هونەریی، سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئەدەبیدا، وەکو خۆی وەریبگرین باشترە، هەوڵی وەرگێڕانی نەدەین، چونکە : -

هیچ ڕێبازێك لە ڕێبازەکانی دانان و سازکردنی زاراوەی کوردی، یارمەتی دۆزینەوە یان دروستکردنی وشەی کوردی ڕەسەن بەرانبەر بەو زاراوە جیهانیانە نادەن. بەڵگەشیان بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونە، نالەباری ئەو زاراوە کوردیانەیە، کە بەرانبەر بە زاراوە جیهانییەکان دانراون، وەك:- زاراوەی ( دەنگەوەر ) کە مامۆستا ( جەمال نەبەز ) بەرانبەر بە زاراوەی (میکرۆفۆن) ی لاتینی لە زمانی کوردیدا سازی کردووە.

یان زاراوەی ( ئەسپە ئاسنین ) کە هەندێ لە نوسەرانی کورد، بەرانبەر بە زاراوەی (پایسکل) ی جیهانی دایانناوە.

(( ئەم دوو زاراوەیە نەلە ڕووی دەنگەوە، نە لە ڕووی واتاوە، بەرانبەر بە زاراوە جیهانیەکان ناوەستن، بۆیە نەیانتوانیوە لە فەرهەنگی زمانی کوردیدا، شوێنی خۆیان بکەنەوە. هەروەها ناسازی وەرگێڕانی ئەم زاراوە جیهانیانەی خوارەوە : -

| زاراوەی جیهانی | وەرگێرانەکەی بۆ کوردیی |
| --- | --- |
| ئەکتەر | تەماشادەر |
| سکرتێر | نهێنی پۆش |
| لۆجیك | بیرسا |
| استمولوجیا | دیمانەی زانیاری |
| سۆشیالیزم | هاوبەشییەتی..... هتد ))[1]. |

هەندێك جار هەرچەندە، وشەیەکی کوردی ڕەسەنیش هەیە، بەرانبەر بە زاراوەیەکی جیهانی بەڵام ناتوانێ لەناو کۆمەڵانی خەڵك، شوێنی ئەوبگرێتەوە، بە وێنە : -

لە زمانی کوردیدا جگە لە (( ئەسپە ئاسنین )) کەوتمان نەیتوانیوە وەکو زاراوەیەك، شوێنی زاراوەی جیهانی بگرێتەوە، زاراوەی (( دوو چەرخ ))ەش هەیە، کە لە مێژە لە فەرهەنگی کوردەواریدا تۆمارکراوە، بەڵام هەر زاراوەی (( پایسکل )) بەکاردەهێندرێت.

---

(١) د. کامل حەسەن بەسیر، زاراوەی کوردی، ل١٢٤.

هەندێك نووسەری دیکە لە بەرانبەر وەرگێڕانی زاراوەی زانستی پێیان وایە : –

(( هەندێك زاراوەی زانستی هەیە، وەکو خۆی وەری بگرین بەکەمێك دەست کارییەوە باشترە، لەوەی بەزاراوەیەکی کوردی وەریبگێڕین کە لەگەڵ مەبەستە کەیدا نەگونجێ : –

بەوێنە : – (( گلێنە – قرنیە Cornea )

( کۆرنیە ) کە لە کتێبەکانی خوێندندا باوە ڕاستتر و وردترەو، چونکە ( کۆرنیە ) پێشە ڕوونەکەی بیلبیلەی چاو دەگرێتەوە، بەڵام (( گلێنە )) هەموو گۆی چاو ( تۆپی چاو ) دەگرێتەوە))[1].

چەندین زاراوەی جیهانی هاتۆتە ناو فەرهەنگی زمانی کوردی، وەك:

ڕۆکێت، مۆبایل، سیدی، کۆمپیوتەر، ئیمەیڵ، تەلەفۆن، ڤیدیۆ، پاندان، سپلیت، ئینتەرنێت، گرووپ... هتد.

## دووەم :- لێکدان

زمانی کوردی لە زمانە لکاوەکانە، هەر بۆیە ژمارەیەکی زۆر لە وشەو دەربڕینەکانی ناسادەن،، ئەم تایبەتیەی زمانی کوردی بەوە چەسپیوە کە بەهۆی ڕێبازی لێکدانەوە، زۆربەی ناو و کارەکان لەسەر بنچینەی یەکگرتنی دوو وشەی واتادار یان زیاتر لە فەرهەنگی کوردیدا پەیدابوون و وەك وشەیەکی خاوەن واتایەکی سەربەخۆ خۆیان چەسپاندووە ((زمانەکەمان وەك زۆربەی زمانە ئاریەکان، لێکدراوی زۆر تێدایە لەهەموو جۆر وتەو زاراوەدا))[2].

(( زاراوەش کە جۆرە وشەیەکە، بەهۆی ئەم ڕێبازەوەو بەگوێرەی پێویست و بە درێژایی تەمەنی زمانی کوردی، بەچەند شێوە لێکدانێك هاتۆتە ناو زمانی کوردییەوەو پەیدا بووەو بەڵگەی داوەتە دەست پسپۆڕەکانی ئەم زمانە، کە لەزاراوەسازیدا، ڕێبازی لێکدان،

---

(١) جەمال عەبدول، بەرکولێکی زانستە زاراوەسازیی کوردی،ل ٤٤.

(٢) ئەحمەد حەسەن، پێشگرو پاشگر،گۆڤاری کۆڕی زانیاری،ل ٣٢٠.

وەکو یەکێك لە ڕێبازە هەرە باوەکانی دانان و سازکردنی زاراوەی کوردی بگرنەبەر بەو پێودانگە، زاراوەی لێکدراوی پێویست دابهێنن ))[1].

## وشەی لێکدراو

ئەو وشە ناسادەیە، کە لە دوو مۆرفیمی سادەی واتادار یان پتر پێك دێت و واتایەکی نوێ دەگەیەنێت، وەك : (( چاوکاڵ، بەردە نوێژ ))[2]، خاڵ لە ڕوو.....

ئەگەر بە وردی لە زاراوەی لێکدراوی کوردی بکۆڵینەوە و هەوڵی دەستنیشانکردنی چۆنیەتی لێکدانی زاراوەی نوێباو بدەین، بۆمان دەردەکەوێت، زاراوەی لێکدراو لە مانەی خوارەوە سازدەکرێت : –

### ١– ناوی لێکدراو

ڕێژەی پلەی یەکەمی ناوی لێکدراو لە لایەنی سادەییەوە ئەوەیە ئەوەیە کە تەنیا لە وشەی واتادار بەبێ زیادی پێك هاتبێ، ئەمەش بەچەند ڕێگایەك دەبێ، وەك : –

**أ– ناو + ناو :**

کاسە + سەر ⟵ کاسەسەر

(( شوێنکات، کتێب دۆست ))[3]، دەست نوێژ، سەرجەم، شاهەنگ، شاکێو.... هتد.

**ب– ناو + ئاوەڵناو**

چاو + جوان ⟵ چاوجوان

باڵا + بەرز ⟵ باڵابەرز

سەر + سەخت ⟵ سەرسەخت

سەر + سپی ⟵ سەرسپی ...هتد

---

(١) د. کامل حەسەن بەسیر، زاراوەی کوردی،ل ٦٢.

(٢) لێژنەی دەستووری زمانی کوردی، هەندێ لە بابەتە کێشەدارەکان لە ڕێزمانی کوردیدا،ل ٢٢.

(٣) بەختیار سەجادی، محەمەد مەحموودی، فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی،ل ٧٩.

**جـ- ئاوەڵناو + ناو**

ڕەش +ماڵ ⟵ ڕەشماڵ

سوور + گوڵ ⟵ سوورگوڵ.

- زۆر جار ئەم جۆرە ڕۆنانەی ناوی لێکدراو، لە لێکدانی ئیزافەدا سازدەکرێت، وەك : -

| ناوی تەواوکراو | ناوی لێکدراو |
| --- | --- |
| ( داری گوێز ) — ی | دار گوێز |
| ( شوێنی کار ) — ی | شوێنکار |

- دیارخەر دەکەوێتە پێش دیارخراو، مۆرفیمی ( ی ) خستنەپاڵی نێوانیان لا دەبردرێت :-

| ناوی تەواوکراو | | ناوی لێکدراو |
| --- | --- | --- |
| ( ژنی برا ) — ی | - برا + ژن ⟵ | براژن |
| ( برای شو ) — ی | - شو + برا ⟵ | شوبرا |
| ( ژنی شا ) — ی | - شا + ژن ⟵ | شاژن |
| ئەنگاوی چێشت — ی | - چێشت + ئەنگاو ⟵ | چێشتەنگاو |

- مۆرفیمی ( ی ) خستنە پاڵ دەگۆڕێت بە مۆرفیمی ( ە )

| لێکدانی ئیزافە | ناوی لێکدراو |
| --- | --- |
| بەردی باز | بەردەباز |
| تۆپەڵی بەفر | تۆپەڵەبەفر |

- مۆرفیمی ( ی ) خستنەپاڵ دەگۆڕێت بە مۆرفیمی ( ە )، دیارخەر دەکەوێتە پێش دیارخراو :

| ناوی لێکدراو | | لێکدانی ئیزافە |
| --- | --- | --- |
| وتارەهەواڵ ))[١]. | ← ی → / ← ە | (( هەواڵی وتار |
| پەخشانە شیعر ))[٢]. | ← ی → / ← ە | (( شیعری پەخشان |
| (( وێنە هەواڵ ))[٣]. | ← ی → / ← ە | (( هەواڵی وێنە )) |

- دیارخەر دەکەوێتە پێش دیارخراو لەگەڵ گۆڕانی مۆرفیمی ( ی ) خستنەپاڵ بە ((مۆرفیمی ( ۆ،ێ ) کە لە کرمانجی ژووروودا لە دۆخی بانگهێشتندا دەچنە سەرناوی نێر و مێ. واتە بەپێی یاسای ((دیارخراو + (( ۆ، ێ )) + دیارخەر ))[٤]. وەك :

| ناوی لێکدراو | | لێکدانی ئیزافە |
| --- | --- | --- |
| خاڵۆژن | ← ی / ۆ | ژنی خاڵ |
| مامۆژن | ← ی / ۆ | ژنی مام |
| پیرێژن | ← ی / ۆ | ژنی پیر |

- بەهۆی گۆڕانێکی فۆنۆلۆجییەوە پێك دێت، وەك

مام + وەستا ← مامۆستا

- هەندێ جاریش ناوی لێکدراو، لە لێکدانی ئیزافەی

---

(١) بەدران ئەحمەد حەبیب، فەرهەنگی زاراوەگەلی ڕاگەیاندن،ل ١١٢.

(٢) د. موحسین ئەحمەد عومەر، فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی،ل ٧٠.

(٣) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، فەرهەنگی زاراوەی زمانناسی،ل ١٢٢.

(٤) سەرچاوەی پێشوو،ل ١٢٣.

دیارخراو + ی + دیارخەر  پێك دێت بەبێ هیچ گۆڕانكارییەك، وەك : –

(( بابەت + ی + هەواڵ        بابەتی هەواڵ

سەرەتا + ی + هەواڵ        سەرەتای هەواڵ ))[1]

(( بابەت + ی + زاڵ        بابەتی زاڵ ))[2]

جۆگەی هەرس، ئەستێرەی بەخت، ئاسمانەی دەم، كرمی ئاوریشم، گەڵای مێو، قسەی نەستەق، شیعری ئازاد.

– لە هەندێ باردا مۆرفیمی دۆخیش دەردەكەوێت، وەك

برا + ( ی ) + شیر + ( ی ) ← برای شیری

دیارخراو ( مۆرفیمی خستنەپاڵ) دیارخەر ( مۆرفیمی دۆخ )

(( نان + ( ێ ) + سێڵ + ( ێ ) ← نانێ سێڵێ))[3].

دیارخراو ( مۆرفیمی خستنەپاڵ ) دیارخەر ( مۆرفیمی دۆخ )

(( ڕێباز + ی + سروشت + ی ← ڕێبازی سروشتی))[4]..

نان + ( ی ) + تیر + ( ی ) ← نانی تیری

– لە هەندێ جۆرە لێكدانی ئیزافەدا زیادەیەكیش بەشداری لێكدانەكە دەكات، وەك : –

باخچە + ی + ساوا + یـ + ان ← باخچەی ساوایان

پەند + ی + پێش + ین + ان ← پەندی پێشینان

(( بنچینە + ی + جۆر + ەكە + ان ← بنچینەی جۆرەكان ))[5].

---

(١) بەدران ئەحمەد حەبیب، فەرهەنگی زاراوەگەلی ڕاگەیاندن،ل ١١٤.

(٢) بەختیار سەجادی، محەمەد مەحموودی، فەرهەنگی شیكارانەی زاراوەی ئەدەبی،ل ٤٦.

(٣) هەژار موكریانی، هەنبانە بۆرینە،ل ٨٥٩.

(٤) محەمەد چیا، فەرهەنگی فەلسەفی،ل ١١٣.

(٥) سەرچاوە پێشوو،ل ١٢١.

٢- سازكردنی ناوی لێكدراو لە ناوێكی بە ئاوەڵناو تەواوكراو :-

| ناوی تەواوكراو | ناوی لێكدراو |
|---|---|
| پەڕۆی كۆن | پەڕۆكۆن |
| چاوی جوان | چاو جوان |

ب- لابردنی مۆرفیمی ( ی ) خستنەپاڵ و پێشكەوتنی ئاوەڵناوەكە : -

| ناوی تەواوكراو | ناوی لێكدراو |
|---|---|
| ( گوڵی سوور ) - ی | سوور گوڵ |
| (ماڵی ڕەش ) - ی | ڕەشماڵ |

جـ- پێشكەوتنی ئاوەڵناوەكە و گۆڕانی مۆرفیمی خستنەپاڵی ( ی ) بۆ ( ە ) : -

| ناوی تەواوكراو | | ناوی لێكدراو |
|---|---|---|
| ( بای ڕەش ) | ی → / ← ە | ڕەشەبا |
| ( پیازی تەڕ ) | ی → / ← ە | تەڕەپیاز |
| ( شێوازی وشك ) | ی → / ← ە | وشكەشێواز |

٣- سازكردنی ناوێكی لێكدراو لە ناوێكی بەڕەگی كار تەواوكراو : -

زاراوە + ( ناس ) - ناسین ←——— زاراوەناس

ئـاژاوەگێڕ، قـسەزان، پەيكـەرتاش، وتاربێـژ، خـوێن هـێن، ئاشـتی پـارێز، قسەزان....هتد

| ناوی تەواوكراو | ناوی لێكدراو |
|---|---|
| ( كاری خوێندن ) - ی | خوێندكار |
| ( كاری نقسین ) - ی | نقیسكار |

جگە لە ڕەگی ڕانەبردووی كار، ڕەگـی ڕابـردووش بەشـداری ڕۆنـانی نـاوی لێكـدراو دەكـات، وەك:-

ڕۆژ + هەڵات ⟵ ڕۆژهەڵات

تێبینی : – ناوی لێکدراو کە لە ناوو ڕەگی کار پێک دێت، هەندێکیان ناوی کاران، هەندێکیان ناوی بەرکارن، هەندێکیان سیفەتی بەردەوامیان تێدایە، هەندێکیان سیفەتی نابەردەوامیان تێدایە:–

١– ناوی کارا، وەک : –

ئارامی بەخش، ڕوناکی بەخش، (( وانەبێژ ))[1]، خوێنەر، (( باجستێن ))[2]، ماسی فرۆش، مازوچن، قیمەکێش، پڵاو خۆر، ئاگربڕ، باجگر، ئاودەر، جل شۆر.... هتد.

هەندێک جار پاشگرێکیش لەگەڵ ڕەگی کاردا دێت، وەک : –

(( ئاو + دڕ ÷ کە ⟵ ئاودڕکە

ئاو + ڕێژ + گە ⟵ ئاوڕێژگە ))[3].

– هەبوونی پاشگر دەبێتە هۆی گۆڕینی واتا، بەوێنە : –

ماسیگر : بەواتای کەسێک دێت کە ڕاوە ماسی دەکات.

ماسیگرە : بەواتای ماسی خۆرە دێت.

هەروەها وشەکانی : ئاوبەر، کتێب گرەوە، ئاگرکوژێنەوە..... هتد.

– ڕۆنانی ناوی کارا بە یاریدەی ئاوەڵناو + ڕەگی کار : –

نوێ + خواز ⟵ نوێخواز

کۆنە + پەرست ⟵ کۆنەپەرست

کۆنە + فرۆش ⟵ کۆنەفرۆش

---

(١) گیوموکریانی، فەرهەنگی مەهاباد،ل ٦٣٦.

(٢) عەبدولرەحمانی زەبیحی، قاموسی زمانی کوردی،ل ٢٥٤.

(٣) هەژار موکریانی، هەنبانە بۆرینە،ل ١٤.

٢- **ناوی بەرکار**، وەك :-

ناو + ڕەگی کار : -

بابردوو، ناوهاتوو، (( ئاوبردە ))[1]، سەرمابردە

ناو + ڕەگی کاری کارا نادیار : -

نیشانەکراو، بەشخوراو، سەربڕاو، مارەکراو، پارەدزراو...... هتد.

تێبینی : - لە دروست کردنی ناوی کارا یان ناوی بەرکار کەرتی دووەمی وشەکە کە لە ( قەد ) یان ڕەگی کاری ڕانەبردوو وەردەگیرێ بەتەنیا واتای تەواو نابەخشێ، (( بەڵام لەبەر گرنگی دەوری کەرتەکەو لەبەر ئەوەش ئەو کەرتە لە وشەیەکی واتادار دەکەوێتەوە شێوەی ئەوی پێوە دەمێنێتەوە، بۆیە زماننا‌سان مامەڵەی وشەی واتاداری لەگەڵدادەکەن ))[2].

خوێن + مژ ⟵ خوێنمژ

چاو + شکێن ⟵ چاوشکێن

**ناوەڵکار + ڕەگی کار : -**

بن + کۆڵ ( کۆڵین ) ⟵ بنکۆڵ

(( ژێر + کەن ( کەندن ) ⟵ ژێرکەن

- ڕۆنانی ( ناوی لێکدراو ) بە یاریدەی : -

**ژمارە + ناو :**

دوو + شەمەمە ⟵ دوو شەمەمە

هەزار + پێ ⟵ هەزارپێ

سێ + باز ⟵ سێباز

دوو + برا ⟵ دووبرا

هەزار مێرد، چوارگۆشە، سێ لوولە، هەشتپاڵوو، شەستیتر، چوارچێوە، دوودەو..... هتد.

ڕۆنانی ناوی لێکدراو بە یاریدەی دووبارەکردنەوەی هەمان وشە :-

---

(١) عەبدولرەحمانی زەبیحی، قاموسی زمانی کوردی،ل ٨١.

(٢) مەسعود محەمەد، زاراوەسازیی پێوانە،ل ٢٥٥.

له زمانی کوردیدا ژماره‌یه‌ك ناوی لێکدراو به‌ یاریده‌ی دووباره‌کردنه‌وه‌ی هه‌مان وشه‌وه‌ دروست ده‌بن ، ئه‌مه‌ش له‌چه‌ند شێوه‌یه‌کدا ده‌رده‌که‌وێت، وه‌ك :-

أ- دووباره‌کردنه‌وه‌ی هه‌مان ناو :-

ناز + ناز ⟵ نازناز

ب- دووباره‌کردنه‌وه‌ی دوو ناوی بێ واتا :-

تیو + تیو ⟵ تیوتیو

خاش + خاش ⟵ خاشخاش

جـ - دووباره‌کردنه‌وه‌ی دوو ناوی کات :-

ده‌م + ده‌م ⟵ ده‌م ده‌م

جار + جار ⟵ جارجار

د - دووباره‌کردنه‌وه‌ی دوو ناوی ده‌نگی سروشتی :-

لووره‌لوور، گفه‌گف، خشه‌خش، قیره‌قیر، مرچه‌مرچ، مشه‌مش، هاژه‌هاژ، گرمه‌گرم، جیره‌جیر، ورته‌ورت، خوره‌خور، فلته‌فلت، بۆڵه‌بۆڵ، فشه‌فش، مینگه مینگ،.... هتد.

- دروست بوونی ناوی لێکدراو به‌ هۆی دووباره بوونه‌وه‌ی ده‌نگه سروشتییه‌کان، به‌یه‌کێك له‌ ڕێگا به‌رهه‌مهێنه‌کانی زاراوه‌ی لێکدراو له‌ زمانی کوردیدا داده‌ندرێت، ده‌توانرێت فه‌رهه‌نگۆکێکی تایبه‌تی له‌م جۆره ناوانه سازبکرێت.

هـ - دووباره‌کردنه‌وه‌ی هه‌مان ئاوه‌ڵناو :-

لاو + لاو ⟵ لاولاو

ڕۆنانی ناوی لێکدراو به‌ یاریده‌ی : -

ژماره + ژماره

دوو + سێ ⟵ دووسێ

سێچوار، چوارپێنج، هشتنۆ، یه‌کدو.... هتد.

ناوی لێکدراو بۆ تیره‌و هۆز یاخود نازناو ( له‌قه‌ب ) :-

- یه‌کێکی دیکه له‌ ڕێگاکانی ناوی لێکدراو له‌ زمانی کوردیدا، ئه‌و جۆره ناوانه‌ن که به‌هۆی (نازناو)ه‌وه سازده‌کرێن، وه‌ك :-

سلێمان پاشا، ڕه‌زابه‌گ، وه‌ستا عه‌لی، مه‌لا ئازاد..... هتد

هەندێك نازناو دەدرێتە پاڵ کەسێك لە بوارێکی کۆمەڵایەتیدا : –

دوو + سەر ⟵ دووسەر

چوار + چاو ⟵ چوارچاو

– ناو + ناوی بەرکار : –

جەڕکە + شکاو ⟵ جەڕکەشکاو

– ناو + ئاوەڵناو : –

چکمە + ڕەق ⟵ چەکمەڕەق

– نازناوی شوێن : – ئازاد خانەقینی، حاجی قادری کۆیی، نالی شارەزووری، سەردار کەرکوکی.... هتد.

– نازناوی هۆز : – پەیوەند جاف، کەمال میراودەلی...... هتد.

– نازناوێك کە ئەو کەسە بۆخۆی هەڵی دەبژێرێت : –

شێرکۆ بێکەس، ( عەبدوڵلا پەشێو )، ئازاد غەمگین، شێرزاد ناشاد.... هتد.

– بەهۆی پیشەی ئەو کەسەوە، وەك : – قادر نەجار، تەحسین قەلاب، ئازاد نانەوا، ئۆمەری چایەچی، ئەحمەد لۆری، ڕەحمانی ماست فرۆش، وەسمانی پینەدۆز،.... هتد

– بەهۆی کارەساتێکەوە کە بەسەر ئەو کەسەدا هاتووە : –

ئازاد هەڵدێر

– بەهۆی ئەوەی کە نازناوەکە لەگەڵ ناوەکە خۆش بەسەرزاردا دێت : –

قالەقوڕاوی

– بەهۆی سیفەتێکەوە کە کەسێك هەیەتی، وەك : –

حەمەژنانی، نازە کوڕانی، ئۆمەر چاوچنۆك،.... هتد.

تێبینی :–

ئەم جۆرە ناوە لێکدراوانە ناچنە ناو فەرهەنگی زمانەوەو دەوڵەمەندی ناکەن، بەڵکو تەنیا بۆ نیشاندانی جۆرێك لە ڕۆنانی ناوی لێکدراو بە هۆکاری ( نازناو ) ەوە ئەم نموونانەمان هێناوە، کە لە فەرهەنگی زمانی خەڵکی ئاساییدا هەن، وە بە تێپەڕ بوونی کات شێوەیان دەگۆڕێت، تازیان بەرەو پێشەوە بڕوات، کەمتر ئەم نازناوانە دروست دەکرێن.

– یەکێك لە تایبەتییەکانی ( ناوی لێکدراو ) کە لە ( ناو و ناو ) یان لە ( ناو و ئاوەڵناو ) پێك هاتبێت، ئەوەیە کە

ئەو بەشەی وەسفی تێدابێ کاریگەرترە لە هەڵنانی وشە لێکدراوەکە، بە وێنە : – ڕۆنانی ( دارتوو ) کاریگەرترە لە ( داری توو ) کە لێکدانی ئیزافەیە، ( ڕەشەتوو ) ش کە وەسفی ڕاستەقینەی تێدایە و ئاوەڵناوەی ( ڕەش ) جیا ناکرێتەوە لە ( توو ).

– ڕێژەی پلەی دووەمی ( ناوی لێکدراو ) لە ڕووی پێکهاتنەوە ئەوەیە کە جگە لە وشەی واتادار زیادەیەکیش لە ڕۆنانی ناوە لێکدراوەکەدا بەشداری دەکات، وەك : –

۱– <u>مۆرفیمە بەستەرەکان ( Conjuction ) کە لە سازکردنی ناوی لێکدراو دا بەشداری دەکەن : –</u>

مۆرفیمەکانی ( – ە –، – بە –، – و – )، لە داڕشتنی وشەی لێکدراودا بەشداری دەکەن بەم شێوەیە :

– ە – :

<u>أ– ناو + ناوبەند+ناو</u>

مانگ + ( – ە – ) + شەو ⟵ مانگەشەو

بەرد + ( – ە – ) + نوێژ ⟵ بەردەنوێژ

گوڵ + ( – ە – ) + گەنم ⟵ گوڵەگەنم

<u>ب– ناو + ناوبەند+ئاوەڵناو</u>

مێرگ + ( – ە – ) + سوور ⟵ مێرگەسوور

کێل + ( – ە – ) + سپی ⟵ کێلەسپی

<u>جـ– ئاوەڵناو +ناوبەند+ ناو</u>

سەوز + ( – ە – ) + گیا ⟵ سەوزەگیا

تەڕ + ( – ە ) + پیاز ⟵ تەڕەپیاز

وشك + ( – ە – ) + شێواز ⟵ وشکەشێواز

جوان + ( – ە – ) + مەرگ ⟵ جوانەمەرگ

<u>د– ئاوەڵکار +ناوبەند+ ناو</u>

(( پاش + ( – ە – ) + لەقە ⟵ پاشەلەقە

پاش + ( – ە – ) + ڕۆژ ⟵ پاشەڕۆژ ))[1].

نیو + ( – ە – ) + شەو ⟵ نیوە شەو

هـ– دووبارەکردنەوەی هەمان وشە بەیاریدەی گۆنجێکشنی ( – ە – ) :–

١– دووبارە کردنەوەی ناوێکی واتادار، وەك : –

دەم + ( – ە – ) + دەم ⟵ دەمەدەم

چاو + ( – ە – ) + چاو ⟵ چاوەچاو

٢– دووبارەکردنەوەی دوو ناو کە بەتەنیا واتایان نییە، وەك : –

چەڵت + ( – ە – ) + چەڵت ⟵ چەڵتەچەڵت

فلّت + ( – ە – ) + فلّت ⟵ فلّتەفلّت

٣– ڕەگی کار + ( – ە – ) + ڕەگی کار : –

تەپ + ( – ە – ) + تەپ ⟵ تەپەتەپ

سوڕ + ( – ە – ) سوڕ ⟵ سوڕەسوڕ

هات + ( – ە – ) + هات ⟵ هاتەهات

تێبینی : –

دووبارەکردنەوەی وشە لە زمانی کوردیدا برەوی زۆرە بۆ پێکهێنانی وشەی لێکدراو، ئەمەش هێمای ئەوەیە کە دەوڵەمەند بوونی زمان لە کەرستەی تێکبەستن و لێکدان ڕێگە خۆش دەکات بۆ هەمەجۆرکردنی وشەی دووپات. زمانی کوردی مەیلی بۆ ئەم جۆرە زۆرە.

– و –

١– ناو + ناو

ژن + ( – و – ) + ماڵ ⟵ ژن و ماڵ

لەرز + ( – و – ) + تا ⟵ لەرزوتا

زێر + ( – و – ) + زیو ⟵ زێروزیو

---

(١) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی – ناو،ل ١٣٦.

ناوی دوو ئەندامی لەشی ئادەمیزاد : –

دەم + ( – و – ) + چاو ⟵ دەم و چاو

جەرگ + ( – و – ) + هەناو ⟵ جەرگ و هەناو

دەست + ( – و – ) + پێ ⟵ دەست و پێ

دوو ناوی شوێن : –

جێ + ( – و – ) + ڕێ ⟵ جێ و ڕێ

دووبارەکردنەوەی ناو بە یاریدەی ( – و – ) لەگەڵ گۆڕینی مۆرفیمی یەکەمی ناوەکە بۆ(م):–

گوڵ + ( – و – ) + موڵ ⟵ گوڵ و موڵ

شت + ( – و – ) + مت ⟵ شت و مت

دوو ناوی دژ بەیەك بە یاریدەی ( – و – ) : –

شەو + ( – و – ) + ڕۆژ ⟵ شەووڕۆژ

دوو ئاوەڵناوی دژ بەیەك : –

چاك + ( – و – ) + خراپ ⟵ چاك و خراپ

ئەم ڕێگە لە زمانی کوردیدا بەرهەمهێنە و ژمارەیەکی زۆر ناوی لێکدراو بەرچاو دەکەوێت کە لە دوو بارەکردنەوەی ( ناو ) بە یاریدەی کۆنجێکشنی ( – و – ) سازکراون، وەك:–

باب و باپیر، دایك و باوك، ژن و مێرد، خوشك و برا، ڕەنگ و ڕوو، دەنگ و باس، ڕاووشکار، ئاگرو دوکەڵ، دوگمە و دۆڵاب، ئاووگۆشت، داب و نەریت (( بانگ و سەڵا، باو باران، بارو بارخانە، بارگەوبنە، برسی و تینوو، بڕیاروبەڵێن، بنەوبنەچەکە، بوك و خەسوو، بیر و باوەڕ، پەرش و بڵاو، پشت و پەنا، پێ و پل، تاق و جووت، تانج و تەخت..... هتد ))[1].

٢– ئاوەڵناو + ( – و – ) + ناو

خاو + ( – و – ) + خێزان ⟵ خاووخێزان

چۆڵ + ( – و – ) + دەشت ⟵ چۆڵ و دەشت

---

(١) تەها فەیزی زادە، فەرهەنگی وشە دوانەکانی زمانی کوردی،ل ١٨، ١٩، ٢٢، ٢٣، ٢٤، ٢٥، ٢٧.

٣- ناو + ڕەگ

دەست + ( - و - ) + برد ⟵ دەستوبرد

٤- لێکدانێکی دەگمەنی ناوی لێکدراو لە دوو کاری فرمان بەیاریدەی کۆنجێکشنی (- و - ) پێك دێت، وەك : -

بگرەو بەردە، تێکەو لێکە.

٥- وشەیەکی واتادار + ( - و - ) + وشەیەکی بێ واتا : -

شەڕ + ( - و - ) + شۆڕ ⟵ شەڕوشۆڕ

(( پان + ( - و - ) + پۆڕ ⟵ پان و پۆڕ

پان + ( - و - ) + پلێش ⟵ پان و پلێش))[1].

تاریك و نوتەك، قاچ و قوڵ، هەراوهۆریا، دارودوو، زرمو هۆڕ، قایش و قڕوش، ئێسك و پروسك، باوبۆران، تەباوڕەبا، باوبۆران، دزی و فزی، پەڕوپۆ، پەناو پەسێو، تەڕوتلیس، تورەو تۆسن.... هتد.

٦- وشەیەکی بێ واتا + ( - و - ) + وشەیەکی واتادار : -

بڕ + ( - و - ) بیانوو ⟵ بڕوبیانوو

جڕ + ( - و - ) + جانەوەر ⟵ جڕوجانەوەر

پڕوپیرێژن، جم و جۆڵ، پڕوپووچ، تەخشان و پەخشان، نەدی و بدی،.... هتد.

٧- دووبارەکردنەوەی دوو وشەی بێ واتا : -

جیق + ( - و - ) + نیق ⟵ جیق و نیق

جلق + ( - و - ) + فلق ⟵ جلق و فلق

جرت + ( - و - ) + فرت ⟵ جرت و فرت

حەلۆوبەلۆ، چرپ و چۆپ،...... هتد.

٨- ڕەگی کار + ( - و - ) + ڕەگی کار : -

گفت + ( - و - ) + گۆ ⟵ گفت و گۆ

ترس + ( - و - ) + لەرز ⟵ ترس و لەرز

هات + ( - و - ) + چۆ ⟵ هاتو چۆ

---

(١) تەها فەیزی زادە ،فەرهەنگی وشە دوانەکانی زمانی کوردی،ل ٢٣.

٩- ژماره + ( - و - ) + ژماره : -

حەوت + ( - و - ) + هەشت ← حەوت و هەشت

سێ + ( - و - ) + چوار ← سێ و چوار

یەك + ( - و - ) + دوو ← یەك و دوو

١٠- دووبارەكردنەوەی هەمان وشە بەنەفی كراوی، وەك : -

هەست + ( - و - ) + نەست ← هەست و نەست

هات + ( - و - ) + نەهات ← هات و نەهات

(( بێ + ( - و - ) + نەبێ ← بێ و نەبێ ))[1].

١١- دوو ناوی دەنگی سروشتی : -

هاڕە + ( - و - ) + هاژە ← هاڕەوهاژە

پرتە + ( - و - ) + بۆڵە ← پرتەوبۆڵە

قیژ + ( - و - ) + چریكە ← قیژەوچریكە، گریەوناڵە..... هتد.

١٢- ئاوەڵناو + ( - و - ) + ئاوەڵناو : -

گەورە + ( - و - ) + بچوك ← گەورەوبچوك

كەسك و سوور، ڕەش و سپی، ڕەش و ڕووت، هەژارو برسی،.... هتد.

٢- ئەو لێكدانە دەگرێتەوە كە وشەی دووەم واتای نییە، یان واتاكەی پەیوەندی بە واتای وشەی یەكەمەوە نییە، وەك : -

ڕێگاوبان، جاروبار، (( تالاْن و برۆ ))[2].

- بە -

أ- ناو + ناو

كار + ( - بە - ) + دەست ← كاربەدەست

ژن + ( - بە - ) + ژن ← ژن بە ژن

قژ + ( - بە - ) + سەر ← قژبەسەر

مەنجەڵ بەكۆڵ، قوربەسەر، سەربەگۆبەند..... هتد

---

(١) ئەها فەیزی زادە، فەرهەنگی وشە دوانەكانی زمانی كوردی ،ل ٢٢.

(٢) سەرچاوەی پێشوو،ل ٢٧.

ب- ئاوەڵناو + ناو

پڕ + ( - بە - ) + دڵ ⟵ پڕبەدڵ.

<u>**تێبینی :** -</u>

( ١- مۆرفیمەکانی ( - ە -، - بە -، - و - )، بەهای سیمانتیکییان نییە، بەم پێیە واتای فۆرمە نوێیەکە، لە واتای کەرتەکانیەوە دەست دەکەوێت.

٢- ئەو ناوە لێکدراوانەی بە یاریدەی ( - و -، - بە - ) سازبوون، کەرتەکانیان سەربەخۆن، واتە پەیوەندی دیارخەر و دیارخراوی لە نێوانیاندا نییە، بەڵام ئەوانەی بە ( - ە - ) لێکدراون، ئەو پەیوەندییە لە نێوان پارچەکانیاندا، بەدی دەکرێت، وەك :

دەنگ و باس
سەربەخۆ ↑ ↑ سەربەخۆ

گوڵ - ە - گەنم
دیارخەر ↑ ↑ دیارخراو

لەم بارەدا، ئەگەر یەکەم کەرتی ئاوەڵناو بوو، ئەوا دەرخەرێش دەکەوێت، بۆ نموونە :

سەوز - ە - گیا
دیارخەر ↑ ↑ دیارخراو

٣- ئەو ناوە لێکدراوە دووبارەکراوانەی، کە بە یاریدەی ( - و - ) سازبوون و فۆنیمی یەکەمی ناوەکە گۆڕاوە بۆ ( م )، کەرتی دووەمیان ئەمڕۆ بە سەربەخۆیی بەکارناهێنرێن)[1].

هەروەها چەند کونجێکشنێکی دیکەمان هەیە، کە بەشداری لە ڕۆنانی ناوی لێکدراودا دەکەن، وەك :-

- او -

ڕەنگاوڕەنگ، دۆڵاودۆڵ، دەشتاودەشت

- تێ -

چاوتێ برین

---

(١) شێرکۆ حەمە ئەمین قادر، مۆرفیمە بەندە لێکسیکی و ڕێزمانییەکان و ئەرکیان لە دیالێکتی گۆراندا،ل ٦٨.

- له -

چاولەدەر، جامانە لەسەر

- ەن -

(( شاهەنشا ))[1]

- نە -

کەسنەزان، کۆڵنەدەر، بارنەبەر، خۆنەخۆر، خوانەناس

- ان -

بەر + ( - ان - ) + بەر ⟵ بەرانبەر

سەر + ( - ان - ) + سەر ⟵ سەرانسەر.

هەروەها چەند ڕێژەیەکی دیکەی لێکدان لە زمانی کوردیدا هەیە : -

وێنە بۆ ئەو وشە لێکدراوانەی کە لە دوو مۆرفیمی سەربەخۆ و پاشگرێك پێك هاتووە، وەك :

(( چوار + پا + یە = چوارپایە

سێ + کوچك + ە = سێ کوچکە. ))[2].

پیس + پیس + ( - ۆك ) ⟵ پیسپیسۆك

مژ + مژ + ( - ۆك ) ⟵ مژمژۆك

قرت + قرت + ( - ۆك ) ⟵ قرقرتۆك

تێبینی:- لە لێکدانی وشەکاندا، (( زۆرجار ئەو وشەیە پێش دەخرێت، کە گرنگترو بەهادارتربێت، بە واتایێکی دی، جنسی مێ پێش دەخرێت، یاخود بە پێی هەندێ هۆکار، ئەم ڕیزکردنە ڕوو دەدات.... وەك : ژن و ماڵ ( ژن ) بەهادارترە لە ( ماڵ ) ))[3].

---

(١) گیوموکریانی، فەرهەنگی مەهاباد،ل ٣٨٣.

(٢) د. ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم، دیالێکتەکانی زمانی کوردی،ل ٣٥.

(٣) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، فەرهەنگی زاراوەی زمانناسی،ل ١٢١.

ناو + مۆرفیمی ( ە ) + ناو + مۆرفیمی ( ی ) : –

دەرد + ( ە ) + سەر + ( ی ) ⟵ دەردەسەری

ناو + ناوبەند + ڕەگ + پاشبەند

سەر + ە + خۆر + ( ە ) ⟵ سەرەخۆرە

ئاوەڵناو + ناوبەند + ناو + پاشبەند

زەرد + ( ە ) + واڵ + ( ە ) ⟵ زەردەواڵە (زەردەباڵە)

ناو + ناو + پاشبەند

مامر + ئاو + ی ⟵ مراوی

چاو + ئێش + ە ⟵ چاوئێشە

پا + بەند + ك ⟵ پابەندك ( پاوێنك ) لەگۆكردندا.

((ناو + ڕەگ + پاشبەند

مەشكە + دڕ + ە ⟵ مەشكەدڕە ))[1]

ئەسپێ + كوژ + ( ە ) ⟵ ئەسپی كوژە

دۆشاو + مژ + ە ⟵ دۆشاومژە

ئاوەڵناو + ناو + پاشبەند

كەم + دەس + ی ⟵ كەم دەسی

ئاوەڵناو + ڕەگ + پاشبەند

نقڕ + وەڕ + ی ⟵ نقڕوەڕی

٢ – ئاوەڵناوی لێكدراو

أ– ناو + ئاوەڵناو : –

باڵا + بەرز ⟵ باڵا بەرز

چاو + جوان ⟵ چاوجوان

ب– ناو + ڕەگ

دڵ + گر ⟵ دلگر ( دلگیر )

جـ – ژمارە + ناو

---

(١) نیعمەت عەلی سایە، ڕێزمانی كوردی زاری كەلهوڕی،ل ١٠٢.

دوو + دڵ ← دوودڵ

جـ- ئاوەڵناوی ئاوێتە

ناو + ناوبەند + ناو

قور + بە + سەر ← قوربەسەر

چاو + لە + دەر ← چاولەدەر

دەست + بێ + خێر ← دەست بێ خێر

ناو + كار + پاشبەند

دەست + ڕۆیشت + ( وو ) ← دەست ڕۆیشتوو

مـــاڵ + ڕمـــا + و ← ماڵ رماو

بەش + خورا + و ← بەش خوراو

ناو + ناو + پاشبەند

سەر + گەرد + ان ← سەرگەردان

٣- ئاوەڵكاری لێكدراو

ژمارە + ژمارە

یەك + یەك ← یەك یەك

دوو + دوو ← دوو دوو

ئاوەڵكار + ناوبەند + ئاوەڵكار : -

سەر + وە + خوار ← سەرەو خوار

٤- چاوگی لێكدراو : -

چاوگی لێكدراو بە یاریدەی ناو و ئاوەڵناو و ئاوەڵكرداو ژمارەو ئامراز....هتد پێكدێ.

١- بەیاریدەی ناو

(( ناو ( مادی بێ یا مەعنەوی ) دەتوانێ لە پێكهاتنی كرداری لێكدراودا بەشداربێ. وەك:-

(دەست برین، پێ گرتن، بیركردنەوە، شەرمكردن. )

ناوی داڕێژراوو لێكدراویش وەك ناوی سادە دەتوانن یارمەتی پێكهێنانی كرداری لێكدراو بدەن))[١].

---

(١) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی كوردی، كردار،ل ٩٨.

أ- ناوی سادە، وەك :

مـل + نـــان ⟵ ملنان

(( سەر + شكاندن ⟵ سەرشكاندن ))[1]

نان + كردن ⟵ نانكردن

ب- ناوی دارێژراو، وەك :

ڕێ + ( - گـا ) + گرتن ⟵ ڕێگاگرتن

ڕۆژ + ( - وو ) + شكاندن ⟵ ڕۆژووشكاندن

جـ - ناوی لێكدراو، وەك :

بەفر + ئـــاو + خواردن ⟵ بەفراوخواردن

دەست + و + برد + كردن ⟵ دەست و بردكردن

ماست + ئـاو + كـردن ⟵ ماستاوكردن

٢- ئاوەڵناویش ( سادەبێ یا دارێژراو یا لێكدراو ) هەروەك ناو دەتوانێ لە ڕۆنانی چاوگی لێكدراودا بەشدار بێ : -

أ- ئاوەڵناوی سادە، وەك :

پاك + كردن ⟵ پاك كردن

بلند + كردن ⟵ بلندكردن

سوور + بوون ⟵ سووربوون

ب- ئاوەڵناوی دارێژراو، وەك :

نە + خۆش + كەوتن ⟵ نەخۆش كەوتن

نا + شاد + بوون ⟵ ناشادبوون

ت- ئاوەڵناوی لێكدراو، وەك :

سەر + خۆش + بوون ⟵ سەرخۆش بوون

باڵا + بەرز + بوون ⟵ باڵا بەرز بوون

سەر + سپی + كردن ⟵ سەرسپی كردن

---

(١) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، فەرهەنگی زاراوەی زمانناسی،ل ٢٠٨.

(( زۆر جار جگە لەو دوو وشە واتادارەی وشەی لێکدراو پێك دەهێنن، پێشگر یا پاشگریش لەناو وشەی لێکدراودا دەبینرێ ))[1]، وەك:-

أ- پێشبەند+ ناو + چاوگ

له کار کەوتن ← لەکارکەوتن

له دەست دان ← لەدەست دان

ب - پێشبەند + ئاوەڵکار + چاوگ

له ژێر دان ← لەژێردان

له ناو بردن ← لەناوبردن ))[2]

ج - پێشبەند + کار + چاوگ : -

به کوشت دان ← بەکوشتدان

د - ناو + چاوگی دارێژراو : -

ڕێ تێ چوون ← ڕێ تێچوون

مل لێ نان ← مل لێنان

هۆش پێ شکان ← هۆش پێ شکان

هـ - ناو + ئاوەڵناو + چاوگ : -

دڵ ڕەش بوون ← دڵ ڕەش بوون

سەر سپی بوون ← سەرسپی بوون

ز - ئاوەڵناو + چاوگ + پاشگری ( ەوە ) : -

وشك بوون (- ەوە ) ← وشك بوونەوە

درێژ کردن (- ەوە ) ← درێژکردنەوە

پڕ بوون (- ەوە ) ← پڕبوونەوە

ی - ناو + ڕەگ + چاوگ : -

دەم کوت کردن ← دەم کوت کردن

---

(١) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی، کردار،ل ٩٨

(٢) نیعمەت عەلی سایە، ڕێزمانی کوردی زاری کەلهوڕی،ل ١٠٩.

و – ناو + ناوی داڕێژراو + چاوگ :

دڵ خۆشی دان ⟵ دڵ خۆشی دان

پشت بەخۆ بەستن ⟵ پشت بەخۆ بەستن

- لە کۆتاییدا تێبینی ئەوە دەکەین کە زۆرجار ئەو وشانەی بەشداری لێکدانی وشەیەکی لێکدراو دەکەن، دەنگێك یان زیاتر لە یەکێکیان یان هەردووکیان دەکرتێندرێن، ئینجا لێك دەدرێن، زاراوەیەکی نوێ پێکدەهێنن کە بە زاراوەی داتاشراو ناودەبردرێت، بە ڕێبازەکەش دەووترێت (ڕێبازی داتاشین )

- داتاشین : (( واتە دروستکردنی وشەیەك لە دوو وشەی سەربەخۆ یان زیاتر، بەمەرجێك هاوئاهەنگی لە بێژەو واتای نێوان وشە داتاشراوەکە و هەردوو وشە یان زیاتر لە وشە لێداتاشراوەکان هەبێت))[1].

ڕێگە + نووسین ⟵ ڕێنووس

ڕێگە + زمان ⟵ ڕێزمان

وشك + ئاوەکیەکان ⟵ وشکاوەکییەکان

(( کانی + ئاسکان ⟵ کانێسکان ))[2]

دەرد + مرۆڤ + ئاژەڵیەکان ⟵ دەردە مرۆژەڵیەکان

( Zoonoses )

(( خورمژ – خورما و مێوژ ))[3]

---

(١) د. علي القاسمي، مقدمة في علم المصطلح،ل ١٠٢.

(٢) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی – ناو – ،ل ١٣٤.

(٣) ئەنجومەنی کۆڕ، ڕێنووسی کوردی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری، ب١،بەشی یەکەم،ل ٣٧١.

# میتا فۆر

مرۆڤ بوونەوەرێکی داهێنەرە، بەردەوام لە دوای نوێ بوونەوەو گۆران دایە، بەرەو ژیانێکی چاکترو بەدەست هێنانی ئاستێکی بەرزتر لەوەی کە هەیە، میتافۆر ئەم لایەنەی ژیان بەرجەستە دەکات.

(( میتا فۆر، تایبەتییەکی زمانەو یاریکردنە بە سیما واتاییەکان، سڕینەوەی هەندێك و بەر ڕۆشنایی دانی هەندێکی تر پەیوەندی بە وشەوە هەیە و بەدیاردەیەکی بەر بڵاوی ناو زمان دادەندرێ. یەکێك لە ڕەگەزەکانیشی ڕامان و نامۆیی لە خۆ دەگرێ کە ناکرێ پێوانە بکرێن، بۆ ناسینەوەی میتافۆریش پێویستە دەوروبەرەکەی بخرێتە ڕوو، ئەگینا بەبێ بوونی دەوروبەر دەستنیشانکردنی خوازەکە ئاسان نابێت، میتا فۆریش دەکرێ لە ڕستەی هەواڵگەیەنەرو ڕستەی پرس و ڕستەی فەرمان و سەرسوڕمانیشدا دەرکەوێ، لە دەرکەوتنیشدا واتا سەرەکیەکە ناسڕێتەوە، بەڵکو زۆرجار دەبێتە هۆی زیاد کردنی واتای فەرهەنگیش ))[1].

میتا فۆر کە بەکوردی زاراوەی ( خواستن، ئاوەڵواتا، خوازە ) ی بۆ دانراوە بریتییە لە:-

(( بەکارهێنانی وشەیێك بۆ گەیاندنی واتایەك جگە لە واتابنەڕەتییەکەی ))[2].

میتا فۆر زمان جوان دەکات، پێشینان ئەم لێکدانە زمانیانەیان بە فراوانی بەکارهێناوە، لەناو میللەتانی پێشکەوتوودا دەمێکە باس لە میتا فۆر دەکرێ و گرنگی پێ دەدرێ.

میتا فۆر زمان ڕزگاردەکات لە دەربڕینە باوو سواوەکان، کە بە تێپەڕ بوونی کات ژەنگ دەهێنن، دووبارە گیان بەبەر زمان و فەرهەنگی وشەکاندا دەکاتەوە هەروەك (هۆراس) دەڵێ: ((بەهەموو وچەیەك ڕێگا دراوەو هەمیشە ڕێگایان پێ دەدرێ بەگوێرەی باوی سەردەمەکەیان وشە سازبکەن، هەروەکو چۆن دارستان پاش تێپەڕ بوونی ساڵ گەڵاکانی دەگۆڕێتەوە ئەوەی لە پێشدا سەوز بوو بوو دەڕزێت، هەروەها وشەکانیش

(١) سازان رضا معین، واتاو دەوروبەر،ل ٤٨.

(٢) د. محمد علي الخولي، معجم علم اللغة النظري،ل ١٦٨.

کۆنترینیان زووتر بەرەو نەمان دەڕۆن، بەڵام نوێ یەکانیان وەکو وچەیەکی تازە پێگەیشتوو سەوز و بەهادارن ))[1].

هەموو زمانێك ژمارەیەکی زۆر میتا فۆری تێدایە، ئەمەش هۆیەکەی ئەوەیە (( وشە لەهەر زمانێکدا بۆ سەرەتا کە داهاتووە یا یەکەم کەسی ئەو زمانە ئەو وشەیەی بەسەر زارداهاتووە بۆ شتێکی تایبەتی دایناوە بەمە دەووترێ ( دانانی زمان ) – لەپاشا بەرە بەرە پێویستی ئەو زمانە، وە یا خاوەن زمانەکە زیاد بووە،وشەکان بەشی ئەو گۆرانەیان نەکردووە، بەناچاری هێناویانە ئەو وشانە کە سەرەتا بۆ شتێکی تایبەتی دانراون لە گوزارەی تراو بۆ شتی تریان بەکارهێناوە ))[2].

زانایان بایەخێکی زۆریان بە میتافۆر داوەو قسەی زۆریان لەسەر کردووە، چونکە بە وەرگرتن و بەکارهێنانی زمان فراوانتر دەبێ، ( ڕۆسۆ ) دەڵێ : (( دەربڕینە سەرەتاییەکانی مرۆڤ میتا فۆر بوون))[3].

میتا فۆر بەدیهێنانی شێوازی نوێی ژیان دەگەیەنێ بۆیە ( ڤنگشتاین ) دەڵێ : ((داهێنانی دەربڕینێ واتە داهێنانی شێوازێکی نوێ لە ژیان ))[4].

یەکێك لە بەکارهێنانە گرنگەکانی میتا فۆر پڕکردنەوەی فەرهەنگی وشەیە لەبەرئەوەی ((فەرهەنگی زمانێك چەند دەوڵەمەندو پڕ بێت، هێشتا بۆشایی گەورە بەخۆیەوە دەبینێ و هەرگیز ناتوانێت پێشەکی پێشبینی هەموو ئەو بارانە بکات کە دنیای دەوروبەرو مێشکی مرۆڤ دروستی دەکەن. ئەم بارە ناتەواوەی فەرهەنگ بەزۆری بەوە پڕدەکرێتەوە کە کەرەسە فەرهەنگی بووە کە بێنین و واتای نوێی بکەین بە بەرا بەکەڵك وەرگرتن لە دەورو بەری زمانی و نازمانی.

کەڵکێکی تری میتا فۆر لەوەدایە کە واتا حەرفییەکەی دەربڕینەکە ناسڕێتەوە و لە ناو نابات، واتە نەك هەر واتای نوێی و ڕەوان دەهێنێتە ناو زمانەکەوە، بەڵکو لە زۆربەی بارەکانیشدا سامانە فەرهەنگییە بنەڕەتەکەش دەپارێزێ، چونکە لێکدانەوەی واتای میتا

---

(١) د. کامل حەسەن بەسیر، زاراوەی کوردی،ل ٣٢ – ٣٣.

(٢) عەلائەدین سەجادی، خۆشخوانی،ل ٥١ – ٥٢.

(٣) بيتر مونز، ( و ) صبار سعدون، حين ينكسر الغصن الذهني،ل ١٧٩.

(٤) ياكوب كورك / ( و ) ليون يوسف و عزيز عمانوئيل، اللغة في الأدب الحديث،ل ١١٣.

فۆری وشـەو دەربـڕین لـە زۆر بـاردا بەگەڕانـەوە بـۆ لێکدانـەوەی واتـا حەرفییـەکانی وشـەو دەربڕینە کۆنەکە دەکرێ. بـەکارهێنانی میتـا فـۆر و کـارکردنی لەسـەر بنەمایـەکی ئـابووری دەبێ، چونکە ناکرێ بۆ هەموو بارێکی نوێ وشـەیەك یـان دەربڕینێکـی نـوێ دروسـت بێـت. ئـەگینا ئـەرکێکی تـەواو گـران دەکەوێتـە سـەر مێشکی مـرۆڤ و فەرهـەنگی بـیری هێنـدە بڵاودەبێت کە ڕێگە لە فێربوونی زمانەکە دەگرێ.

کەواتە میتا فۆر ئامرازێکی بەهێزە، هەرکاتێ بمانەوێ بارێکی نوێ بدۆزینـەوە یـان ڕوونی کەینەوە یان وەسفی بکەین، توانای ئەوەمان دەداتێ کە باری نوێی لـە چوارچێوەی وشەو دەربڕینی کۆندا لێك بدەینەوە، چوارچێوەیەك کە ئاشنایین پێی و لێ ی دەزانین )).[1]

گرنگی دانی زمانەکانیش بە میتا فۆر بۆ دوو هۆی سەرەکی دەگەڕێتەوە : –

(( أ– بـوونی گـوتنی میتـا فـۆری بەڕادەیـەکی زۆر لـە زمانـدا و تەنانـەت لـە قـسەی ڕۆژانەشدا.

ب– پەیوەندی میتا فۆر بە چەمکی ناڕێزمانێتی و یاسا زمانییەکان و داهێنان لە زماندا))[2].

زمـان لـە ژیـانی بەکارهێنـەرەکانی دابـڕاو نییـە. (( ئـەو یاسـایانەی کـە بڕیـار لەسـەر بڵاوبوونەوەی دیاردە زمانییەکان دەدەن، هەمان ئـەو یاسـایانەن، کـە حـوکم لەسـەر داب و نەریتەکان دەدەن))[3].

زمان بریتی یە لە کۆمەڵە یاسایەك کە قسەکەر بەپێی توانستی خۆی لـە چوارچێوەی ئـەو یاسـایانەدا مەبەسـتەکانی دەگەیـەنێت، (( بـەڵام هەنـدێك جـار شـکاندنی بەشـێك لـەو یاسـایانە (بـۆ نموونـە یاسـای سـیمانتیکی )، دەبێتـە مایـەی گەیانـدنی بیرۆکەیـەکی تایبەتی))[4].

بۆ نمونە : – دیوار بە گوێیە

بێ گومان ئەم دەربڕینە ناوێزەیە، بەڵام دەتوانرێ بەو جۆرە لێك بدرێتەوە : –

دەتوانرێ گوێت لێ بگیرێ لەو کاتەی وادەزانی کەس گوێی لێت نییە.

---

(١) د. بەکر عومەر عەلی، میتا فۆر لە ڕوانگەی زمانەوانییەوە،ل ١٢ – ١٤.

(٢) د. بەکر عومەر عەلی ،میتافۆر لە ڕوانگەی زمانەوانییەوە،ل ٥٣.

( ٣) فردیناند دی سوسور، علم اللغة العام،ل ٢٢٧.

(٤) Fromkin , An Introduction Language , P. ٢٢٤.

بەم جۆرە میتا فۆر کە بە دیاردەیەکی هاوبەش دادەنـدرێت لـەنێوان زمـان و ئەدەبـدا ڕێبازێکی دیکەمان بۆ دانانی زاراوەی نوێباوی کوردی بۆ دیاری دەکـات، زمانـەکان سـودیان لەو شێوازە بۆ پەرەپێدانی زاراوە وەرگرتووە، بە وێنە بە هۆی ئەم ڕێبـازەوە دەکرێ‌وشـە کۆنەکان واتای نوێ وەربگرن، یان لە بوارە جیاجیاکانەوە بگوازرێنەوە بۆ بـوارێکی دیکـەی نوێ و بە واتایەکی نوێ. ئینجا دەکەونە ململانێ یان ئەوەتە بە هەردوو واتا دەمێننەوە یان واتایەکیان بەسەر ئەوی دیکەیاندا زاڵ دەبێت و لە ناوی دەبات، (( هەندێك جاریش واتایـەك بازنەی بەکارهێنانی تەسك دەبێتەوە یان فراوان دەبێـت لـە پاژەکـەی خۆیـەوە بـۆ ناونـانی چەند بوارێکی دیکە ))[1].

میتا فۆر دیاردەیەکی زمـانیی بـڵاوە لـە زۆر شـێوەی گەیانـدنی زمانیـدا دەبینـدرێ : ئاخاوتنی ڕۆژانە، گوتاری ڕۆژنامە، گوتاری دینی، نوسینی ڕۆمان و فەلـسەفی و شـیعرو.... هتد وەك ئەم نموونانەی خوارەوە : –

١– پیاو گورگە.

٢– ڕۆژانی سەخت.

٣– پەپولەی ئارەزوو.

٤– تەنها لە ئاشتیدا خەونەکان باڵ دەگرن.

لە میتا فۆردا وشە بەواتای چەسـپاوی خـۆی بـەکار نایـەت (( ئەگـەر وشـە خـاوەنی واتای چەسپاوو نەگۆڕبێت، هەڵبەت میتافۆر بێ واتا دەردەچێ ))[2].واتای ڕستە کۆی واتای کەرتەکانی نییە بۆ نموونە ڕسـتەیەکی وەك : ( نـەمریم بەچـاوی خـۆم دی ) بـێ واتادەبـێ، ئەگەر لە لێکدانەوەیدا، خۆمان بەکۆی واتای چەسپاو و نەگۆڕی وشەکانەوە خەریك بکەین و بمانەوێ لەم ڕێگەیەوە واتای ڕستەکە بدۆزینەوە.

(( ڕونکردنەوەی میتا فۆریش ئەوە دەسەلمێنێ کە وشە خـاوەنی واتایـەکی نـەگۆڕو چەسپاونییە وەك لە وشەی ( شاخدار ) دا بەدی دەکرێ، دیارە ( شاخدار ) بە واتای بـوونی شاخی گیاندارە، وەك :

١– بەرانێکی شاخداری کڕی.

---

(١) د. علي القاسمي، مقدمة في علم المصطلح،ل ٩٩.

(٢) د. بەکر عومەر عەلی، میتا فۆر لە ڕوانگەی زمانەوانییەوە،ل ٩.

٢- درۆیەکی شاخداری کرد ))[١].

له واتا سازییدا دوو جۆر واتا هەیە :

١- واتای دەرەوە : - مەبەست ئەوەیە کە وشەکە پەیوەندی بە دەرەوەی زمانەوە هەیە بۆ نموونە وشەیەکی وەك : - ( گوڵ ) بە واتای ( ڕووەك ) ئاماژەیە بۆ ڕووەك لەدەرەوەی زمان، واتای دەرەوە یان کەسە یان شوێنە یان ڕووداوە یان گیانلەبەرە.

٢- واتای ناوەوە : - بریتییە لە پەیوەندی وشەیەك لەگەڵ وشەکانی دیکەی زمان (( بە شێوەیەکی گشتی واتای هەر وشەیەك، پەیوەندی بە واتای وشە کانی دیکەی زمانەوە هەیە))[٢]. بە شێوەیەك لە شێوەکان، واتا ئەو پەیوەندییەی وشەکان لەگەڵ یەکتریدا دروستی دەکەن ئەمە پەیوەندی بە کەس و ڕووداو و شت و دەرەوەی زمانەوە نییە، وە پەیوەندی بە وێنەکەی ناو مێشکەوە نییە، بە واتایەکی دیکە وشەیەکی وەکو ( ورچ ) هەرئەوە نییە، کە هێمایەك بێ بۆ ئاژەڵ، گیانلەبەر، بەڵکو واتاکەی لە پەیوەندی ئەم وشەیە لەگەڵ وشەکانی وەك ( ڕێوی، پڵنگ، شێر، سەگ..... هتد ) دا هاتووە.

دیسان لێرەدا مەبەست هەر وشە نزیکەکانی خۆی نییە، بەڵکو سەرجەم وشەکانی زمان. کەوتمان ( سەوز ) ە بەواتای ( شین ) نییە، ئەمەش پەیوەندی بە کۆمەڵێك شتی دیکەوە هەیە (جل و بەرگ، خانوو، پێڵاو، جانتا، کتێب، دیوار... هتد ). واتە وشەکانی دیکەی زمان، هەندێك لە پەیوەندییەکان نزیکن، هەندێکیان دوورن. ئەو پەیوەندییەی ئێمە مەبەستمانە، بریتییە لەو واتا یەی کە لە پەیوەندی وشەکانەوە لەگەڵ یەکدیدا دێت، پەیوەندییەکە دوو جۆرە ( جێ نشینی و هاونشینی )

١- پەیوەندی جێ نشینی : - بریتییە لە پەیوەندی وشەیەك یان چەند وشەیەك کە بتوانن لە خاڵێکی تایبەتی لە ڕۆنانێکدا جێگەی یەکدی بگرنەوە. پەیوەندی جێنشینی ئەوە نیشان دەدات (( توخمێکی بەکردەوە لە شوێنێکی زنجیری

---

(١) سازان رضا معین، واتاو دەوروبەر،ل ٤٩.

(٢) ر. ل. تراسك، ( و ) : رانیا إبراهیم یوسف، أساسیات اللغة،ل ٥٩.

ئاخاوتنـدا بـە دیارکـەوتووە چ پەیوەندییـەکی لەگـەڵ ئـەو توخمانـەدا هەیـە کـە دەیانتوانی لەو شوێنەدا بێن )).[1]

بە وێنە : – ڕستەیەکی وەك : – ( منداڵەکە هات )

ئەو ڕستەیە لە ڕووی لێك هەڵاواردنی وشەوە، لە دووبەش یان دوو توخم پێکهاتووە، چونکە جێنشینی لە دوو شوێندا دەکرێ، بۆمان هەیە لـەجیاتی وشـەی (( منـداڵ )) وشـەی دیکە وەکو ( ئەو، ئازاد، پیـاو، ماشـێن... )) و زۆر وشـەی دیکـەی، کـە هـەموویان چینێك پێکدەهێنن بخەینەکار، هەروەها دەتوانین لە بریتی وشەی (( هات )) وشـەی دیکـەی وەکـو ((ڕۆیشت، هەڵسا، فڕی.... )) زۆر وشەی دیکـە، کـە لەسـەر یـەك چـینێکی تـر پێکـدەهێنن بخەینە کار.

(( ئەم پێوەندییە لە نێوان ئەو وشانەدا دروسـت دەبـێ کـە دەتـوانن لـە ڕسـتەیەکدا بێن بێ ئەوەی ڕێزمان و سیمانتیکی ڕستەکە تێکبچێ... لـەم پێوەندییـەدا کەرەسـتەیەکی ((هــەبوو )) (موجــود ) لەگــەڵ چــەند کەرەســتەیەکی (( نــەبوو )) (( غــیر موجــود )) بەشێوەیەکی ستوونی سەر هەڵدەدا )).[2]

واتە ئەم وشانە لە خاڵێکدا جێگەی یەکدی دەگرنـەوە یـەکێکیان ئامـادەن و ئـەوانی دیکە ئامادەنین.

٢– پەیوەندی هاونـشینی : – بریتـی یـە لـە پەیوەنـدی وشـەیەکی نـاو ڕسـتەکە لەگـەڵ هەموو وشەکانی دیکەی ناو ڕستەکە کە ئامـادەن (( پەیوەنـدی هاونـشینی )) ئـەوە نیشان دەدا ((کـە ئـەو توخمانـەی لەسـەر زنجـیرەی ئاخاوتنـدا دەکەونـە تەنیـشت یەکتری چ پەیوەندییەکیان بە یەکەوە هەیە )).[3]

(( وشەکان لە ئاخاوتندا، لەبەر بەدوای یەکترهاتنیاندا، چەند پێوەندییەك لـە نێـوان خۆیاندا دادەمەزرێنن کە لەسەر بنەمای تایبەتی و هێڵی و یـەك لایـی زمـان دامـەزراوە، ئـەم تایبەتییە ئەگەری درکاندنی دوو یەکە لەیەك ساتدا نامومکین دەکات و هەربەم هۆیەیش ئەم یەکانە لە زنجیرەی ئاخاوتندا بە دوای یەکتردا ریز دەبن ئـەم پێوەندییـە لـە تایبـەتی هێڵـی

---

(١) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، فەرهەنگی زاراوەی زمانناسی،ل ٢٠٥.

(٢) ڕەحیم قادر سورخی، ڕۆڵی واتا لە پرۆسیی پێوەندییە گشتیەکاندا،ل ١٠٦.

(٣) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، فەرهەنگی زاراوەی زمانناسی،ل ٢٠٦.

بـوون يـان زنجيرەيـی بـوونی زمانـەوە سـەرهەڵدەدات، بەتايبـەت لـە نووسـيندا بـە جـوانی دەردەكەوێ )).[1]

ئازاد نانێكی خوارد

پەيوەندی ( نان ) لەگەڵ ( خوارد )، ئەمانە پەيوەنديیە ڕێزمانيیەكانی ناو ڕستەن.

تێبينی :– ئەگەر لە ريز بوونی وشەكاندا، تەنيا ئاستی ئاسـۆيمان ڕەچـاو كـرد. واتـە هـەر مەرجی ڕێزمانيمان لە ڕستەكاندا پيادەكرد هەڵەی واتـايی دروست دەبـێ يـان ڕسـتەی وەك ئەمانەی خوارەوە دروست دوبێ : –

خانوەكەتان خانووەكەمانی كوشت.

بەردەكە شوشەكەی كوشت.

لەم دوو ڕستەيەدا هەڵەی واتايی بەدی دەكرێت، بەڵام لە ڕووی ڕێزمانيیەوە تەواون.

لە ڕووی واتاييەوە، لە ئاستی واتاسازيدا دەشـێ بڵـێين ڕسـتەی لـەو شـێوەيە هەنـدێ جار دروست نييە، ئەگەر چی لێرەشدا هەنـدێ بۆچـوونيان وايـە، كـە دەكـرێ ڕسـتەی لـە و جۆرەش لە دەوروبەرێكی تايبەتيدا وەك ميتافۆر لێك بدرێتەوە.

لە بەر ئەوەی ئەگەر لە ميتافۆردا ، دوركەوتنەوەی كەرەسەكان لەيەكتری و بەزانـدنی سيما واتاييەكان زۆرنەبێ ، ئەوا ئاسانتر لێك دەردرێتەوە ، بەڵام هەندێك جـار ميتافۆرەكـان لە وجۆرەن كـە دووركەوتنـەوەكان زيـاترن و سـيما واتـايی يـەكان زيـاتر بـەزێنراون ، بۆيـە لێكدانەوەيان دەچێتە ناو پراگماتيكەوە  يان لە چوارچێوەو دەوروبەرە كۆمەڵايتيیەكان لێـك دەدرێنەوە.

لە پەيوەندی ستوونی نێوان كەرستەكاندا ، هەندێ لە ودەربرينانەی كە زۆر دوورن لە يەكدييەوە ،لای هەندێ كـەس بـە تێكـشكاندنی زمـان لـە قەڵـەمی دەدەن ، ئەمـەش ڕاسـت نييە، چونكە لە دەوروبەرێكدا لێكدەدرێنەوە لە بەر ئەوە دەبێ يان دان بە ميتافۆردا بنـێين ، يان وازی لێ بهێنين.

هەر وشەيەك ، كۆمەڵێ كۆدی هەيە بە بەزاندنی يەكێك لە و كۆدانـە ميتـافۆر دروسـت دەبێت ، بۆ نموونـە :ـ (كوشـتن) دەبـێ بـەركارێكی لەگـەڵ دابـێ كـە (گيـان ، ڕوح ) ی لـە بەردابێت ، (زيندوو) بێت، بەڵام بەزاندنی يەكێك لەو كۆدانە ميتافۆر دروست دەكات.

---

(١) ڕەحيم قادر سورخی، ڕۆڵی واتا لە پرۆسيسی پێوەنديیە گشتيیەكاندا،ل ١٠٣.

(( بۆ ناسینەوەی میتافۆر دەبێ بابەتی گوتنەکە دیاربێت ، واتە دەوروبەری زمانی یان نازمانی دەبێ بابەتەکە بخاتە ڕوو ، لە بەر ئەوەی لێکدانەوەی دەق پەیوەندییەکی زۆری بە دەوروبەرەوە هەیە ، بە تایبەتی بە باسی دەقەوەکەوە. لە شیعردا کە باسی مانگو گوڵ دەکەین ، دنیای شیعر ئامادەمان دەکات کە هەندێ بەهای وەك ( جوانی و ناسکیان بدەینێ ، نەك واتای ئەستێرەو و جۆری گوڵ کە لەدەقی ناشیعریدا چاوەڕێ دەکرێن ) ))[1].

لە ئاستی واتای خوازراودا ڕووداوی فیزیکی نامێنێت و هەڵس و کەوتی کارەکە هەر بە واتا ڕوودەدات واتە ، ڕووداوی واتایی دەچێتە جێ ی ڕووداوی فیزیکی بۆ نموونە : ـ

((لەکاری (بڕینەوە) دا چەند دیاردەیەکی فیزیکی بەرجەستە دەکەین لە ڕستەی :ـ

( شیلان دارەکەی بە مشار بڕیەوە )

١- هەبوونی شتێکی بەرجەستە بۆ بڕین (دارەکە)

٢- هەبوونی کەرستەیەکی ( بڕین) بۆ ئەنجامدانی کارەکە، (مشار)

٣- هەبوونی بکەرێکی گیاندارو وزە دار بۆ ئەنجامدانی ڕووداوەکە (شیلان و وزەکەی )

٤- گۆڕینی ڕوخسارو بە جێماوی ئاسەواری بڕینەکە لە سەرشتە بڕاوەکە (دوولەت بوونی دارەکە).

٥- بە خشینی دەنگ لەکاتی بڕینەکەدا.

بەڵام کە دەووترێت : شیلان کێشەکەی بڕییەوە.

هیچ ڕووداوێکی فیزیکی نەچەسپاوە ، بەرکاری کێشەکە ، وەك بەرکاری (دارەکە) نییە هەتا بکەوێتە بەر ڕووداوی فیزیاوی بڕینەوە بە (مشار ))[2].

هەروەها کە دەووترێت : ـ

پەرداخەکەم شکاند.

(شکاند) لەم ڕستەیەی سەرەوەدا کارێکی ڕابردووی تێ پەڕەو، ڕووداوێکی فیزیکی لە ئارادایە ، کە شکاندنی پەرداخەکەیە.

بەڵام کە دەووترێت ، (ڕۆژووەکەم شکاند) ، هیچ ڕووداوێکی فیزیکی لە ئارادانییە.

---

(١) د. بەکر عومەر عەلی، میتا فۆر لە ڕوانگەی زمانەوانییەوە،ل ٤٢.

(٢) د. شێرکۆ بابان، ڕێزمانی پاشگری دووپاتیی (( ەوە ))،ل ٨٠ – ٨١.

لە بواری زارەوە سازیدا پاشگری (ین) دەچێتە سەر وشەی سادەی (زێڕ) دەبێتە (زێڕین) کە بۆ هەمووئەو مادانە بەکاردەهێنرێت کە لە (زێڕ) دروست کرابێ ، جگە لەوەش ئەوانەی کە ئاو زێڕیش کراون ، یاخود هەندێ جار بۆ ڕەنگی زەردیش بە کاردێت وەك : ـ قژی زێڕین.

( زێڕین) وەکو میتافۆر ،جگە لە مادەش بەکاردێت ، وەك : ـ

بە وشە زێڕینەکانت دڵم کراوەیە.

میتافۆر تارادەیەکی فراوان لە دەربڕینە ئاوەڵناویەکاندا بەرچاودەکەوێت ، بە وێنە:ـ

وشك : واتای ڕاستەقینەی پێچەوانەی تەڕە.

بەڵام کە دەڵێین : ـ مرۆڤێکی وشکە.

(وشك) لێرەدا بە واتای بابەتی خۆی بە کارنەهاتووە ، مەبەستمان ئەوەیە کە کەسێکی دوورە پەرێزو بێ سوودە.

(( قورس : واتای ڕاستە قینەی سەنگین بەرانبەری سووك.

بەڵام واتا خواستراوەکەی بۆ کەسێکی لە سەرخۆو بە حورمەت بەکاردێت )).[1]

گۆشت پیس : ـ کەسێك کە برینی درەنگ چاك دەبێتەوە.

گۆشت خۆش : ـ کەسێك کە برینی زوو چاك دەبێتەوە.

سەربەتاڵ : ـ واتای حەقیقی دەفری بێ سەرپۆش.

واتا میتافۆریەکەی پیاوی نەزان و بێ ئاوەز.

دەم سپی : ـ واتا خوازراویەکەی ( خێرخوای خەڵك).

دەم ڕەش: ـ بە واتای مەجازی بە کاردێت بۆ کەسێ کە شتی چاك نابێژێ.

دەستەواژەی (فیشەکە شێتە) بە واتای باروتی لەکاغەز پێچراو دێت کە منداڵ بۆ یاری بەکاری دەهێنێت ، بەڵام ئەم واتایە خواستراوە بۆ کەسێك کە زوو هەڵدەچێت.

گۆشت تاڵ : — مەبەست ئەوەنییە کە ئەو کەسە گۆشتی تاڵە بۆ خواردن ناشێ، بەڵکو مەبەست کەسێکی ڕەزاقورس و ئێسك گرانە.

ڕوو ڕەش : خوازراوە بەواتای ( مذنب ) کەسێکی خراپەکار یان تاو

زمان درێژ : هارو هاج و قسە لەڕوو.

---

(١) هەژار موکریانی، هەنبانە بۆرینە،ل ٥٦٣.

لووت بلّند : فیز زل.

قسه ڕەق : کەسێك کە ئاخاوتنی ناخۆش دەڵێت.

لووت خوار : تووڕە، ناڕازی، سینە فەراح : – کەسێ کە لێبووردنی هەبێ.

ناوچەوان ترش : ڕووگرژ..... هتد

دووزمان : بەرانبەر (منافق) دێت.

هەروەها جۆرێك لە میتا فۆر لە دەربڕینە ئەدەبیەکانی وەك : ( سلاوێکی گەرم، سلاوێکی بۆندار، گەرمترین پیرۆزبایی، جوانترین سلاو، هەستێکی ناسك، هۆشێکی بەرز، بیرکردنەوەیەکی جوان، ئاوازێکی تاڵ، پرچی شیعر، خەونێکی شیرین، نیگایەکی کوشندە، گوڵی خوێناوی، عەشقێکی خنکێنراو، سۆزێکی بەتین، تەماشایەکی سەحراوی، بۆنی خیانەت، دڵێکی شێتانە، عاشقی بێ دڵ، هیوایەکی باڵ گرتوو، نامەیەکی خوێناوی، ئاهێکی سوتێنەر..... هتد ) دا دەبیندرێ.

- (( لە خوازەدا پەیوەندی لێکچوون، لە نێوان مانای لێخواستراوو بۆ خواستراو هەیە)).[1]

ئەم پەیوەند ییە لێکچونەش بەگەلێك ڕێگا ئەنجام دەدرێ.

(( ١- گونجان لەشێوەوە

نموونە : ملی شوشە

زمانی پێلاو

ددانی میشار

هەموو وشەکانی (مل ، زمان ، ددان ) ئەندامی لەشی مرۆڤن.

لەو شوێنانەدا لێکچونیچك هەیە لە نێوان لێخوازراوەکان و بۆ خوازراوەکان لە ڕووی شێوەوە (مل )، ئەو بەشەی کە سەری ( مرۆڤ و شوشە ) بە لەشەوە دەبەستێتەوە.

٢- بەهۆی ئەرکەوە :-

ئەو منداڵە گەورەی ماڵە – ئیش و کاری گەورەی ماڵ دەکات ))[2].

٣- (گواستنەوەی واتا ، لەناوێکی تایبەتییەوە بۆ ناوێکی گشتی )[3] :-

---

(١) احمد الهاشمي، جواهر البلاغة في المعاني والبيان والبديع،ل ٣٠٢.

(٢) سەباح ڕەشید، هاوبێژی و فرەواتایی لە گیرەکدا،ل ١٧.

(٣)Arnold , English Word ,p.١٣٢.

مەحمود مەڕانی ، خولە پیزە

زۆر لە پاڵەوانانی چیرۆك یان ڕۆمان، کە سیفەتێکی زەقی دیاری دەبێت ( چاك یا خراپ) دەبێتە ناوێکی گشتی و لە هەموو کەسێك دەنرێت، کە ئەو سیفەتەهەڵگرێت.

یان هەندێ سیفەت کە لە چیرۆکێکدا بەرچاو دەکەوێت : –

درکی مەم و زین

وەکو دەربڕینێك بەکاردێت، بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە نێوانی دوو کەس تێك دەدەن. جگە لەمانە، زۆر جۆری دیکەی خوازە هەیە، کە بەهۆی جۆرەکانی ڕەوانبێژی دروست دەبن، وەك:–

## ١–گیان بەبەردا کردن :

جۆرێکە لە میتا فۆر کە تیایدا تایبەتی گیانەوەر دەکرێ بە بەری شتی بێ گیانـدا، هەر لەبەر ئەوەی لەهەندێ باردا لەیەك دەچن : –

١– (( درۆی دەفڕێ ))[1].    ٢– دەستی دەڕوات.

## ٢–تەوس :

هەندێ جار بۆ لێکدانەوەی میتا فۆر، پێویستمان بەوە دەبێ کە بزانین دەربڕینەکە بە تەوسەوە، یان بە پێچەوانەی واتای ئاسایی کەرەسەکەوە بەکار هاتووە.

بۆ نموونە کە دەڵێین : ( پاشەڵێ جوانە )، خوێنەر / گوێگر دەبێ لەوەبگات ( لـە ڕێی دەورووبەرو باری قسەکەوە ) کە کەرەسەی جوان بە تەوسەوە، بە واتایەکی پێچەوانە بەکارهاتووە. واتە (جوان ) لێرەدا بەواتای ( پیس ) یان ( بۆگەن ) دێت. [2]

## ٣–پۆشین :

دروست بوونی هەندێ میتا فۆر لە ئەنجامی ئەوەوە دێ کە لە بەر چەند هۆیەکی کۆمەڵایەتیی، یان دینی، قسەکەر / نوسەر نایەوێ بەزەقی و بە ڕاشکاوی خۆی لە هەندێ لایەنی واتایی کەرەسەیەك بدات.

---

(١) جەلال مەحمود عەلی، ئیدیۆم،ل ٢٦٢.

(٢) د. محەمەد مەعروف فەتاح، دیسان ئیدیەم،ل ١١٧.

((ئەم شاردنەوەیەی هەندێ لایەنی واتایی دەبڕینەکە، بە زۆری لە باسی نەخۆشی و جنس دا دەبێ))[1].

هەروەها ( ئیدیەم ) ە کانیش دەچنە چوارچێوەی میتا فۆر و مانای مەجازیی زمانەوە، زیاتر هەروەك میتا فۆر سەیرمان کردووە، بەڵام لە ژمارەیەك نوسیندا وەك ئیدیەم باس دەکرێت. بەو پێیەی ئەمانە قالبێکیان لە زمان وەرگرتووە.

زاراوەی ( ئیدیۆم – idiom ) کە لە لاتینی وەرگیراوە، نەك تەنیا لە زمانی کوردیدا بەدی دەکرێ، بەڵکو لە هەموو زمانێکی زیندوودا ڕوون و ئاشکرایە، ڕوخسارو مۆرکی تایبەتی‌زمانەکەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە.

زمانەوانان و شارەزایانی زمانی کوردی، ژمارەیەك پێناسەی جیاجیایان بۆ ئیدیەم کردووە، وەك:–

١– ( پێکهاتنێکی ئاڵۆزە، لە شێوەیەکی ئامادەو تێکەڵدا لە زماندا هەیە، کە لە یەککگرتنی هەندێ وشە، واتایەکی تایبەتی پەیدادەبێ، کە لە ماناداا لە وشە نزیك دەبێتەوە )[2]

هەروەها د. ( نەسرین فەخری ) کە ئیدیەم بە درکە ناودەبا، لە ڕوانگەیەکی خوازەییەوە بۆی دەچێت، دەڵێ : –

زۆریشیان نیشانەی لەیەکچوونیان لەگەڵ دایە کە (( وەك )) و (( دەڵێ )) یەو بە ئاسانی دەگێردرێتەوە سەر سەرچاوەی دروست بوونیان.

---

(١) سەرچاوەی پێشوو،ل ١١٦.

(٢) د. ئەو ڕەحمانی حاجی مارف ، وشەی زمانی کوردی ،ل ٥٧–٥٨.

بەم جۆرەش پێناسەی ( ئیدیەم ) دەکات : –

(( ئەوەیە کە ڕاستەو ڕاست ناوی شتێك نەبەی بەڵکو بچی ناوی شتێکی تر ببەی کە پەیوەندی بە مانای یەکەمەوە هەبێت بۆ ئەوەی پیاو لەمانا باسکراوەکە، بۆ مانا مەبەستە هێما بۆکراوەکە بچێ))[1]

دەتوانین پێناسەی ( ئیدیەم ) بەم شێوەیە بکەین : –

ئیدیەم لە دوو وشەی وەك یەك، یا جیاواز، یا لە کۆمەڵێ وشەی پێکەوە گونجاو، یان ڕستەیەك یان پتر پێکدێ کەبەسەر یەکەوە واتایەکی نوێ دەبەخشن، کە جیاوازە لە واتای هەریەکە لەو وەشانە بە جیا، کە ئیدیۆمەکە پێك دەهێنێن. لێرە دا گرنگە ئەوە بزانین، (ئیدیەم ) (( تەنیا لەقسەی ڕۆژانەی خەڵکیدا بەکار نایەت هەروەك زۆر کەس واتێ دەگەن، بەڵکو زۆرجار لەزمانی نووسین و شعرو چیرۆکیشدا بە کاردێت، لەو شوێنانەدا کە پێویست بە کارهێنانی ئەم ئیدیە مانە بکات ))[2].

زمانی کوردی چەند جۆرێك ئیدیەمی تێدایە، کە پەیوەندییان بەو ڕوداوانەوە هەیە،کە لەناو خەڵك و ژیانی ڕۆژانەدا ڕوودەدەن، کە لە ڕێگای تاقیکردنەوەکانی ژیانەوە سەرنجی ڕاکێشاون، هەریەکە یان پۆشراوێکی تێدایە کە دەربڕی شتە قووڵ و ئەزموون کراوەکانی ژیانە.

ئیدیەمەکان، لە زمانی کوردیدا بە پێی مەبەستی بەکارهێنانیان بەسەر چەند گروپێکدا دابەشدەکرێن :–

١– ئەو ئیدیەمانەی، یەك واتا دەبەخشن. وەك : ((پاك و خاوێن، قیت و قۆز، باخ و باخات... هتد)).

٢– ئەو ئیدیە مانەی، پتر لەواتایەك دەبەخشن، وەك : (( زمانی لەدەم دانی یە )). واتای مەجازی ئەم ئیدیەمە، بۆ کەسێك بەکاردێ، کە بێ دە نگ و کربێ و هەروەك زمانی بۆ نەخولقابێ وابێ.

---

[1] نەسرین محەمەد فەخری، هەندێ زاراوەو ئیدیەمەی کوردی لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەیان لە ڕووی زمانەوە،گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات،ژ(١٩)، ل٩٤.

[2] Jennifer Seidl W. Mcmordie , English Idioms ,p.١٣.

((کار لە کار ترازاوە

ئەمە بە کارێ دەوترێ، کە کرابێ و برابێتەوە ))[1]

(( ئەڵێی چاوی قرژاڵە

واتە زۆر ساف و روونە، ئەمەش لە ئەنجامی بینینی چاوی ئەم گانلەبەرە و تاقی کردنەوە یدا گوتراوە.

ئە لێی پێ بە هێلکەدا دەنێ.

بە یەکێك دەووترێ کە زۆر لە سەرخۆو بەسەبر بروا بەرێگە دا.

ئەم هەویرە ئاو زۆر دەکێشێ.

ئەمەش بەقسە یەك دەوترێ کە زۆر قوڵ و بەواتابێ.

ئە لێی پاروی لە دەم دایە.

بە یەکێك دەوترێ کە لە وتەی نەگەی ))[2].

(( ئاگری بن کایێ بوو، نەرمکێ بن کایێ بوون ))[3]

بە یە کێك دەگوترێ کە کارو زیان لەژێرەوە بگەینێ، هەر خەریکی فیتنەکردن و شەڕ نانەوە بێ.

ئەڵێی کەللە شەکرە

بە کەسێك دەوترێ روخۆش و زمان شیرین بێ.

- پوولەکی

بە کەسێك دەگوترێ، کە پول پەرست بێ، واتە پارە پەرست بێ.

هەریەکە لەو ئیدیەمانە کە دەوترێت، مە بەست واتا راستەقینەکەیان نییە، بەڵکو مەبەست واتا خوازەییە کەیانە بە وێنە کە دەوترێت :-

(( دەست درێژ ))

---

[1] محەمەد ئەمین هەورامانی، فەرهەنگی زاراو و ئیدیۆمی زمانی کوردی،ل ٢٧٤.

[2] د. نەسرین محەمەد فەخری، هەندێ زاراوەو ئیدیۆمەی کوردی لێکۆلینەوەو لێکدانە وە یان لەرووی زمانەوە،ل ٧٢.

[3] صادق بەهائەدین، ئیدیە مێت کوردی،ل١٢.

مە بەست ئەوە نییە ئەوکەسە دەستی وەکو ئەندامێکی لەش درێژبێت، بەڵکو بە یەکێك دەوترێ کە دەست بۆشتی خەڵکی درێژ بکات.

– هەندێك ئیدیەم هەن، لە هەمان کاتدا بۆ واتای راستەو خۆویۆ واتای خوازەییش بەکاردێت، بە وێنە :–

(( شوڵی لێ هەڵبڕی )) – مانا راستەوخۆکەی ئەوە دەگەیێنێ (( یەکێك شووڵ لە یەکێك هەڵبڕێ )). بەلأم مانا خوازییەکەی – واتە (( لە تامی دەرکرد، لەڕادەی تێ پەڕاند)).

یاخود ئیدیەمی : ((دۆو دۆشاو تێکەڵ دەکات )) مانا راستەو خۆکەی بە ئاشکرا دیارە، مانا مەجازییەکەشی واتە :– کەسێکی تووڕەو لە سەرە.

(( ئاشی ناگەڕێ ))

واتا ڕاستەوخۆیەکەی واتە : – (ئاشەکەی ئیش ناکات )، بەلأم واتا ناراستەوخۆیەکەی واتا:– ((کاری وەستاوە ))[1].

٣– ئیدیەمە دژەکان : – ئەو ئیدیەمانەن کە لە مەبەستدا دژی یەکن، وەك :–

دەست پاك – دەست پیس

وەجاخڕوون – وەجاخ کوێر

دڵپــاك – دڵ پیس

ڕوو خۆش – ڕوو گرژ

....... هتد

٤ – ئیدیەمە لە یەکچووەکان. وەك : ((دەم شڕ – زمان شڕ – چەنە باز – زۆر بڵێ، دەست کورت – هەژارو نەدار، درێژ دادڕ – زۆر بڵێ ......... هتد )).

٥ – ئیدیەمە کورتەکان. لە دوو وشە یان سێ وشە پێك دێت :–

((متو مووڕو، مانگە شەو، مانگابەکەڵ .... هتد )).

٦ – ئیدیەمە درێژەکان :– لە ڕستەیەك یان پتر پێك دێن : –

((وەك کە لەشێری ناوەخت وایە )).

---

(١) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، وشەی زمانی کوردی،ل ٦٠.

هه ندێكی دیكەش بەشێوەی هۆنراوە دەگووترێت. وەك :

((ڕوو بەڕوو دەم چەور، پاشملە دەم تەور ))[1].

٧ – هیچ وشەیەك لە زمانی كوردیدا، بەقەدەر وشەی (( دەست –دەس ))

(( وشـەی لێكـدراو – ئیدیـەمی لـێ دروسـت نـاكرێ. بـۆ نمونـە (دەسـت خـۆش، دەسرەنگین، دەسڕاست، دەسنوێژ، دەست بڕاو، دەست شكاو، دەست بڵاو، دەست سـوك، دەست گران، دەست بزێـو، دەسـت بـاز، دەسـت گرتنـەوە، دەسەسڕ، دەسـتكرد، دەسـت كردنەوە، دەسگرە، دەسرازە، دەست گرتن، دەست بزێو، دەست باز، دەسمایە،دەسناس، دەسـتە، دەسـكورت، دەسـدرێژ، دەسـت پـاك، دەسـتپیس، دەسـتە، دەسـپانكردنەوە، دەسەلأت، دەستەمۆ، دەستە بەر، دەستە ستوور، دەسڕاگرتن، دەسـتەخۆر، دەسـبەردان، دەسـداگرتن، دەسقوچـاو، دەسـە نـداز، دەسـتوور، دەسـتاڕ، دەسـشۆر، دەستنیـشان، دەسـوپێ، دەسـك، دەسـكەوت، دەسـشۆر، دەسـكەلا، دەسكدەسـك، دەسـگێر، دەسـگیر، دەسـگیراو، دەسەڕۆ،دەستەدان، دەسـارد، دەسـخاو، دەسـهە لكـردن، دەسـلێهە لگـرتن، دەسـلێدان، دەسـلێبونەوە، دەسـبەجێ دەسـكوژ، دەسـبە سـەر، دەسـبە سـەرداگرتن، دەسپێوەنان، دەسبە دەس، دەسە خوشـك، دەسـپێوە گـرتن، سـەر دەسـە، ژێـر دەسـت، بێـدەس، كـەم دەس، بـە دەس، دەسـو بـرد، دەسـدرێژی، دەسـچێن، دەسـتە پـارێز، لـە دەسهەلأتن، لە دەسیدێ )).[2]

بەم جۆرە بۆمان دەردەكەوێت كە (( ئیدیۆم ئەلقەیێكی گرنگی زنجیرەی زمانـە، كـە ئـەمڕۆ بـەڕابردووەوە دەبەسـتێتەوە، بناغـەی دوا ڕۆژیـشمان بـۆ بـەهێز دەكـا، چـونكە زمـان كـە گەیشتە پلەی یاری كردن بەوشەو مەبەستە ئاشـكراكانی و توانـای هەلگێڕانـەوەی ئەمانـەی

---

(١) د. نەسرین محەمەد فەخری، هەندێ زاراوەو ئیدیۆمەی كوردی لێكۆڵنەوەو لێكدانەوەیان لە ڕووی زمانەوە،ل ٨٦.

(٢) تاهیر سادق، ڕێنووس – چۆنیەتی نوسینی كوردی،ل١٢٨ – ١٣٣.

هەبوو بۆ مەبەستێکی نهێنی بە هۆی دەست نانە سەر پەیوەندی نێوانیان ئەو پلەیە ئاوێنەی ڕاستەقینەی بڵند بوونەوەو وردبینی خاوەنە کەیەتی )) [1].

ئەمەش دەوڵەمەندی زمانی کوردی دەگەیەنێ ، کەدەتوانرێت بەهۆی وشەی (دەست) ەوە ، چەندین ئیدیەم دروست بکرێت .

## فـرە واتایی

دیاردەیەکی زمانە، لە زۆربەی زمانەکاندا بە دیدەکرێت، بەڵام ڕادەو چەندێتی بڵاویان لەزمانەکە بەندە بە جۆری زمانەکە، لەرووی چەندێتی پەنابردنە بەر پێشگرو پاشگرو ڕادەی بوونی وشەی یەك برگەیی یان مۆر فیمی لەزمانەکەدا. بوونی فرە واتایی لە زماندا گرنگە، دەبێتە هۆی دەوڵەمەند کردنی زمان و کەمکردنەوەی وشەو زمانەکە لە ئالۆزی دوور دەخاتەوە، ئەرکی دانانی فەرهەنگ و کاری فەرهەنگ نووسی و فێربوونی ئەوزمانەش ئاسان دەکات.

پێناسەی فرە واتایی بەوە دەکرێت :-

(( هاتنی دانەیێکی فەرهەنگی بە زنجیرە یەك واتای جیاوازەوە )) [2]. یان وشەیەك بە ژمارەیەك واتاوە پێی دەوترێ فرە واتایی.

- فرە واتایی ڕێبازێکی دیکەمان لە دانان و ساز کردنی زاراوەی نوێباوی کوردی بۆ دیاری دەکات، بە هۆیەوە دەتوانین واتایەکی دیکە، بەهەندێ وشەی فەرهەنگی بسپێرین و مەبەستێکی نوێ بخەینە سەر مەبەستەکەی پێشوومان و بیانکەین بە زاراوە.

فرە واتایی لە زماندا بە زۆر ڕێگە پەیدادەبێت، وەك :-

١- تەسك بونەوەی واتا :-

تایبەتکردنی واتا گشتییەکەی وشە فەرهەنگییەکەو تەسك کردنەوەی مەبەستە فراوانەکەی و بەکارهێنانی بۆ تەنیا بوارێك لە بوارە کانی بە وێنە :- (( (وشەی ( پاڵاوتە)، بۆ هەموو مادەیەکی (پاڵێوراو ) بە کاردێت، بەهۆی ڕێبازی فرە واتاوە، بووە بەزاراوەیەکی

---

(١) د. نەسرین محەمەد فەخری، هەندێ زاراوەو ئیدیۆمەی کوردی لێکۆلینەوەو لێکدانەوەیان لە ڕووی زمانەوە،ل ٧٢.

(٢) Crystal. D. Adictionary of Lingusticsand phonetics ,p. ٢٠٧.

کیمیاویی و بۆ واتایەکی تایبەتی بەکار دەهێنرێت، کە دەووترێ ( نیشتەی کیمیاوی ) تەنیا بە واتای (راشح کیمیاویی)بەکاردێت ))[1].

٢- فراوان بوونی واتا :-

بەپێچەوانەی واتا تەسك بوونەوەیە، لێرەدا وشەکە بە تێپەر بوونی کات واتایەکی فراوانتر لە واتا فەرهەنگییەکەی پەیدا دەکات و دیاردەیەکی گەورەتر دەگرێتەوە بە وێنە :- ((وشەی ((نووسینگە )) لە بنەرەتدا بۆ واتای شوێنی نووسینەو تەنیا بۆجێگای قەڵەم بەکاردەهێنرێت، بەڵام ئێستا ئەم واتایە فراوان بووەو بۆ مەڵبەندی بەڕێوەبردنی کاروباری میری بەکاردەهێنرێت ))[2]

٣- (( سوود وەرگرتن لە لە یەکچوون و پەیوەندی نێوان وشە فەرهەنگیەکەو زاراوە واتاکەیدا، وەك: وشەی ( ناوك )، کە لەفەرهەنگدا، بە واتای (سرة البطن ) و (بذرة) هاتووە لە فیزیا و کیمیادا بۆ ( ناوکی گەردیلە ) و (ناوکی ئەتۆمی ) بەکاردێت))[3].

هەروەها وشەی (ڕەگ )، کە لە بنەرەتدا بۆ ڕەگی ڕووەك بەکاردێت، بەڵام ئێستا وەکو زاراوەیەك لە ڕێزماندا بەکاردەهێنرێت :- (ڕەگی کار ).

بە هەمان شێوە وشەی ( قەد ) کە لە فەرهەنگدا بۆ ( قەدی دارو درەخت ) بەکاردێت، بۆتە زاراوەیەکی ڕێزمانی (قەدی کار ).

٤- ( گواستنەوەی واتایی :-

بریتییە لەوەی کە وشەیەك لەبنەڕەتدا واتایەکی گەیاندبێت، بەڵام ئێستا وازی لەو واتایە هێناوە، واتایەکی دیکەی وەرگرتووە، ئەمەش دوو جۆرە :-

---

(١) جەمال عەبدول، بەرکوڵێکی زانستە زاراوە سازیی کوردی،ل ١٥.

(٢) د. کامل حەسەن بەسیر، زاراوەی کوردی،ل ٦٠.

(٣) جەمال عەبدول،بەرکوڵێکی زانستە زاراوە سازیی کوردی،ل ١٦.

أ- بەرز بوونەوەی واتا :- لێرەدا وشەکە لە بنچینەدا بارو دۆخێکی خراپی گەیاندووە، بەڵام ئێستا واتایەکی باشتری وەرگرتووە بە وێنە :- ((وشەی ( شۆخ ) کە ئێستا بە واتای (جوان ) دێت لە قۆناغێکی پێشتردا بەواتای ( بێ حەیا ) بەکار هاتووە))[1].

ب - نزم بوونەوەی واتا :-

(( گۆڕانی واتای وشەیەکە، بە تێپەڕبوونی کات ))[2]، کەپێشتر واتایەکی باش یان بێ لایەنی گەیاندووە، بەڵام ئێستا واتایەك وەردەگرێ کە سوکی و ڕسوایی بگەیەنێ.

بە وێنە :- ((وشەی (بۆر ) کەلەوشەی لێکدراوی ( بۆرە زەلام )، ( بۆرەسوار ) دا دەبینرێ لە بنەرەتدا لەواتادا بێ لایەن بووە، بەواتای ئەوەی نە دۆخێکی خراپ و نە دۆخێکی باشی گەیاندووە لە کوردی ئەمڕۆدا واتای وشەکە بەرەو ڕیسوا بوون هاتووە.

چونکە ئەم وشەیە ئێستا بەواتای (( مرۆڤێکی لات و بێ پارەو بێ بەهاوباوەڕ ))دێت))[3].

٥ - بەکارهێنان :-

واتا جیاوازەکانی وشەیەك بەهۆی زۆر بەکارهێنانەوە لەلایەن قسەپێکەرانی زمانەوە دروست دەبێت:-

بەربوون :- ١ - ئاوەکە بەربوو.

٢ - خوێنی لووتی بەربوو.

٣ - پیاوەکە لەسجن بەربوو.

## فرە واتایی لەوشەی فەرهەنگیدا

دیاردەی فرە واتایی مەرج نییە تەنیا لە وشەدا بەدی بکرێ،بەڵکو زۆرجار لەیەکەی گەورەتر ویەکەی بچووکتریش بەدی دەکرێ، لێرەدا باسی واتا جیاوازەکانی وشەی فەرهەنگی دەکەین کە دەق ڕۆڵی گرنگ دەبینێ لە دیاریکردنی ئەم واتایانە دا :-

لەزمانی کوردیدا، دیاردەی فرەواتایی لەناو بەشەکانی ئاخاوتن، (ناو، کار، ئاوەڵناو ) بەرچاودەکەوێت، وەك:

---

(١) محەمەد مەعروف فەتاح، زمانەوانی،ل ١٠٢.

(٢) د. محمد علي الخولي، معجم علم اللغة النظري، ل٦٧.

(٣) محەمەد مەعروف فەتاح، زمانەوانی، ل١٢٤.

**١- فرەواتایی لە (ناو ) دا :**

هەنێك (ناو ) لەزمانی کوردیدا، چەند واتایەك دەبەخشن  کە لەیەك ڕەگەزەوە ڕێچکە یان گرتووە :

**أ – ناوی سادە :-**

( فریشتە :    ١ – بەندەی خودا کە لەئاسمانن

٢ – بریتی یە لە کەسێکی زۆر باش یاخود زۆرجوان )[١]

بەها :    ١ – قیمەت

٢- نرخ

((پشت :    ١- لە دواوە لەشانرا تا سەر ڕان

٢- ئەو دیوی هەرشتێ

٣ – خزمی باوك

٤ – دژ دارو لاگر ))[٢].

**دووەم :- ناوی داڕێژراو :**

کزە :    ١ – شنە، سروە، بای بسکان

٢ – دەنگی داغکردن ( برژاندن )

(( ڕەوان :    ١ – هەرچیەك لە ڕۆیشتندا وەستانی نییە

٢ – خوێندنی بێ گرێ (ئەم کتێبەم رەوان خوێندەوە )

٣ – سك چوون ))[٣]

مالّی :    ١ – کەوی ( کۆترەکە مالّی بووە ).

٢ – شتێ کە لەمالّدا دروست دەکرێ.

جوانی :    ١ – قەشەنگی

٢ – لاوی

---

(١) هژار موکریانی، هەنبانە بۆرینە،ل ٥١٨.

(٢) سەرچاوەی پێشوو، ل٣٠٠.

(٣) سەر چاوەی پێشوو،ل ٣٦٢.

هەڵبەست : ١ – شیعر دانان

٢ – قسە ساز کردن

قەڵە می : ١ – بڕیتییە لە باریك و جوان و ڕێك.

٢ – قسەیەك کە هەمووکەس تێی نەگات.

وردەکار : ١ – مرۆڤی ڕێك و پێك و زانا

٢ – دەست ڕەنگین

٣ – کارو باری بڵاو

(( ئاودار : ١ – شوێنێ کە ئاوی زۆر بێ ( شار بازێڕ وڵاتێکی ئاو دارە )

٢ – میوەی تەڕو تازە کە ئاوی زۆر هەبێ

٣ – خشڵی بەنرخ کەرەونەقی هەبێ

٤ – ڕەنگی بە بریقەو بە ورشە ورش ))[1]

دەستە :– ١ – دەستە کچ، دەستە ژن (وەکو ئاوەڵناو وەسف دەکات ).

٢ – دەستە خوشك، دەستە برا.

هۆنەر : – ١ – کەسێ کە دەهۆنێتەوە

٢ – بڕیتییە لە شاعیر

وەرگێڕ :– ١ – کەسێ کە زەوی یان هەرشتێ ژێرو ڕوودەکا

٢ – بووە بە زاراوە بەرانبەر (پاچڤە کردن ).

سێیەم : – ناوی لێك دراو :

ئەگەر لەڕووی واتاییەوە سەیری ناوی لێکدراوی زمانی کوردی بکەین،دەبینین کە زۆربەیان لەواتایەك زیاتر دەبەخشن، ئەمەش بەڵگەی دەوڵەمەندی ئەو زمانەیە لە بوونی وشەی فرە واتادا.

دووربین : ١ – چاو بەحوکم

(١) عەبدولرەحمانی زەبیحی، قاموسی زمانی کوردی،ل ٨٣ – ٨٤.

٢ – ئامێری دوور نزیك كردنەوە لە بەرچاو.

٣ – دوور ئەندێش

دەمراست : ١ – قسەزان

٢– نوێنەر

((سەرتۆپ : ١ – سەر تۆپی قوماش

٢ – لە جوانیدا یان لە ئازایەتیدا ))[1]

فیلە تەن : ١ – مرۆڤی زەبەلاح

٢ – ئازاو بەكار

بەردەست : ١ – ئەو كەسەی كە لەژێر دەستی یەكێكدا كاردەكات.

٢ – ژوورێكە لەناو ماڵ تەرخان دەكرێت بۆ دانیشتن و كاری ناوماڵ.

٣ – هەرشتێكی لە هاوچەشنەكانی خۆی جیا بكرێتەوە بۆ ئەوەی دەم و دەست سوودی لێ وەربگیرێ.

((بارگرانی : ١ – كەل و پەلی زۆر لە گەڵ خۆبردن

٢ – ئەرك و كاری زۆر خستنە سەر كەسێ ))[2]

چاوڕۆشنی : ١ – مژدەی خۆش

٢ –دیتنی كەسێ یان شتی كە ئارەزوودەكرا.

**٢ – چاوگ : –**

زۆربەی چاوگەكانی زمانی كوردی لەواتایەك زیاتر دەبەخشن بەمەش فەرهەنگی زمان دەوڵەمەند دەكەن : –

هەڵگیرسان : ١ – گڕبەرز كردنەوەی ئاگر.

٢ – بریتیە لە كێشە نانەوە.

---

(١) هەژار موكریانی، هەنبانە بۆرینە،ل ٤٣٥.

(٢) عەبدورەحمانی زەبیحی، قاموسی زمانی كوردی،ل ٢٦٣.

هەڵبزڕکان : ١ – ڕەنگ بزڕکان.
٢ – خراپ بوونی شیر.

((هەڵبڕین : ١ – بڵند کردن.
٢ – کەوتنە شوێن یەکێ بەغار.
٣ – بەتیغ لەتکردنی گوریس و ڕیس.
٤ – گۆڕینی ڕێگەی ئاو ))[1].

گرتنەوە : ١ – قۆستنەوە لە بۆشایی ( تۆپەکەم هەڵدا گرتمەوە ).
٢ – تەرکردن و لێکدان ( دەرمانی بۆ دەگرێتەوە ).
٣ – هاتنەوە جێی شکاو ( دەستی شکاوە دەیگرێتەوە ).
٤ – ڕوانین لەکتێب بۆزانینی چارەنوس ( فاڵدەگرێتەوە ).
٥ – دەست خستنەوەی ڕاکردوو ( ئەسپەکەم گرتەوە ).

وەرگەڕان : ١ – وەرچەرخان
٢ – لە جێ چوونی بەندی ئەندام ( قاچی وەرگەڕاوە ).
٣ – لەدین دەرچووە
٤ – پاچڤە، کاری وەرگەڕان

نانەوە : ١ – بەرپاکردن ( ئاژاوە نانەوە ).
٢ – تەڵە نانەوە.
٣ – دانانی هێلکە ( مریشك نانەوە ).

---

(١) هەژار موکریانی، هەنبانە بۆرینە،ل ٩٨٥.

وەرگێڕان : ١ – ئاوە ژووکردنەوە
٢ – پاچڤە کردن

لێچوون : ١ – پێکچوونی دووشت
٢ – دادانی تەڕایی لەدەفر

کرژبوون : ١– وێکهاتن
٢– توڕەبوون

((کڕکردن: ١– بێ دەنگ کردن
٢– خۆمات دان
٣– بریتی یە لە کوشتنی کەسێ )).[1]

((ئەژنۆ شکان: ١– شکانی چۆك
٢– بێچارە بوون، بێ دەسەلآت بوون)).[2]

هەروەها زۆر لە کارەکانی زمانی کوردی دیاردەی فرەواتا بیان لێ سەر هەڵدەدات،وەك:–

تێچوو: ١– تێکشکاو
٢– لە بەین چوو

دەرچوو : ١– بۆ دەرەوە ڕۆیشتن (تازەلەماڵدەرچوو)
٢– لە ئەزموون سەرکەوت
٣– هەلآت ڕای کرد (تامن بە ئاگاهاتم ئەو بۆی دەرچوو )

هەروەها ئەگەر لە فرمانی ((دەگری )) وردبینەوە،بۆمان دەردەکەوێ کە فرمانی ((دەگری))یەکێکە لەو فرمانانەی کە زۆر واتا لە خۆی دەگرێ،زۆربەیان واتای ((گرتن)) بە چەمکە گشتییەکەی دەگەیەنن،وەك:–

١– گوشین ( پێڵاوەکە پێم دەگری).

---

(١) هەژار موکریانی،هەنبانە بۆرینە،ل ٦١٢.

(٢) عەبدولرەحمانی زەبیحی، قاموسی زمانی کوردی،ل ١٣٦.

٢- بەردەست کردن (دوژمن قەڵاکە دەگری ).

٣- چوونە ناو ( دەچن سەنگەرەکە دەگرن ).

٤- ((جیٚ بوونەوە)) [١] ئەم ژوورە بیست کەس دەگری.

٥- ئەو ئازایە بەرگەی هەموزشتێك دەگری.

٦- حیزب کۆنگرەی دووەمی دەگری.

٧- منداڵەکە گەشکە دەگری

٨- پاسەوانەکە دەرگاکە دەگری.

### ٣- ئاوەڵناو : -

فرەواتایی لە زمانی کوردیدا لەگەڵ بەشە ئاخاوتنی ئاوەڵناو بەرچاو دەکەوێت،بەتایبەتی لەگەڵ ئاوەڵناوی چۆنیەتیدا بەرێژەیەکی فراوان تێبینی دەکرێت، لەتێروانینی دیکسۆن ( حەوت جۆری ئاوەڵناو هەیە )[٢].د. محەمەد مەعروف فەتاح پێی وایە کە (ئەو ناوچە بیریانەی (بارستایی، ڕەنگ،تایبەتی فیزیکی شت، تایبەتی کەسی، خێرایی، تەمەن، بەها )[٣]کە پێویستە وەسفی بکات لە کوردیدا بەقەدئەوەی ئینگلیزی نین، بەڵام بە ورد بوونەوە لەجۆرەکانی ئاوەڵناو لە ڕوانگەی سیمانتیکییەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە ئەگەر هەموو ئەو ناوچە بیریانە سەد لە سەد لە کوردی نەبن و یەکسان نەبن لە رووی زۆریەوە، ئەوا بەشێکی زۆری ئەو ناوچانە دەگرنەوە کە دیکسۆن نەخشەی بۆ کێشاوە،لێرەدا تەنیا هەندیٚ ئاوەڵناو لە هەندیٚ جۆردا دێنین، بزانین دەق تا چەند دەتوانیٚ ڕۆڵی خۆی ببینیٚ لە دیاریکردنی واتای هەر یەکێکیاندا، ئاوەڵناوی تایبەت بە ڕەنگ ڕووبەرێکی فراوان لە فرەواتا پێکدەهێنیٚ، هەر بۆ نموونە ئاوەڵناوی (( ڕەش )) لە کوردیدا لە ژێرکاریگەری دەق بەو واتایانە دێت :-

---

(١) هەژار موکریانی، هەنبانە بۆرینە،ل ٦٨٨.

(٢)Dixon , where have all the adjectives Gone Studies in language, p.١٣٠.

(٣) محەمەد مەعروف فەتاح، هەندیٚ تێبینی دەربارەی ئاوەڵناو لە کوردیدا، گۆڤاری رۆشنبیری نویٚ، ژ(١٢٥)،ل ١٢٥.

١- دەرگاكە ڕەشە (ڕەنگی سپی نەك ڕەش ).

٢- لە بازاڕی ڕەش كاردەكات. ( نایاسایی ).

٣- كوڕێكی هەناو ڕەشە. ( نیەتی باش نییە ).

٤- پیاوێكی دەست ڕەشە، ئیدیۆمی (( دەست ڕەش )) بە واتای پیاوێكی بێخێرە.

٥- ژنێكی ڕەشە ( ناشیرینە، جوان نییە ).

(٦- ڕەشایی داهاتن ( چاوئێشانی بەرەو كوێری چوون ).

٧- ڕەش كوژ :كەسێ كە بێ ئاگا پیاو دەكوژێ.

٨- ڕەش بگیر :- هەموو كەس بۆ شەڕناردن.

٩- ڕەش بەڵەك :- داوەتی ژن و پیاو لە دەستی یەكتردا.

١٠ – ڕەش بین : بێ هومێد، بەدبین ))[١].

هەروەها ئاوەڵناوی (ڕەش ) بە داڕێژراوی یان بە لێكدراوی چەندین واتا دەگەیەنێ :-

ڕشكە : ١- سیاوڵە، دەنكێكی ڕەشی بۆن خۆشە بەنانیەوە دەكەن.

٢- دەفری گەوچن بۆ كاكێشان

٣- جۆرێك ترێی ڕەش

ڕەشكێنە : بیلبیلە.

ڕەشەبا :- بای توند.

ڕەشە خێزان : ماڵ و منداڵ و خێزانی زۆر.

ڕەشۆكی : شتی كەم نرخ.

ڕەشە جوو :- بریتی یە لە جولەكەی پێداگر لە دینی خودا.

ڕەشەك : گیایەكە بۆ دەرمان دەشێ.

ڕەشەمە، ڕەشەمێ، :- سێیەمین مانگی زستان، كاتی جووت بوونی پشیلە.

(( ڕەشەوڵاخ، ڕەشتاڵە، ڕەشەگرانەتا، ڕەشەداڵ، ڕەشماڵ، ڕەشۆڵە )).[٢]

---

(١) هەژار موكریانی، هەنبانە بۆرینە،ل ٣٥٨.

(٢) گیو موكریانی، فەرهەنگی مەهاباد،ل ٣٠١.

هەر بەهۆی دەق و دەوروبەرەوە هەندێك ئاوەڵناوی تایبەت بە ڕەنگ چوار چێوەی سیاسی وەردەگرن، بەوێنە :- هەرسێ ڕەنگی ( کەسك و زەرد و سوور )لە دوای ڕاپەڕین ١٩٩١،ئەم تایبەتمەندییانەیان وەرگرتووە:-

١- ئازاد سەربەلیستی زەردە (پارتییە ).

٢- شێرکۆ لە لیستی کەسك کار دەکات ( یەکێتییە ).

٣- ئەم بەرنامەیە سەربەلیستی سوورە (شیوعی).

ئەو لە لیستی سوورە (شیوعییە ).

هەندێك ئاوەڵناو هەن، لە ژێر کاریگەری دەقدا نەك هەر واتایان دەگۆڕێ، بەڵکو جۆری ئاوەڵناویشیان گۆڕانی بە سەردا دێت، بە وێنە :-

پیاوێکی ڕەقە :- ( ئاوەڵناوی رەق وەسفی شتێکی نازیندوو دەکات بە واتای بە ئاسانی ناڕوخێ دێت ).

وەلامێکی ڕەقە :- ( جوان نییە، ڕێزی تێدا نییە ).

(( ئاوەڵناوی (( وشك )) و (( نەرم )) و (( توند )) و (( تەڕ )) و (( گەرم )) و (( سارد )) و ((سووك )) و (( گران )) و (( گەورە )) و (( بچووك )) و (( خۆش )) و (( کۆن ))...هتد لە ژێر کاریگەری ا وەك ئاوەڵناوی ( ڕەق ) چەندین واتا لە خۆ دەگرن، بەلام لە زۆر باردا دەق ئەو لێڵی و تەم و مژیە ناهێڵێت و زۆر هاوکاری خوێنەر دەکات، کە بە ئاسانی لە واتای ویستراو (wantemeaning ) بگاتە بابەتی کاریگەری دەق لە زیاتر ڕۆشن کردن و دیاری کردنی واتادا. لەم ڕووەوە باس لە هەردوو ئاوەڵناوی ((گران )) و (( گەورە )) دەکەین : -

گران : ١- ئەو بارە گرانە

٢- پیاوێکی گرانە

٣- پرسیارێکی گرانە

( گەورە : ١- پلە و پایەی گەورە بووە

٢- مام بارام گەورەی گوندەکەمانە )).[1]

٣- نەسرین خوشکی گەورەیە. (بەتەمەن ).

(١) سەلام ناوخۆش، زمانناسی و هەندێ بابەتی زمانناسیی کوردی، ل٦٨.

لە کۆتاییدا ئاماژە بەوە دەکەین، کە دیاردەی فرەواتایی لە زماندا خاوەنی سیماو تایبەتمەندییەتی خۆیەتی پێویستە لە دیاردەی هاوبێژی جیا بکرێتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش هەندێ لە زمانناسەبیانییەکان هەوڵیانداوە هەردوو زاراوەی هاوبێژی و فرە واتایی لە یەك جیا بکەنەوە، بەڵام لە زمانی کوردیدا ئەم دیاردەیە بە شێوە یەکی وا بە ناویەکدا چوونە، ناتوانرێت ئەو وشەو فرەیزو رستانەی هاوبێژی و فرەواتایی دروست دەکەن بەبێ بوونی چەند ڕێسایەك بە ئاسانی لە یەکدی جیا بکرێتەوە :-

لەم بارەیەوە زمانەوانان، چەند ڕێچکەیەکیان بۆ جیاکردنەوەیان دیاریکردووە.[1]

**چەند ڕێگایەکی دیکەش هەیە، کە لە گەشە کردن و دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی زماندا، ڕۆڵ دەبینن:-**

١- (( داهێنان ( Inveritio ) : گۆڕینی واتای هەندێ وشەیە، بۆ گەیاندن و سازکردنی چەندین بیرو زاراوەی نوێ، وەك : (( ڕاکێشان ))، بەرانبەر بە (( بردنی کەسێك بۆ دەرەوەی ولآت، لە لایەنی کەسانی ترەوە لە ئێستادا )). یان (( گەلآ))، بەرانبەر بە ((جۆرێك پارەی بیانی، کە سەد دۆلاریی ئەمریکییە )) ))[2].

٢- دەنگداری ( Echoism ) : ئەو وشانەن کە لە دەنگەوە پێکدێن، وەك : گڤەگڤ، لوورە لوور...هتد.

٣- پارچە کردن (clipping ): بریتییە لەو پرۆسەیەی، کە پارچەیەك، لە پێش، یان لە کۆتایی وشەوە وەردەگیرێت و لە جیاتی فۆرمە گشتییەکە بە کار دەهێنرێت، لە ئەنجامدا، فۆرمێکی سەربەست، دروست دەبێت و هەندێ جاریش، دەبێتە بناغە بۆ پێکهێنانی نوێ.

((ئەم ڕێگایە بە کورتکردنەوەش ناو دەبردرێ، وشەی کورتکراوە وCurtailedwordوشەیەکی وەرگیراوە لە یەکێکی دیکە بە ڕێگای کورتکردنەوە وەکو وشەی( doc کە کورتکراوەی doctor) ))[3] ە.

---

(١) فەتاح مامە علی، هاودەنگ لە زمانی کوردیدا،ل ١٨.

(٢) شێرکۆ حەمە ئەمین قادر، مۆرفیمە بەندەلێکسیکی و ڕێزمانیەکان و ئەرکیان لە دیالێکتی گۆراندا،ل١٤.

(٣) د. محمد علي الخولي، معجم علم اللغة النظري،ل ٦٢.

ئەم ڕێگایە لە زمانی ئینگلیزیداباوە، لە کوردیدا تا ئێستا بەرهەمدارنییە.

٤- (( بە هۆی ئەکرۆنیمەوە کە بریتی یە لە لێکدانی برگەی یەکەمی یان دەنگی یەکەمی دوو وشەیان زیاتر و خوێندنەوەیان بە یەکەوە یان وەك دەنگی پیتەکان ))[١].

وەك:-

| | | |
|---|---|---|
| یەکێتی نیشتیمانی کوردستان | ← | ی.ن.ك ، ینك |
| پارتی دیموکراتی کوردستان | ← | پ. د. ك |
| کۆمەڵەی هیڤی کوردستان | ← | ك. هـ. ك |
| پارتی چارەسەری کوردستان | ← | پ. چ. ك، پەچەکە |
| پارتی کرێکارانی کوردستان | ← | پەکەکە |
| حیزبی سۆشیالیستی کوردستان | ← | حسك |

ئەو هۆکارانەی کاردەکەنە سەر گرتنەبەری ئەم ڕێگایە ئەمانەن: -

١- بە هۆی ئاسانی بەکارهێنان.

٢- لە بەرئەوەی خەڵك زۆر حەز لە کورت کردنەوە دەکەن لە قسە کردندا بۆ ئەوەی کەمترین وزەو ماوەی تێدا سەرف بکات.

٥- ڕێگای سەرکاری لە وشەدا:-

ئەم ڕێگایە بریتییە لە لێکدانی دوو وشە یان وشـەیەك و ڕەگـی وشـەیەکی دیکـە، کـە وشەیەکیان لەم پێکهاتەیەدا ڕۆڵی سەرەکی دەبینێـت، واتـای وشـە نوێیـە کـە لـەو بەشـەدا سەرچاوە دەگرێت، وەك :

خەم خواردن، خەفەت بار، شەونخونی.. هتد.

٦- ڕێگای چوونە ناویەك و تێهەڵکێش :-

ئـەویش بریتییـە لـە تێکـەڵکردنی دوو وشــە و پێکهێنـانی واتایـەکی نـوێ، وەك :- مارانگاز، گورگان خواردوو، سەهۆڵبەندان، ڕێبەندان،... هتد.

٧-وەرگرتنی برگەی یەکەمی وشەیەك ولێکدانی لەگەڵ برگەی دووەمی وشەیەکی دیکەدا،وەکو:-

ڕۆڤار ← ڕۆژنامە + گۆڤار.

---

[١] محەمەد مەعروف فەتاح، سەرەتایەك لە زمانەوانی بە کەرەسەیی کوردی،ل ٩٩.

٨- دروست کردنی وشەی نوێ، لە ڕێگای دووبارە کردنەوەی مۆرفیمێکەوە :-

کۆمەڵ کۆمەڵ، دانە دانە، جارجار، کەم کەم،زوو زوو، درەنگ درەنگ،...هتد.

جگە لەو ڕێگایانە چەند هۆکارێکی دیکە هەن، کە دەبنە سەرچاوە یەك، بۆ دەوڵەمەند بوونی فەرهەنگی زمان، وەك :-

## بزوتنەوەی نەتەوەیی و سیاسی

پەیوەندیەکی بەتین، لە نێوان هەستی نەتەوەیی و زمانی نەتەوایەتیدا هەیە. تاوەکو هەستی نەتەوایەتی بە هێز تر بێ، زمانی نەتەوەیی پتر بایەخی پێدەدرێت و بەرەو پێشەوە دەڕوات. بە پێچەوانەشەوە، تا ئەم هەستە لاوازبێ، بایەخێکی زۆر، بە زمانی نەتەوەیی نادرێ و دوادەکەوێ. چونکە، زمانی نەتەوەیی، هەستی نەتەوەیی دەبوژێنێتەوە. بۆیە، بە شێوەیەکی گشتی، ئەوانەی زمانی نەتەوەیی خۆیان نازانن، هەستی نەتەوەیی یان کزولاوازە.

لە قۆناغی سەردەمی، بوژاندنەوەی زمان وکەلتوری نەتەوەییدا دەبینین، لە نێو گەلانی ئەوروپادا، هەستی نەتەوەیی یان لە بوژاندنەوە دابووە. (( بیرو باوەڕی ڕێنیسانس و ئەنجامەکانی بە شێوەی جۆربەجۆر هەستی نەتەوەیی یان لە ناو گەلانی ئەوروپادا ژیاندەوە. چونکە، زمانی نوێ بووە ئامرازێك و ئەو بەرهەمەفیکریانەی پێ دەنووسرا، کە لە بەردەستی جەماوەردابوون)).[1]

لە ناو فەرهەنگی زمانی کوردیشدا بە هۆی بیرو باوەڕی کوردایەتی و هەستی نەتەوەیی و ئازادیخوازی و گیانی فیداکاری و پێشمەرگایەتییەوە بە دەیان زاراوەی نوێ لە دایك بوون، کە پەیوەندییان بە شۆڕش و خەباتی چەکدارییەوە هەیە وەکو زاراوەکانی ( مەشخەڵان، بزوتنەوەی چەکداری، ئازادیخوازی نەتەوەیی، خەباتی چەکداری، خەباتی شاخ، کوردایەتی، خەباتی شار، هەڵگیرسانەوەی شۆڕش، نەتەوەپەرستیی، کۆمەڵانی خەڵك، سەربەستیی، سەربەخۆیی، کەم ژیان، کەڵ ژیان، خوێن ڕشتن، شەهیدانی ئازادی، ژانی گەل، ڕۆژانی سەخت) و چەندین زاراوەی دیکەش کە پەیوەندییان بە ڕووداوە نەتەوەیی و سیاسییەکانەوە هەیە، وەك : ( هەڵات هەڵات، کۆڕەو، ڕاپەڕین، ئەنفال،

---

(١) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، ڕێنیسانس،ل ٨٢.

جینۆسـاید، گـۆڕی بـە کۆمـەڵ، ڕەشـبگیر، زیندەبەچـاڵ، کیمیابـاران، هەرەسـهێنان، ئاشبەتاڵ...هتد ).

هەروەها ئەو زاراوانەی کە پەیوەندییان بـە ڕێکخراووپارتـە سیاسـی یەکانـەوە هەیـە، وەك: (ئەندام،پۆل، شـانە، ڕێکخسـتن، کۆمیتـە، مەڵبەنـد، تیـپ، سـەر تیـپ، لـق، لەشـکر، مەکتەبی سیاسی، دەفتەر، ناوەندی ڕێکخستن، ئەندام پۆل، بەرپرسی مەڵبەنـد، کۆمەڵـەی خوێندکاران، یەکێتی ژنان، یەکێتی لاوان، یەکێتی قوتابییـان، سـەنتەری گەنجان،سـەنتەری هاموون، ئیسلامی سیاسی،...هتد ).

## ڕۆژنامەنووسی

ڕۆڵـی ڕۆژنامـە نووسـی لـە بـواری نوسـین و ڕاژەکردنـی زمـانی کوردییـدا، لـە دوای هـۆنراوەوە دێ. یەکـەم ڕۆژنامـەی کـوردی (( کوردسـتان ))، لـە سـاڵی (( ١٨٩٨ )) ز. دا دەرچوو. لە دوای ئەمەش ئەم ڕێچکەیە هەر بەردەوام بووە.

(( کورد لە مێژووی خۆیدا، لە سەرانسەری کوردستان و لە هەندەران، گەلێ ڕۆژنامەو گۆڤاری ئاشکراونهێنی، تەمەن کورت و درێژ، وێژەیی وڕامیاری دەرکردووە. ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانە، لە هەموو سەردەمەکاندا ڕۆڵێکی گرنگیان بینیوە، ڕاژەیەکی زۆری زمانی کوردیان کردووە ))[1].

ڕۆژنامە نووسانی کورد جگە لە بەکارهێنانی وشەی کوردی ڕەسەن، زۆر جار وشـەی زمانە کانی دیکەی جیهانی و دراوسێشیان، بە کارهێناوە و فەرهەنگی زمـانی کوردییـان پـێ دەوڵەمەند کردووە، لەم بارەیەوە (( هێمن ) دەڵێ :-

(( مێـژووی ڕۆژنامـە نووسـیی ئێمـە، زۆر لـە گـەلانی دەورووبـەرمان بـەجێ نـەماوە ((کوردسـتان )) یەکـەم ڕۆژنامـەی کـوردی کـە لـە سـاڵی (١٨٩٨-١٩٠٢ ) دا بڵاوبۆتـەوە، جیاوازییـەکی ئـەوتۆی لەگـەڵ، ڕۆژنامـەکانی گـەلانی هاوسـێ و دەورووبەرمانـدا نییـە، لـە سەرەتای ڕۆژنامە نووسییەوە، ڕۆژنامە نووسەکانی ئێمەش، وەك ڕۆژنامە نووسەکانی تـورك و فارسیان نووسیوە، پێیان شورەیی نەبووە وشەی بێگانە بەکاربێنن ))[2].

---

(١) حوسێن محەمەد عزیز، سەلیقەی زمانەوانیی و گرفتەکانی کوردی، ل٢٧٤

(٢) هێمن، پاشەرۆك،ل ٢٤.

ئەمڕۆ ڕۆژنامەنوسی لە کوردستاندا خزمەتێکی بەرچاوی زمان و زاراوە سازی کوردی دەکات، بە هۆکارێکی گرنگی لە دایك بوونی زاراوەی نوێ لە هەموو بوارەکانی ژیان دادەندرێت، بۆیە گرنگی دان بە دەرکردنی ڕۆژنامەوگۆڤارەکان، دەرچوونیان بە شێوەیەکی ڕێك و پێك و بەردەوام، بەجۆرێك کە لە توانایدا هەبێت ڕاژەی زمانی کوردی بکات، بە کارێکی گرنگ دادەندرێت.

## بزوتنەوەی ئابوری

فاکتەری ئابوری بە گشتیی و بازاڕی یەکگرتووبەتایبەتی، کارێکی زۆر لە بلاوبوونەوەو پێشکەوتنی زمانەکان دەکەن. کاتێ بازاڕە بچوکەکان یەکدەگرن، بازرگانی پێش دەکەوێ، ڕۆڵێکی گرنگ، لە پێشکەوتنی زمانی نەتەوەییدا دەگێڕێ. ئەمڕۆ لە کوردستاندا، بەهۆی ئەم فاکتەرەوە، چەندین زاراوەی وەك :-

**( هاوردە، هاتوو، دەرچوو، باج، باجی دەوڵەت، ژێرخانی ئابوری، سەرخانی کۆمەڵ، ژمێریاری، بازاڕی سەرمایە داری، باجی خانووبەرە، سەرانەی زەوی و زار، گومرگ،دارایی، کۆمپانیای بازرگانی، موڵکایەتی، بازاڕی ئازاد، کڕین و فرۆشتن، نرخی دراو، سوپەرمارکێت، بانکی مەرکەزی، بانکی ناوەندی، دەستکەوتانە... هتد بەرچاو دەکەوێت و فەرهەنگی زمانی کوردیان دەوڵەمەند کردووە.**

## پێشکەوتنی زانست و تەکنۆلۆژیا

تاوەکو زانست و تەکنۆلۆژیاپێشکەوێ، زمانی نەتەوەیی پتر بلاو دەبێتەوە و پەرە دەسێنێ. بۆ نموونە :- (( کاتێ ئامێری چاپەمەنیی، لە (( ئەڵمانیا )) داهێنرا شۆڕشێکی گەورەی زانیاری، زانستی و کلتوری بەرپا کرد بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی، دەستکەوتێکی گەلێك مەزن بوو))[1].

گەلی کورد هەر لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ، زمانەکەی خۆی پاراستووە، بزوتنەوەی زانستی هۆکارێك بووە بۆ دەوڵەمەند کردنی زمانەکەی، بە وێنە :- کاتێ یەکەم چاپخانە لە

---

(١) حوسێن محەمەد عەزیز ، سەلیقەی زمانەوانی گرفتەکانی زمانی کوردی ،ل ١٥٤.

کوردستان دامەزرا، زمان و کلتوری کوردی بوژاندەوەو پێشی خست، هەربە هۆی بوارە جۆراو جۆرەکانی زانستەوە، چەندین زاراوەی زانستی وەك :-

کار ئەندامزانی،شانەزانی، سێگۆشەکاری، ڕاستەگۆشەکان، جیاکاری، توێکاری، ئەندامزانی، ئەنفلۆنزای باڵندە، نەخۆشییە درمەکان، پزیشکی ڤێترنەری، هۆشیاری زانستی، پاڵنەری دەرەکی، بونەوەرە ئاوابیەکان، وشکاوەکییەکان، پەلەوەرزانی، تەتۆلکە، تەنەسەرئاوکەوتووەکان، بۆماوەزانی، خێرایی ڕوناکی، تەنە تیشکدەرەکان، باسکی هێز، باسکی بەرگر، باڵندە ئاوابیەکان، هێزی بەرگری، هێزی ڕاکێشان، هێزی کێش کردن، مێشکۆڵە، درکەپەتك، دەمارەخانە، دەمارە خاوبوونەوە، کەشەنگبوونی ماسولکە، هەوکردنی مێشك، چڕبوونەوەی خوێن، کۆرپەلەزانی، خوێن بەربوون، پەستانی خوێن، نەخۆشی شەکرە، پیس بوونی ژینگە، ناسازی ئاو، هاری سەگ، خۆپاراستن، پزیشکی میللی، دەردراوەکانی زراو، تورەکەی ئاوی، پالاوتەی مەگنیسیۆم، بەردی گورچیلە، سوڕی ژیان، چەرخی ژیان، شێتی مانگا، کرمی شریتی، سەوزە پلاستید، سەوزەکی...هتد. کەوتوونەتە ناو فەرهەنگی زمانی کوردییەوە.

## توێژینەوەی ئەکادیمی

ڕوناکبیر، نوسەر، پسپۆڕ، لێکۆڵەر، زماننـاس و زمانزانەکانی هەرنەتەوەیەك، دەستێکی بالآیان، لە پێشکەوتن و گەشەسەندنی زمانە نەتەوەییەکەی خۆیاندا هەیە. ئەوان دەتوانن بەشێوەیەکی بەردەوام، بەتوێژینەوەی ئەکادیمییانە فەرهەنگی زمان دەوڵەمەند بکەن. کەڵك لە هەموو دیالێکتەکانی زمانەکەیان وەربگرن، بە وشەی پوخت و پاراو، بە زاراوەی نوێی خۆماڵیی و جیهانی، پتر بە هێزو پاراویبکەن، ڕێزمانێکی یەکگرتوو و ئاسانی بۆ دابنێن، هەوڵبدەن بە هۆکارەکانی ڕاگەیاندن و بلاوکردنەوەو، ئەو زمانە ستانداردەی دەیانەوێ، بە هەموو لایەك بیپێکن و بیچەسپێنن. بەهۆی ئەم توێژینەوانە چەندین زاراوەی وەك :-

پیتاندنی یورانیۆم، چەکی ئەتۆمی، کەناڵە ئاسمانییەکان، دۆسیەی ئەتۆمی، کەشتی ئاسمانی، ژێردەریای...هتد لە دایك بوون.

## ئايين

فاكتەری ئايين، بۆمانەوەو گەشەكردن و بڵاوبوونەوەی زمانەكان فاكتەرێكی بەهێزو گرنگە.

هەر لە كۆنەوە تا ئەمڕۆ، زمانی ئايين و زمانی نەتەوەيی كارێكی زۆريان لە يەكدی كردووە. هەردوو زمانەكە شانبەشانی يەكدی، گەشەيانكردووەو پێشكەوتوون، يان يەكێكيان كاريگەری لەسەر ئەوەی ديكەيان هەبووە. هەردوو زمانەكەش پەيوەندييەكی يەكجار زۆريان بە (( ئازادی، سەربەخۆيی و دامەزراندنی دەوڵەتی ناسيۆنال )) ەوەهەيە.

(( هەندێ لە گەلانی جيهان، بەهۆی ئايين و ئايينزای جياوازەوە، زمانی نەتەوەيی خۆيان پاراستووەو دەوڵەتی ناسيۆنالی خۆيان دامەزراندووە. واتە پێش ئەوەی، دەوڵەتی خۆيان هەبووبێ، زمانی ئايينی يەككرتووی خۆيان هەبووە. وەك جوولەكەكان، لە هەموو كونوقوژبنێكی جيهانەوە، بە هۆی (( تەورات )) ەوە، لە دەوری ئايينەكەی خۆيان كۆبوونەوە، لە ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، دەوڵەتی ئيسرايليان دامەزراندووە و زمانێكی يەككرتووی هاوبەشيان، بۆ خۆيان زيندووكردەوە )).[1]

- عەرەبەكان بەهۆی (( قورئان )) ەوە توانييان، هەموو هۆزەكانی عەرەب، لە نيوە دوورگەی عەرەبدا كۆبكەنەوە و رێكيان بخەن، پاشان لە ژێر پەردەی ئاڵای ئايينی ئيسلامدا دەوڵەتێكی نەتەوەيی ئيسلاميی دابمەزرێنن.

(( مارتين لووتەر ( ١٤٨٣ — ١٥٤٦ ) ی ئەڵمانيش كە داهێنەری ئاينزای پرۆتستانت و پێشەوای بزووتنەوەی چاككردنی ئاينی ديانێتی ( واتا كاتۆليكی ) يە، پاش ئەوەی ئينجيلی لە لاتينييەوە وەرگێڕايە سەر شێوەی ئەڵمانی ی ساكسی، كە تا ئەو حەلە تەنيا لە ديوەخانەكانی ئەميرەكانی ساكسدا بەكاردەهێنرا، توانی سەرنجی خەڵكێكی زۆر بۆ ئەو ئينجيلە رابكێشێ و هەربەهۆيەوە شێوەی ساكسی بوو بە زمانی ئەدەبی ی هەموو ئەوانەی ئەمڕۆ بە ئەڵمانی دەدوون)).[2]

هەندێ لە نەتەوەكان، زمانی ئايينی و زمانی نەتەوەيی يان، هەريەك زمانە، لەم نەتەوانە، زمانە ئايينيەكە راژەی زمانە نەتەوەيی يەكەی كردووە، وەك عەرەبەكان، كە هەر

---

(١) حوسێن محەمەد عەزيز، سەليقەی زمانەوانيی و گرفتەكانی زمانی كوردی،ل ٨٦.

(٢) جەمال نەبەز، زمانی يەكگرتووی كوردی،ل ٨.

دووزمانەکەیان یەك بووە، ئایینی ئیسلام خزمەتێکی زۆر گەورەی زمانی عەرەبی کردووە، لە لەناوچوون و لاوازی پاراستوویەتی، پەرەیپێداوە، بەتەواوی بە هەموو جیهانی عەرەب و ولاّتانی موسولّمان بلاّویکردۆتەوە.

هەندێ نەتەوەی دیکەش هەن، هەردوو زمانە کەیان جیاوازە، زمانی نەتەوەیی یان هەیە، بەلاّم زمانی ئایینی یان لە نەتەوەیەکی دیکەوە وەرگرتووە، زمانی ئەم نەتەوەیە خۆی لە بەردەم کاریگەری زمانە ئایینیەکەدا دەبینێتەوە و وشەو زاراوەی ئایینی تێکەلّ بە زمانی نەتەوەیی دەبێت، وەك کارتێکردنی زمانی عەرەبی، لە زمانەکانی ( تورکی، فارسی، کوردی...هتد ). بە شێوەیەك لە شێوەکان زمانە ئایینیەکە کاری لە زمانە نەتەوەیەکە کردووە.

(( دوای پەیدابوونی ئاینی ئیسلام، عەرەبەکان بەرەو رۆژهەلاّت بلاّوبوونەوە، هەر ولاّتێکیان دەگرت، بێجگە لە ئایینی ئیسلام، زمانی عەرەبیشیان لەکاروباری دەولّەتدا بەکاردەهێناو ئەم زمانە لە رۆژهەلاّتدا بوو بە زمانێکی حوکمڕان )).[1]

- کاتێ کە ئایینی ئیسلام لە ناوچەی کوردستاندا بلاّوبۆتەوە، کارێکی گەورەی کردۆتە زمانی کوردی. لە سەرەتادا لە بەرئەوەی خەلّك لە زمانی ئایینی نوێ تێنەدەگەیشتن، ناچاربوون خۆیان فێری ئەو زمانە نوێیەبکەن، تا هەموو پارانەوەو نوێـژو خواپەرستی یەکیان، بە زمانی عەرەبی بێ. کاتێ، عەرەبە ئیسلامەکان کوردستانیان داگیرکردووە، ئیدی، هەموو ئەو نووسین و شتانەی، بە زمانی کوردی هەبووە، وردە وردە پێچراونەتەوە. زمانی ئایینی نوێ لە پەرستن و پارانەوە، لە خوێندن و نووسیندا، جێی زمانە نەتەوەیی یەکەی گرتۆتەوە، زمانی کوردی تەنیا وەك زمانی ئاخاوتن ماوەتەوە.
- بلاّو بوونەوەی ئاینی ئیسلام، وەکو هەموو گەلانی دیکەی رۆژهەلاّتی ناوەڕاست، کاریگەرییەکی زۆری هەبووە بۆ سەرژیانی مادی و رۆحی خەلّکی کوردستان. لەلایەنی زمانیشەوە (قورئان ) و (زمانی عەرەبی ) کاریگەرییەکی بەرچاویان لە سەر خەلّك و زمانی خەلّکی هەبووە. (( کورد یەکێکە لەو میللەتانەی زۆر لە زووەوە موسلّمان

(١) بارات ئوسمانۆفا، (و) : شوکور مستەفا، لە بارەی چاککردنی زمانی تورکی یەوە، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق،ب٧،ل ٦٠–٦١ .

بووەو لە پێناوی ئیسلامدا شەڕی زۆری کردووەو زانای گەورەی لە بواری نووسینی : فیقە، تەفسیر، کەلام، زمان...تێدا هەڵکەوتووەو کەم دێ هەیە، مزگەوتی تێدا نە بێ، کەچی مەلاکانی کورد بە زمانی کوردی، جگە لە چەن (( عەقیدە نامە)) یەکی کورت وچەن (( مەولودنامە )) یەك، شوێنەواری ئەوتۆ یان بەجێ نەهێشتووە )).[1]

دینی ئیسلام هەندێ ئەرکی تازەی تێدا بوو کە دەبوایە خەڵك وەك پێویستیەکی دینی جێ بەجێیان بکەن، کە لە دینەکەی پێشوویاندا نەبوو، بۆیە دەبوو زاراوەیان بۆ دابنێت، یاخود زاراوەکان لە زمانی عەرەبی یەوە وەکو خۆیان وەربگرن.

بۆیە چەندین زاراوەی ئایینی لە زمانی عەرەبییەوە هاتوونەتە ناو فەرهەنگی زمانی کوردی، وەکو:

(( حەج، زەکات، سونەت، فەرز، کفر، فەتوا، تەلاق، نیکاح،...هتد )). کە پەیوەندییان بەدینی ئیسلامەوە هەیە.

هەندێ جاریش لەبەر ئەوەی، خەڵکی کوردستان زۆر بەیان نەخوێندەوار بوون، بە درەنگ فێری ئەو زمانە بوون، بەتایبەتی زمانی عەرەبی لە (( فۆنەتیك، گرامەر، ئەلفوبێ، ڕێنوس، شێوەی نووسین )) دا، لەگەڵ زمانی کوردیدا جیاوازی هەیە، ئەگەر فێری ئەو زمانەش نەبوبن، ئەو دەقانەی بۆ خودا پەرستیی پێویست بوونە، بێ ئەوەی لێی تێ بگەن، لە بەریانکردووەو وتوویانەتەوە بۆ ئەوەی سەرەتا بە زمانی عەرەبی، شایەتمان وهەندێك سورەتی کورت، وێردو وشە سەرەکییەکانی ئایینی وەك : ((سەلاموعەلەیکوم، بیسمیلا، ئەستەغفیروڵڵا، ئەلحەمدولیلا، ئەعوزوبیللا، ماشەڵڵا، سوبحانەڵڵا، ئەشهەدولیلا، لائیلاهەئیلەڵڵا، کولونە فسین زائقەت ئەلمەوت، ماشەڵلا...هتد)).[2] بچەسپێن و بڵاوببنەوە.

جگە لەوە ئەو زاراوانەی کە لە زمانی مەلاو پیاوە ئاینییەکانەوە کەوتوونەتە ناو فەرهەنگی زمانی کوردی.

هۆکارێکی دیکەی هاتنە ناوەوەی زاراوەی عەرەبی ئایینی بۆ ناوفەرهەنگی زمانی کوردی ئەوەیە کە خوێندن و نووسین لە کۆندا بە زمانی کوردی نەبووە، وەك ئەمڕۆ لە

---

(١) نەوشیروان مستەفا ئەمین، پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن،ل ٢٧٦.

(٢) حوسێن محەمەد عەزیز، سەلیقەی زمانەوانیی و گرفتەکانی زمانی کوردی،ل ٤٣.

کوردستان، بەشێوەیەکی ئەکادیمیانە خوێندن بەڕێوەنەچووە، بەڵکو ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد،لە سەر دەستی مەلاوشێخەکاندا بە زمانەکانی (( فارسی، عەرەبی، تورکی )) خوێندوو یانە. لە مزگەوتەکاندا، لە شێوەی خوێندنی ئاینییدا خۆی نواندووە، بەرهەمەکانیشیان هەر بەو زمانانە نووسیوەتەوەو کاروباری ڕۆژانەی ژیانی خۆشیان پێ ڕاییکردووە.

بۆیە ئەمڕۆ بەسەدان وشەی لە بنجدا عەرەبی کە پەیوەندییان بە دینی ئیسلامەوە هەیە لە زمانی کوردیدا دەبیندرێ، وەك (حەکیم، غەفور، ڕەزاق، کەریم،خالق، ئەڵڵا، نەبی، ڕەسولّ، مەلایکەت، عید،موبارەك، قادر، رحمان، ڕەحیم، شەیتان، عەزیم، جەلال، عەزیز، شێخ، خێر،بەرەکەت، خالید، سوڵتان، جەهەنەم، عەزاب،قەدەر، قەزا، ئەجەل، جەنەت، جن، شێخ،سۆفی، عەبد، حۆری، زیارەت، لوقمان، قازی، شەرع، شەریعەت، زکر، حەلال، حەرام، عەزیز، ڕەمەزان، شەعبان، باتلّ،شەڕ، کوفر، واجب، سوننەت، عیبادەت، قیامەت، دنیا، ئاخیرەت، وەعز، لەعنەت، حیجاب، تەعزیە، شەریك، ئایەت، سورەت، خەطیب، جزم، ختم... هتد ).

- نوسینی کوردی بەسەدان وشەو دەستەواژەو داڕشتنی ئایینی تێخزا،وەك :

( تاریکولسەلات، یومەلحەشر، ئاخرزەمان، ڕۆژی قیامەت، ئەرکانی حەج، فەرزەکانی ئیسلام، مەزهەبی سوننی، مەزهەبی شیعی، تەریقەتی قادری، تەریقەتی نەقشبەندی، مەدینەی منەوەرە، عەزابی دونیا، عەزابی قیامەت، پردی سیرات، ئیسلامەتی، کافری مەجوس، ئیماندار، قەسروجەمع، ئەلحەد، سوڕەتی ئەلفاتیحا، هەروەها چەند دەستەواژەیەکی ئایینی بۆ دەربڕین لەبیرو باوەڕو ئایینی ئیسلام، وەك :- موسوڵمانی ڕاستەقینە، دینداری، خوداپەرستی، نوێژکردن، نوێژی هەینی، بێ باوەڕان، بت پەرستان، ئاگر پەرست، جەژنی قوربان، جەژنی مەولود، جەژنی ڕەمەزان، ڕەحمەتی خودا، غەزەبی خودا، ڕێبازی سۆفیگەری، فەنابوون، دونیای فانی، زیندووبوونەوە، ڕۆژی هەڵسانەوە، جەزای خودا، ڕۆژووگرتن، سوجدە بردن، خەڵاتی یەزدان، موعجیزە نیشاندان، نوێژی جەماعەت، پێش نوێژ، کافر، خوانەناس، خوشکی موسڵمان، برای موسڵمان،خودا هیدایەتدان،...هتد ).

بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێت کە ئاین کارلە زمانی نەتەوەیی دەکات، زمانی ئاین و ئاینزاکان، لە ژیانی گەلان و نەتەوەکانی سەر ڕووی ئەم زەوییەدا هەمیشە وەك چەکێکی دووەم وابووە. هەندێك جار بەهۆی ئاین یان ئاینزایەکی دیاریکراوەوە، زمانی ئەو گەلەیان ئەونەتەوەیە، یەکیگرتووەو پێشکەوتووە.

بەپێچەوانەشەوە، لە مێژووی هەندێك نەتەوەی دیکەدا، ئاین یا ئاینیزا، ڕۆڵێکی گەورەی لە دوولەتکردنی زمانی نەتەوەییدا بینیوە ((سریانەکان هەتا سەدەی پێنجی زایینی، زمانێکی ئەدەبی یەککگرتوویان هەبوو. ئالەم سەدەیەدا، ئاژاوەکەوتە کڵێسەی دیانەکانی ڕۆژهەڵاتەوەو بەوە خەڵکەکە بوون بە دووبەشەوە هەر لەوە شەوە ئاینزای یاقووبی و ئاینزای نەستووری پەیدابوون. ئەمجا وردە وردە، هەرلایە شێوەی تایبەتی خۆی پاراست و پێی نووسی و رق و کینەو دووبەرەکیش دەورێکی ئاگر خۆشکەر انەی نواند بۆ دوورخستنەوەی هەردوو شێوەکە لەیەکتر، بە جۆرێ سریانەکان ئێستا دوو شێوەی ئەدەبی یان هەیە )).[1]

بەمەدا دەردەکەوێت کە ئاین دەورێکی گەورە دەگێڕێ لە دروست کردنی زمانێکی ئەدەبیدا. پێچەوانەی ئەمە هەر ڕاستە. واتا، ئاین دیسانەوە دەورێکی مەزن دەگێڕێ لە دوولەتکردنی زمانێکی ئەدەبیدا.

(( جەلادەت بەدرخان )) دەڵێ :-

(( نەتەوەی ژێردەس بوونی خۆی بە دووشت، بە دووچەك دەپارێزێ : ئاین و زمان )).[2]

نەتەوەی کورد ئاینێکی کوردانەی گشتی نییە، کە هەموو گەلی کورد باوەڕیان پێی هەبێت و کتێبەکەی بە زمانی کوردی نوسرابێتەوە، هەرچەندە لە کۆندا ئایینی زەردەشت هەبووە کە کتێبە پیرۆزەکەی (( ئاڤێستا )) بەزمانی ئاڤێستایی نووسراوەتەوە، بەڵام تاوەکو ئێستا بەتەواوی یەکلانەبۆتەوەکە ئایا ( زەردەشت ) کورد بووە یان نا ؟ جگە لەمەش بەڵگەی تەواو بەدەستەوەنییە کە ئەو زمانەی ئاڤێستای پێ نوسراوەتەوە زمانی مادەکان بووە ئەمە لە حاڵەتێکدا ئەگەر زمانی کوردی ئەمڕۆ بە پاشماوەی زمانی مادەکان

---

(١) جەمال نەبەز، زمانی یەککگرتووی کوردی،ل ٩.

(٢) جەلادەت بەدرخان، بۆ بێ ئەسەر، ئەمرۆپێویستمان بە چی هەیە ؟، گۆڤاری بەربانگ،ژ(٨٧)،ل ٤٥.

دابنێن، هەروەها ئەم ئایینە کوردانەی ئەمڕۆش بواری ئەوەیان نییە ئەم ئەرکە بەجێ بگەیەنن، بۆیە لە بەرگەلێ هۆ، (( ئایین لە نێو کورددا هیچ جۆرە دەورێکی بنچینەیی نەگێڕاوە بۆ دروست کردنی زمانی ئەدەبیی))[1] بۆیە، زۆربەی وشەو زاراوە ئاینییەکانمان لە زمانی عەرەبییەوە وەرگرتووە.

## بزوتنەوەی ئەدەبی

هەرنەتەوەیەك، زمان و وێنەی خۆی بپارێزێ، بەنەتەوەیەکی زیندوو دادەندرێ، نەتەوەی زیندووش، با ئازادیش نەبێ، با لە ژێر دەستی داگیرکەری بیانیشدا بناڵێنێ، ئەو نەتەوەیە هەردەژی، سەردەکەوێ و بەرەو پێشەوە دەڕوات.

لە ناو بەشەکانی ئەدەب کە لە (( شیعر، پەخشان، چیرۆك، پەندی پێشینان، قسەی نەستەق، گوتار، نامە...هتد )) پێکهاتووە، بەتایبەتی شیعر، کارێکی گەورە دەکاتە سەر دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی زمان و داهێنانی زاراوەو دەربڕینی نوێ.

نەتەوەی کورد لە مێژووی خۆیدا، گەلێك شاعیر گەورەو بچووك، ناسراوو نە ناسراوی هەبووە. بۆیە لەوبارەیەوە، ڕۆژهەڵاتناسێکی گەورەی وەك (( مینۆرسکی )) گوتوویەتی : ((هونەری شیعر لە ناو کوردەکاندا زۆر فراوانە )).[2]

دیارە هەر لە کۆنەوە هۆنراوەو زمان، شانبەشانی یەکدی هەنگاویان ناوە. پێبەپێی گۆڕانکارییەکۆمەڵایەتی و رامیاری و پەرەسەندنە ئابوری و پێشکەوتنە کلتورییەکان گۆڕاون. پەیوەندییەکی دیالێکتیکی توند، لە نێوانیاندا هەبووە، پێکەوە بەرەو پێشەوە چوون و گەشەیان کردووە.

لەبەر ئەوەی ئەدەب ئاوێنەی ژیانی گەلە، هەرسەردەمە بیروبۆچوون و شێوە ژیانێکی تایبەت بە خۆی هەیە، بۆیە بە پێی قۆناغ و باری ڕامیاری و دەسەڵات و سەردەم دەگۆڕێت و بەرگێکی نوێ لەبەردەکات، کاریگەریشی لە سەر زمان هەیە بۆیە هەر سەردەمە میللەتی کورد بە پێی بارودۆخ و باری کۆمەڵایەتی ئەدەبێکی تایبەت بە خۆی هەبووە، کە جیاوازە لە وانی دیکە :- لە سەردەمە جیاوازەکانی کۆمەڵگەی کوردەواریدا، بە پێی دەسەڵاتی ئەو میرنشینە کوردییانەی دامەزراون، لە هەر ناوچە و لە کاتێکدا، دیالێکتێ یان

---

(١) جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی،ل ١١.

(٢) مینۆرسکی، (و): حەمە سەعید حەمە کەریم، کوردی و تێبینی و وردبوونەوە،ل ٨٨.

بەشە دیالێکتێکی دیاریکراو، خۆی بە سەر زمانی ئاخاوتن و نووسیندا سەپاندووە، هەربەو دیالێکتەش شاعیرانی کورد شیعریان گوتووە، یەکێك لە وانە، شێوەی سلێمانییە لە دیالێکتی کرمانجی خواروو، کەهەر لە سەردەمی میرنشینی بابانەکانەوە پەرەی سەندووە و تاوەکو ئێستاش هەر بەردەوامە، خەریکە بەرەو زمانێکی ستاندارد هەنگاودەنێت.

لە سەرەتادا شاعیرە کلاسیکییەکانی کورد، بە پێی ئەو تێکەڵاوییەی لەگەڵ نەتەوەکانی دراوسێدا هەیانبووە، هەروەها، بە پێی ئەو سەردەمەی ئەو نەتەوانە، لە کوردستاندا دەسەڵاتیان هەبووە، شیعرەکانی خۆیان، بە زمانێکی تێکەڵاوی (( کوردیی – فارسی، کوردیی –عەرەبی، کوردیی – تورکی )) نووسیووە. بەتایبەتی زمانی عەرەبیی، کارێکی زۆری لە نووسین و زمانی کوردیی کردووە. چونکە قورئان و وتەکانی پێغەمبەر کە زمانی ئایینی ئیسلامن، کاریگەرییان هەبوو، لە سەر بیروهۆشی خەڵك و شاعیرانیش.

بەم جۆرە زمانی عەرەبی بەهۆی ئەدەبەوە کاری کردۆتە سەر زمانی کوردی، ئەدەبی کلاسیکی کە بایەخی زۆری بە وشەو هونەری وشەکاری داوە، ئەدیبانی کورد وشەی عەرەبیان بە تەواوی لەگەڵ زمانی کوردی جۆش داوە لە قالبی هۆنراوە یان ڕستە دایانڕشتووە. ئەم وشانە هەندێکیان وایان لێهات بوون بە بەشێکی زمانە کە هەندێك لە چەمکی ئەو وشانە بە پێی چەرخ و ڕۆژگۆڕان. بە وێنە : وشەیەکی عەرەبی، شاعیرێکی کورد، لە سەدەی پازدەیەمدا لە ناو شیعرەکەی بەکاریهێناوە، هەر ئەم وشەیە لە سەدەی شازدەیەم شاعیرێکی دیکە بە چەمکێکی جیاواز بەکاریهێناوە. هەروەها ((ئەدەبی کوردی لە سەرەتاوە، واتە لەو ڕۆژەوە کە ئەدەبی نوسراومان هەیە، پێوەندییێکی بەهێزی لەگەڵ ئەدەبی فارسی بووە، ئەم پەیوەندی یە بێگومان بووەتە هۆی کارتێ کردن))[1].

ئەم کاریگەریەی زمان و ئەدەبیی فارسی بۆ سەر زمان و ئەدەبیی کوردی دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە لەوسەردەمانەدا شوێنی خوێندنی زانست و ئەدەب لە کوردستان مزگەوت و قوتابخانەی ئایینی بووە.

---

(١) د. محەمەد محەمەد نووری، تەئسیری زمان و ئەدەبی فارسی لەسەر ئەدەبی کوردی، گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات،ژ(١٨)،ل٥٨.

ئەگەر چاوێك بە مێژووی ئەدەبی کوردیدا بخشێنین، دەبینین هەموو شاعیرەکان، لە مزگەوت و قوتابخانە ئاینییەکان خوێندوویانە، لەم خوێندنگایانەدا زمان و ئەدەبیی فارسی لەگەڵ قورئان و زانستە دینییەکان لە هەموو مزگەوت و خوێندنگا ئاینییەکان دەخوێندران.

بەم جۆرە ئەدەبی فارسی کاری کردۆتە سەر هەموو شاعیرە کوردەکان و لە بەرهەمەکانیاندا دیارە.

زۆربەی شاعیرانی کورد جگە لە زمانی کوردی، بە زمانی فارسیش شیعریان نوسیوە، ئەمەش کاریگەری هەبووە لە سەر فەرهەنگی زاراوەی کوردی و بیرو هۆشی مرۆڤی کورد. هەروەها شاعیرانی کورد زۆر جار وشەو زاراوەی فارسی، وەکو : ((موشکی خوتەن، ڕەشکی سەمەن، دوڕی عەدەن ))[1] یان بەکارهێناوە.

یاخود تێکهەڵکێشی شیعری فارسی لە کوردیدا کراوە.

هەروەها وشەی عەرەبی لە لایەن شاعیرانی کوردەوە بەکارهێنراوە، بەو جۆرەی کە لە شیعری فارسیدا بەکارهێنراون، هەندێك جاریش لەگەڵ وشەی فارسیدا لە یەکدراون :-

(( قدوومی قاسد، زیندانی هیجران، ڕەوزەیی جەننەت ))[2]، ئاوی حەیات، حاڵی مەمات، ماهی صەفەر، (( صەفحەی جیهان، بەنی بەشەر ))[3] دواتریش، بەرهەمەکانی خۆیان بەو شێوە زمانە تۆمار کردووە.

ئەمڕۆ لە زمانی کوردیدا چەندین وشەی وەك : ( عەروز، قافیە، بەیت، قەسیدە، غەزەل، شاعیر، شیعر، ئەدەب، ئەدیب، بەلاغە، مەسنەوی، سەجع،...هتد ) بەرچاو دەکەوێت کە بەهۆکاری ئەدەبیی، بەتایبەتی شیعر هاتوونەتە ناو زمانی کوردییەوە.

هەربە هۆکاری ئەدەبیی، ژمارەیەك وشەی فارسی هاتوونەتە ناو فەرهەنگی زمانی کورد ییەوە.

هەروەك پێشتر باسمان کرد، لە هەموو قۆناغەکانی مێژوودا، چ هۆنراوە چ زمان، لە گۆڕانێکی بەردەوام دابوون. بۆیە بەتێپەڕبوونی کات وردە وردە زمانی شیعر پاکبۆتەوە، شاعیرانی کورد، بەرەو کوردی ڕوان نووسین ڕۆیشتوون. لەو ڕێیەشەوە کارێکی زۆری، لە

---

(١) دیوانی بێخود،ل٥٨.

(٢) عەبدولرەحمان بەگی صاحبقران، دیوانی سالم، بڵاوکراوەی کوردی و مەریوانی، ل ٣٨.

(٣) عەبدولرەحمان بەگی صاحبقران، دیوانی سالم، چاپخانەی کوردستان،ل ١١-١٢.

بەشەکانی دیکەی ئەدەب بە تایبەتی و زمانی ئاخاوتن بە گشتی کردووە، بە چەند قۆناغێکی پاکبوونەوەدا تێپەڕبووە.

لە سەردەمی ئەمڕۆشدا، شیعر خزمەتێکی زۆری فەرهەنگی زمانی کوردی دەکات، شاعیرانی کورد ئەمڕۆ بەرگی کۆنی لە کار کەوتووی هونەرییان لە بەر شیعری کوردیی داماڵیوە، جارێکی دیکە سەر لە نوێ، بە بەرگی نوێ و ڕازاوەپۆشتەیان کردۆتەوە. بەهەموو جۆرێ و لە هەموو بوارەکانی ئەدەبیدا، چ لە ڕووی شێوەو چ لە ڕووی ناوەڕۆکەوە، شێوازێکی نوێیان پێڕەوکردووە. شیعری کوردییان لە دەست کۆت و پێوەندی کێش و سەروادا ڕزگار کردووە. گەلێك زاراوەی کوردی نوێیان دۆزیوەتەوە، بە کوردییەکی ڕەوان، بە زمانێکی ئاسان و شیرین، شیعرەکانیان دادەنێن، بە چەندین دارشتن و دەربڕینی تازەو زانستی سەردەم و ڕەمزی جیهانی فەرهەنگی زمانەکەمانیان دەوڵەمەند کردووە.

لە ڕێگای ئەدەبەوە، چەندین دەربڕین و زاراوەی نوێ کەوتوونەتە ناو فەرهەنگی زمانی کوردییەوە، وەك :- ( ئەستێرەی جریوەدار، شەرابی کامەرانی، هەیکەلی یۆنانی، تەلیسمی جوانی، ناڵەی جودایی، ئاسمانی شین، سەخت و گەردن کەش تاسەی دڵداری، گوڵی هیوا، بوکی نیاز، سۆزی عەشق، پەپولەی ئارەزوو، لوتکەی گەنجی، تریفەی مانگە شەو، دەریای بێ سنوور، بەهاری ئازادی، چیا سەرکەشەکان، دڵی شێتانە، خەندەی ئەفسوناوی...).

هەروەها چەندین دەربڕینیی میتافۆریان هێناوەتە ناو دەقە شیعرییەکانیان، .. جگە لەمە بەرهەمە ئەدەبیەکانی دیکەش، وەکو ڕۆمان و چیرۆك و پەخشان و پەندی پێشینان... هتد بە دەربڕینی تازەو دارشتنی وێنەی هونەری جوان و ڕێك و پێك فەرهەنگی زمانیان دەوڵەمەند کردووەو مانای نوێ بەشتەکان دەبەخشن، وەك :- چاوی سێیەم، عەشقێکی خنکێنراو.

# پەندی پێشینان

پەندی پێشینان چەند ماناو مەبەستێکی تازە دەبەخشێ (( پەند ڕستەیەکی کورت، یانیمچە درێژو پڕ ماناو مەبەستە، سادەو ڕەوان و خۆ مالّی یە، شێوەو وێنەی ئاسایی یان گرتۆتە خۆیان، بەلاّم لە بەرگ و کالاّیەکی بەرزو جوان و پڕ بە پێستی بابەتەکە، هەموو لایەنەکانی کۆمەلاّیەتی و زانیاری و ئەدەبیان تێدا بەدی دەکرێ.

پەندی پێشینانی هەرگەلێك بەسەرهات و بۆنەو چیرۆك و سەرگوزشتەیەکی تایبەتی هەیە))[1]

پەندی پێشینان ڕۆلێکی گەورە دەبینێ لە دەولّەمەند کردنی فەرهەنگی زمان، جگە لە ئامۆژگاری، هەریەکەیان واتامەبەستێکی تازە دەدات بە قسە پێکەرانی زمان وەکو بەلگەیەك بۆ بەهێزکردنی بیروڕاکانیان دەیانهێننەوە.

- لە ڕووی گەیاندنی واتاوە پەندی پێشینان جیاوازیان هەیە، بە وێنە:-

١- پەند هەیە واتای وشەیەك دەگەیەنێت، وەك :-

ئەسپێ لە باخەلێدا سەوزە لە خانم دەلّێ.

(( واتە کەسێکی (لاتە) یان ( هەژارە ) ))[2]

٢- هەروەها پەندی واش هەیە، کە زیاتر لە مەبەستێك بە دەستەوە دەدات، وەك :-

کەس وشیشی لە دوو ناکات.

ئەم پەندە چەند مەبەستێکی هەیە، یان بە چەند واتایەك لێك دەدرێنەوە:-

١- کەس گولّ لە پەرێزیدا نادۆزێتەوە، لە ئیش پاکی چونکە (وشی ) بە واتای گولّ چنینەوە دێت.

٢- چاوبرسی و بێ کەلکی و دەست نوقاوی، دەبەخشێ.

٣- لە بەرناشیرینی، هیچ ئافرەتێك مەلۆکانی بۆ ناکات بەشارا (گیشە )، واتە کەس مەلۆی بۆ نانێتەوە.

---

(١) شێخ محەمەدی خالّ، پەندی پێشینان،ل ١٠.

(٢) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، وشەی زمانی کوردی،ل ٥٩.

٤- ئەم پەندانە، هەندێکیان لە هەمان کاتدا، دەتوانرێ بەواتا ڕاستەقینەکەی و واتای مەجازیش لێك بدرێتەوە، وەك :-

(( نان بۆ نانەوا، گۆشت بۆ قەساب ))[1] واتا ڕاستە وخۆکەی ئەم پەندە ئاشکرایە، واتا مەجازی یە کەش واتە ((هەرئیشەو دەبێ بە وەستای خۆی بدرێ )).

ئاویان بە جۆگەیەکدا ناڕوات.

واتا مەجاز یەکەی ئەم پەندە ئەوەیە :-

واتە دوو کەس بەیەکەوە ناگونجێن.

- ئاو بڕوات، زیخەکەی دەمێنێ.

واتای یەکەمی ئەم پەندە ئاشکرایە، کە ئاو لە پاش ئەوەی لە شوێنی خۆی دەڕوات بۆ شوێنێکی دیکە، زیخەکەی بەجێ دەمێنێ، بەڵام واتا مەجازییەکەی ئەم پەندە ئەوەیە :-

واتە پیاوی گەورەو خزمەت گوزار، لە دوای مردنیشی ناونیشانی هەر دەمێنێ.

هەندێ پەندی پێشینان بە شیعر وتراون و واتای مەجازی لە بوارێکی کۆمەڵایەتیدا دەدەن، جگە لە واتا ڕاستەقینەکەی خۆیان، وەك :-

ئەگەر بایەو ئەگەر بارانە،

بۆ کەچەڵ هەر زریانە.

واتای مەجازی ئەم پەندە بۆ یەکێکە کە لە هەموو سەرێکەوە زیانی پێبگات.

هەندێك جار شاعیرێك دێت و ئەم پەندانە کۆدەکاتەوە و دەیانخاتە چوارچێوەیەکی شیعری گونجاوەوە، وەك :-

(( لە هەموو هەورێ باران نابارێ

ڕازکەوتە زارێ، ڕاست کەوتەشارێ )). [2]

- پەندی پێشینان ڕەنگدانەوەی باری کۆمەڵایەتیی ئەو گەلەیە، کە ئەم پەندانەی تێدا بەکاردێت، واتا و مەبەستی تازە دەبەخشێت بە ڕووداو دیاردەکانی ناو خەڵك، بە وێنە ئەگەر سەیری پەندە کوردییەکان بکەین، دەبینین زۆربەیان باسی ئەو دیاردانە

---

(١) شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان،ل٤٤٥.

(٢) پەندەکانی پیرە مێرد، فائق هۆشیار،ل ٤.

دەكەن كە لەناو كۆمەڵی كوردەواریدا هەیە، وەك ( ئاو، ڕووبار، جۆگە، سەپان، گاوان، باووباران، شاخ و كێو، مشك، جەواڵ.. ).

## وەرگێــڕان

وەرگێڕان : (( واتە گوازتنەوەی زاراوەی بیانی بۆ زمانی كوردی بە واتاكەی نەك بە بێژەكەی، وەرگێڕ لە زمانی كوردیدا بە دوای بێژەی بەرانبەر ئەو چەمك و واتایەدا دەگەڕێت كە هەمان واتای زاراوە بیانیەكە بدات یان كوردی چی ناونانێك لەم چەمك و وشەیە دەنێت كە زاراوە بیانییەكەی بۆ دانراوە، دوای ئەوەی دەیدۆزێتەوە بە پلەی گونجان و نەگونجانی لەگەڵ چەمكە بیانییەكە لە هەموو لایەنێكەوە دەكۆڵێتەوە ئینجا بەكاری دێنێت)).[1]

بە هۆی ڕێبازی وەرگێڕانەوە، چەندین زاراوەی نوێ هاتۆتە ناو زمانی كورد ییەوە، وەكو:-

| | | |
|---|---|---|
| جەژنی لە دایك بوون | : | Birthday party |
| جەژنی ماڵئاوایی | : | Good bye party |
| ڕۆژی دایك | : | Mothers day |
| بە گشتی كردن | | تعميم |
| ڕۆژی خۆشەویستی | : | ڤالانتاین |
| نەتەوەیەكگرتووەكان | | الامم المتحدة |
| ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست | : | شرق الاوسط |
| خود ئەڤینی | | نرجسية |
| تاكگیر | : | مۆنۆیزم |
| گرێ بەندی كۆمەڵایەتی | : | العقد الاجتماعي |
| كەمەند كێشكردن | : | جذب |
| پەرەسەندن | : | تطور |
| هەقبێژی | : | ئەبستمۆلۆژیا |
| كۆماری ئامانجەكان | : | جمهورية الغايات |

---

(١) محەمەد وەسمان، گیرو گرفتەكانی زاراوە دانان لە زمانی كوردیدا،ل ٦٠.

| | | |
|---|---|---|
| خەواندنی موگناتیسی | | تنويم المغناتيسي |
| جەنگی کەنداو | | حرب الخليج |
| وێستگە | | محطة |
| هەوالگری | | الاستخبارات |
| مانگی دەستکرد | | قمرالاصطناعي |
| جەنگی سارد | : | حرب باردة |
| خاچی سوور | | صليب الاحمر |
| جەژنی کرێکار | | عيد العمال |
| رۆژی ژنان | | يوم المرأة |
| رۆژی منداڵان | | يوم الطفل |

هەروەها وەرگێڕانی ئەو زاراوانەی کە پەیوەندییان بە چەمکە فەلسەفی یەکانەوە هەیە، وەك :-

| | | | |
|---|---|---|---|
| (( رێژەیی | | النسبيه | Relativism |
| سەندیکایی | | النقابيه | Unionism))[1] |
| (( پێشگەرای | : | القبليه | Apriorism))[2] |
| (( بزوتنەوەی رۆشنگەری: حركه التنوير | | | Enlightenment ))[3] |

لە بواری راگەیاندنیش دا، چەندین زاراوە وەرگێڕ دراوەتە سەر زمانی کوردی، وەك :-

رۆژنامەی ناوەخۆیی    صحف محليه : Localpapers

ئەو رۆژنامەو گۆڤارانەی لە ناوەخۆی وڵات یان ناوچە یان شارێکدا دەردەچن و بڵاودەبنەوە. ئەم بڵاوکراوانە لە دەرەوەی وڵاتاندا دابەش ناکرێن.

---

(١) محەمەد چیا، فەرهەنگی فەلسەفی،ل ٢٠٠.

(٢) سەرچاوەی پێشوو،ل ١٩٦.

(٣) سەرچاوەی پێشوو،ل ١٩٣.

حريه الصحافه : ئازادیی ڕۆژنامەوانی ((Liberty of press [1]

(( تصميم هونەرکاری Layingout

اخراج دەرهێنانی هونەری Layout )) [2]

(( سلطة رابعة : دەسەلاتی چوارەم Fourthestate )) [3]

هەروەها لە بواری زمان و ئەدەبیشدا، چەندین زاراوە وەرگێڕدراوە، بۆ زمانی کوردی، وەك:-

(( وێنە خوازی ( لە ئەدەبدا ) Imagism [4]

وێنە خواز Imagist ))

(( ئەدەبناسی Literatuology)) [5]

(( هونەری شیعر Poetics )) [6]

(( پەخشانە شیعر Lepoemeenprose )) [7]

(( زمانزان : Linguist

پسپۆڕی زمانەوانی: Linguistic

زانستی زمان : Linguistics )) [8]

وەرگێران بە هۆکارێکی گرنگی پەرەگرتنی پەیوەندی کلتوری، کۆمەلایەتی و سیاسی ولاتی ئێمە لەگەلّ ولاتانی دیکەی جیهان دادەندرێت، نەخشێکی دیاری لە دەولەمەند کردنی زمانی کوردیدا هەیە.

---

(١) بەدران ئەحمەد حەبیب، فەرهەنگی زاراوە گەلی ڕاگەیاندن،ل ٩٦

(٢) سەرچاوەی پێشوو،ل ٩٤.

(٣) بەدران ئەحمەد حەبیب ،فەرهەنگی زاراوە گەلی ڕاگەیاندن،ل ٧٩.

(٤) بەختیار سەجادی، محەمەد مەحمودی، فەرهەنگی شیکارانەی زاراوەی ئەدەبی،ل ١٨٥.

(٥) سەرچاوەی پێشوو،ل ١٨٧.

(٦) سەرچاوەی پێشوو،ل ١٩٢.

(٧) د. موحسین ئەحمەد عومەر، فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی، ل٧٠.

(٨) بەدران ئەحمەد حەبیب، فەرهەنگی زاراوە گەلی ڕاگەیاندن،ل ٩٧.

پێویسته له وەرگێرانی زاراوه بۆ سەر زمانی کوردی چەند بناغەیەك پەیرەو بکرێت،

وەك :- ١- بوژاندنەوەی زاراوەی دێرین.

٢- خۆ دوور خستنەوه له وەرگێرانی وشه به وشه.

٣- وردبوونەوه له واتای زاراوه وەرگێراوەکه.

٤- خۆنەبەستنەوه به دیاردەی زاراوه هاوواتاییەکان.

٥- وەرگێرانی زاراوه به گوێرەی پێویست.

بەم جۆره بۆمان دەردەکەوێت که : (( وەرگێران هۆییەکه بۆ دەوڵەمەند کردنی زمان و پەرەپێدانی و هاوچەرخایەتی کردنی، چونکه وەرگێران پاڵ به مرۆڤەوه دەنێت، که به دوای وشه و زاراوەی نوێ و بۆ چوونی نوێ بگەڕێ ))[1].

- هەروەها هەندێ دیارده که له ناو کۆمەڵدا سەر هەڵدەدەن، ناوێکی تازەیان بۆ دا دەندرێت، وەك :-

ئەو دیاردانەی پەیوەندییان به دەسەڵاتی سیاسییەوه هەیه، ناوێکی تازەیان بۆ دادەندرێت، وەك (هێزی R.R (تالانکەر)، هات و نەهات، کولەمەرگی، نەمری و نەژی، حکومەتی هەربێنه...هتد، ئەو دیاردانەی پەیوەندییان به دەسەڵاتی سیاسییەوه هەیه:

- هەرەسهێنانی شۆرش
- دەستپێکردنەوەی خەبات
- جۆری دەسەڵات :- حوکمی قەرەقۆش ( حوکمێکی نایەکسانی )
- بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات :-

( گەندەڵی )

ئێستا به پێی ئەو دیاردەیه که له دام و دەزگاو جۆری بەڕێوەبردنی کاروبارو، دەسەڵاتی سیاسی، هاتۆتەکایەوه. زاراوەی ( گەندەڵی ) زۆربەکار دەهێندرێت وباسی لێوەدەکرێت .

گەندەڵیی ئیداری

گەندەڵی سیاسی

---

(١) د. کەمال مەعروف، ئەدەبیاتی کلاسیکی و نوێخوازی کوردی،ل ١٢٢.

هەندێ زاراوەی دیکە کە لەلایەن خەڵکی سادەوە دادەندرێت، بەلام نابنە هۆی دەوڵەمەند بوونی فەرهەنگی زمان، زیاتر دەچنە ڕیزی ( ئیتمۆلۆجی میللی ) و بە ڕێگایەکی زانستی داناندرێت، وەك :-

بەداك و باب :- ( ئۆتۆمبیلی بەرەقەم )

تۆزو با ( ئۆتۆمبیلی بێ ڕەقەم )

مۆنیکا، لەیلا علوی، گامێش، فاسۆلیا ...هتد

جگە لەو ڕێگایانە، وشەی نوێ بە ئامادەکراوی بە هۆی یەکێك لەم ڕێگا یان هۆکارانە دێتە ناو زمانی خۆماڵییەوە، وەك :-

## أ- داگیرکردن Invention

زۆر جار بەهۆی ئەوەی وڵاتێك وڵاتێکی دیکە داگیر دەکات، کاریگەری لە لایەن زمانی نەتەوەی داگیرکەرو زمانی نەتەوەی داگیرکراوەوە دەست پێ دەکات. بەمەش هەردوو زمانەکە وشەو زاراوە لە یەکدی وەردەگرن، یان تەنیا زمانێکیان خۆی دەسەپێنێت و زمانەکەی دیکە وشەی لێ وەردەگرێت.بەم جۆرە :-

١- هەروەکو چۆن زمانی نەتەوەی گەلی داگیرکەر کاردەکاتە سەر زمانی گەلی داگیرکراو، زۆر جاریش زمانی نەتەوەی بندەستیش کاریگەری لە سەر زمانی نەتەوەی باڵادەست دەبێت، نموونەی واش دەبیندرێ لە مێژوودا کە زمانی نەتەوەی بندەست، بە سەر زمانی نەتەوەی داگیرکەردا زاڵ بووە.

٢- هاتنە ناوەوەی وشە بۆ زمانی خۆماڵی بە هۆکاری داگیرکردن، ئەگەر بە لێشاو نەبی و نەگاتە پلەی تواندنەوە کار لە دەستوری ڕێزمانی زمان نەکات، ڕۆڵێکی نێگەتیڤی نابێت، زۆر جار زمان ئەو زاراوانە وەردەگرێت و شوێنێك لە فەرهەنگەکەی پڕدەکەنەوە.

ترس لەوەدانییە، وشەی بێگانە بێتە زمانەکەمانەوە، گرنگ ئەوەیە سترەکچەری زمانەکەمان تێکنەچێت، زمانەوانەکانمان، لە وشە داڕشتندا، پشت بە زمانی کوردی ببەستن. زمانی کوردی، بە هۆکاری داگیرکردن، ژمارەیەکی زۆر وشەی کەوتۆتە ناو، هەندێکیان لەگەڵ دەستوری زمانی کوردی گونجاون و بوونەتەخۆماڵی.

### ب- بازرگانی Trade.

پەیوەندی ئابوری و کۆمەڵایەتی زمانێك لەگەڵ زمانانی دیکە دبێتە هۆکاری هاتنە ناوەوەی زاراوە بۆ زمانی خۆماڵی، بە وێنە، زمانی کوردی بە هۆی ئەو پەیوەندییانەی کە لەگەڵ زمانی دراوسێ و جیهانیدا هەیەتی، چەندین وشەی هاتۆتە ناو، وەك :- ( دۆلار، یۆرۆ، حەریر، تمەن، لیرە،...هتد ).

### جـ - هۆکارەکانی جوگرافی

شوێنی جوگرافی کوردستان، وای کردووە کە چەندین وشە لە زمانە دراوسێکانی ( فارس، عەرەب، تورکی...هتد ) وەربگرین.

### د - دۆزینەوەکان Exploration

ئەو دۆزینەوە زانستیانەی کە لە وڵاتانی دیکە ئەنجام دەدرێن و زاراوەی تایبەت بەو بوارانەیان بۆ دادەندرێت، زۆرجار لە بەر پێویستی زمانی کوردی بەو واتایانە لە بواری زانستیدا، ئەم زاراوانە دێنە ناو زمانی کوردییەوە :- مۆبایل، ئەتۆم، لێزەر، تیشکی ئێکس، ئۆزۆن،...هتد.

### و- کۆچکردن Immigration

پەیوەندی کۆچکردن کە لە نێوان وڵاتانی جیهاندا ڕوودەدات، هۆکارێکی دیکەیە، بۆ ئەوەی وشەی زمانێك بچێتە ناو فەرهەنگی زمانێکی دیکەوە. زمانی کوردی بە هۆی ئەو ژمارە کۆچبەرەی کە لە وڵاتە جیاجیاکان هەیەتی، لەم ساڵانەی دواییدا، ژمارەیەکی زۆری زاراوەی ئەو زمانانە، بە تایبەتی زمانی ئینگلیزی هاتۆتە ناو.

هەندێك لەم زاراوانە، شوێنی خۆیان گرتووەو فەرهەنگی زمانی کوردییان دەوڵەمەند کردووە، بەڵام لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین، کە زۆر جار ئەو زاراوانەی کە بە هۆکاری کۆچکردن دێنە ناو زمانی کوردییەوە، بەرانبەریان زاراوەی کوردی ڕەسەن هەیە، بە ئەرکێکی گران بۆ سەر فەرهەنگی زمان دادەندرێت ، چوونکە دەبێتەهۆی دروست بوونی وشەی هاو واتا لەزمانی کوردیدا.

لە کۆتایی دا کورتەی ئەو شێوازانە دەردەخەین کە بەهۆیانەوە زاراوەی (دراوسێ - جیهانی ) دەگوازرێتەوە :-

١- وەرگرتن ( خواستن ) بە واتای گواستنەوەی وشەکە بە بێژەی خۆیەوە بۆ زمانی کوردی، وەك : تەلەسکۆب، عەبا، ئالیار، تەلەفۆن...

٢- (( وەرگێڕان، بریتی یە لە دۆزینەوەی وشەیەکی کوردی، کە هەمان واتای زاراوە بیانییەکە بدات. وەك : مزیع : بێژەر

٣- واتای نوێ بەخشین بە وشەیەك کە لە زمانی کوردیدا هەیە، وەك :-

گەرد : تۆزو خۆڵ

گەرد : ( ڕژە )، ( Atom) ))[1]

گەندەڵی : - خراپ بوونی ناوەڕۆکی ڕووەك

گەندەڵی : فساد الاداری

٤- دانان، یان دروستکردنی وشەیەکی کوردی بە رانبەر بە وشە وەرگیراوەکە. بە داڕشتن و لێکدان...هتد. وەك چەرخەبەرە (العربة )، داڕشتن (الانشاء )، ڕێنوس ( الاملاء ).

٥- داتاشینی وشەی نوێ لە ڕەگی وشەی کوردی یان ڕەگی وشەی کوردی و بیانی :- خێرات خانە، عیلماندن، بەراییەکان، زانکۆ...

هەریەکە لەم ڕێگایانە، لە زمانی کوردیدا، بە شێوەیەك لە شێوەکان سودیان لێ وەرگیراوەو لە بواری خۆیاندا بەکار هێنراون.

---

(١) محەمەد وەسمان، گیروگرفتەکانی زاراوەدانان لە زمانی کوردییدا، ل٥٠.

# بەشی سێیەم
# کێشەکانی زاراوەسازیی کوردی

لەگەڵ ئەوەی زمانی کوردی، لە زمانە زیندوو و دەوڵەمەندەکانە، بەڵام وەك زۆر زمانی دیکە، لە بواری زاراوەسازیدا، دووچاری هەندێ کێشەو گیروگرفت بۆتەوە، وەك:—

## گیرو گرفتە زمانییەکان

### ١- فرە دیالێکتی : ( DIALECTS )

- ئاشکرایە لای شارەزایانی زمان و زماناسی، کە زمانی هەر نەتەوەیەك بە هۆی کۆمەڵێك هۆکاری بابەتی و خۆیەتی، چەند شێوەیەکی هەیە.

سنوری دەسەڵاتی رامیاری وداگیرکەری جیاوازو هۆکاری جوگرافی وهاتووچۆو گواستنەوە و پەیوەندی بازارکاری و کڕین و فرۆشتن و هۆکارە پیشەییەکانی نێو دانیشتوانی نیشتیمانێك پێکهێنەرو دابڕێنەری شێوەکانی زمانن.

زمانی کوردی، چەند دیالێکت و بەشە دیالیکت و شێوازی قسەکردنی جیاوازی هەیە. ئەمانەش دەبنە هۆی دروستبوونی چەندین زاراوەی هاوواتا بۆ مەبەستێك کە ئەمەش بۆ خۆی کێشەیەو ئەو زاراوانە پێویستە یەکبخرێن.

- (( بە گشتی دوو دیالیکتی سەرەکی زۆر پەرەیان سەندووەو لە ڕووی زاراوەو ڕێزمان و ڕووبەری جوگرافی و بەکارهێنانەوە. دەوڵەمەندن و نوسین و نوسینکاریان پێ دەکرێت و لە دام و دەزگاکاندا بەکاردێن کە دەکرێ پەیوەندی نێوانیان بەم هێڵکارییە دیاری بکەین.




ژمارەكانی ناو بازنەكان توخمی زمانین، كە دەشێ هەندێكیان توخمی هاوبەشبن لەگەڵ دوو دیالێكتە دەوڵەمەندەكە، ئەم دوو دیالێكتە هەرچەندە لە ڕووی ڕێزمانەوە زۆر لە یەك نزیكن بەڵام هەندێ تایبەتی زاراوەیی خۆیان هەیە.

لە بواری زاراوە سازیدا پێویستە ئەم دیالێكتانە لە بەرچاو بگیرێن. لە بەرئەوەی دەشێ ببێتە هۆی دانانی دوو زاراوە بۆ هەمان چەمك بۆ نموونە دەشێ بۆ زاراوەی ( صحة) زاراوەی ( تەندروستی ) یان ( ساخلەمی ) بەكاربێت، بەڵام دەبێتە هۆیدووانەیی لە زاراوە داناندا، وەك چەندان و چەندان زاراوەی دیكە))[1].

---

(١) محەمەد وەسمان، گیرو گرفتەكانی زاراوە دانان لە زمانی كوردیدا،ل ٥٢ –٥٣.

## ٢- هاوواتا :-

دیالێکتەکانی زمان وایان کردووە، زمانی کوردی وشەی هاوواتای زۆربێت، تەنانەت لە نێو هەمان دیالێکتدا وشەی هاوواتا زۆرە.

هەبوونی وشەی هاوواتا ئەگەر بۆ زمانی ئەدەبی بواری دەربڕین لە بەردەم ئەدیب و نوسەران بکاتەوە، لە بواری زاراوە سازیدا، کێشەو گرفت دروست دەکات، ئەگەر چەند وشەیەکیان بۆ یەك چەمکی زانستی یان تەکنۆلۆژی بەکاربێت، وەك :-

(( ئاوارە، لانەواز، بێدەر ))[١]؛(شاخ، کێو ) ؛ ( کیژ، کچ ) ؛ (( فرمێسك، ئەشك، ئەسرین، ڕۆندك))[٢]؛ ( دارستان، لێڕ، جەنگەڵ ) ؛ ( کوڕی مام، پسمام ) ؛ ( زڕ دایك، ژنباب ) ؛ ( پلك، پور، میمك، مەت، خالەت ) ؛ ( هاوگیان، هەنەزا )...هتد.

**پێناسەی هاوواتا :-**

**هاوواتا بە شێوەیەکی سەرەکی بریتییە لە :-**

دوو وشە یان زیاتر کە لە واتادا وەك یەك بن.

( ئۆلمان ) بەم شێوەیە پێناسەی دیاردەی هاوواتایی دەکات :-

(( هاوواتایی بریتی یە لەو وشانەی کە لە واتادا یەکن و دەتوانن لە شوێنی یەکدی بێن و لەهەر سیاقێکدا بێت، ئاڵوگۆڕبکرێن ))[٣].

بەپێی چەمکی ئەم پێناسەیە:-

(( هاوواتایی لە زماندا تەنیا ئەو وشانە دەگرێتەوە، کەلەڕووی واتای هۆشەکی و ویژدانییەوە وەکویەکن و قسە پێکەرانی زمانەکەش هەست بە جیاوازی نێوانیان ناکەن بە سەربەستیش دەتوانن لە هەموو سیاقێکدا ئاڵوگۆڕیان پێ بکەن ئەم جۆرەش بە هاوواتای تەواو ناودەبرێت))[٤].

لە ڕاستیدا هاوواتای تەواو لە زماندا زۆر کەمە، ئەگەر هەشبێت بۆ ماوەیەکی کەم بەردەوام دەبێت. کەواتە ئەو وشانەی لە فەرهەنگدا بە هاوواتا دادەندرێن، دەکرێ ناوی

---

(١) تاهیرسادق، فەرهەنگی هاوواتەکانی کوردی،ل١٧.

(٢) سەرچاوەی پێشوو،ل ٢٢.

(٣) ستیفن اولمان، (و): کمال محمد بشر، دورالکلمةفي اللغة،ل ١٢.

(٤) د.تالیب حوسێن، چەند تێبینییەك دەربارەی فەرهەنگی کوردی،ل ١٨٢.

هاوواتای ناتەواو یان نیمچە هاوواتایان لێ بنرێت، چونکە لە واتادا هاوتا (مطابق) نین.بەڵکو جۆرە نزیکی و لێکچوونێکی واتایی لە نێوانیاندا هەیە.

( پالمەر ) ئەوە دوویات دەکاتەوە (کە زۆر گرانە دوو وشەی هاوواتای تەواو لە زمانێکدا هەبن)[1].

لەو پێوەدانگەوە دەوری Context -دەق- لەو بوارەدا زیاتر دەردەکەوێ. بۆ نموونە : ((لەزمانی کوردی دا هەردوو وشەی (جوان، قەشەنگ ) دەتوانن لە ڕستەدا لە بریتی یەکتربێن.

ئازاد کۆشکێکی ( جوانی، قەشەنگی ) کڕی.

بەڵام لە هەمان کات داو لە زمانی کوردی دا دەتوانین، بڵێین ئەمە لە هەموو کاتێکدا ڕوونادات، بۆ نموونە دەتوانین بڵێین :

ئازاد خۆی شاردەوە. ئازاد کتێبەکەی شاردەوە. ئازاد خۆی مەلاس دا..

بەڵام ناتوانین بڵێین * ئازاد کتێبەکەی مەلاس دا))[2].

بەگشتی دیاردەی هاوواتایی لە زماندا پەسەند نییەو یەك زاراوە بۆ مەبەستێك پەسەندو دروستە.

زاراوە بە گشتی بەوە پێناسە دەکرێت، کە کۆمەڵێك هێمای زمانین، ئاماژە بۆ چەندین چەمك و شت دەکەن لە بوارەکانی زانستی یان یەکنۆلۆژی، یان هەروەکو ڕێکخراوی پێوانەیی دەولی دەیناسێنێ بەوەی کە زاراوە هێمایەکە، لە سەری ڕێککەوتوون، بۆ گەیاندنی چەمکێك، لە چەندین دەنگی تێکبەستراو یان لە وێنەی نوسراوی ئەم دەنگانە (پیتەکان) پێك دێت. بۆیە پێویستە دوو مەرجی سەرەکی تێدابێت:-

((١- پێویستە هەرچەمکێك یان شتێك، بەزاراوەیەکی سەربەخۆ دەربڕدرێت.

٢ – زیاتر لە یەك زاراوە بۆ چەمکێك یان شتێك دانەنرێت ))[3].

بەڵام بەگشتی ئەم دوو مەرجە لە زمانی کوردیدا، سەدی سەد لە زۆر زاراوەدا نەهاتۆتەدی، لە بەر ئەوە، زۆر جار دەبینین، یەك زاراوە بۆ چەندین واتای جیاواز

---

(١)Palmar,Semantics,p.٨٩.

(٢) سەلام ناوخۆش بەکر، زمانناسی و هەندێ بابەتی زمانناسی کوردی، ل٣٥ – ٣٦.

(٣) د. علي القاسمي، مقدمة في علم المصطلح،ل ٦٨.

بەکاردێت، کەجۆرێك تەمومژی واتایی دروست دەکات، زمانناسان بەم دیاردەیە دەڵێن هاوبێژی، یان هاودەنگیی و هاوبەشی لە بێژەدا.

بەم جۆرە، دیاردەی هاوبێژی بە گرفتێکی دیکە دادەندرێت، لەو گرفتانەی کە دێنە بەردەم زاراوە سازیی کوردی.

((لە فەرهەنگدا زۆر جار کەرەسەکانی زمان بۆ چەند واتایەکی جیاواز بەکاردێن، جیاوازی بەخشینی واتای هەرکەرەسەیەکیش دەبێتە هۆی ئاڵۆزی و تێکەڵی ئەو واتایە لە لایەن گوێگر یان خوێنەر. بە واتایەکی دیکە هەرکەرستەیەك لە دوو واتا یان زیاتر بگەیەنێ، بەکەرستەیەکی لێڵ دادەندرێت. لێرەدا بۆ ئەوەی چارەسەری واتای وشەبکەین، پێویستە پەیوەندی نێوان فۆرمی وشەکەو واتاکەی ڕوون بکەینەوە، کە لە ئەنجامی هەندێ دیاردەی زمانی لە وشەکاندا ڕوودەدات و دەبنە هۆی لێڵی فەرهەنگی. بۆیە کە دەڕوانینە وشەکانی زمان وەك دانەیەکی واتادار دەبێ ئەو ڕاستییە ڕەچاو بکەین، کە هەر ڕێژەیەك ڕەنگە پەیوەندی بە چەند واتایەکەوە ( هاودەنگ و فرەواتا) هەبێت، هەرهەمان واتاش لە وانەیە پەیوەندی بەڕێژە جیاکانی ترەوە (هاوواتا ) هەبێت))[1].

زۆربەی وشەکانی زمان لە ڕێژەیەك زیاتر دەنوێنن، هەر ڕێژەیەکیش پەیوەندی بە خودی وشەکەوە هەیە، لە بەر ئەوە (( پێویستە جیاوازی نێوان وشەکە خۆی و هەروەها نێوان ڕێژەکەی و واتاکەی بکەین ))[2].

بۆ ئەم مەبەستەش (( ڕێژەی نوسراوی ئاسایی وشەکە بەکاردەهێنین ؛ بەوەی کە وشەکە بنوێنێ وەك دانەیەکی لێکدراو پێك هاتووە لە ڕێژەو واتا ؛ سەرەڕای بەکارهێنانی وشەکە بۆ ئەوەی ڕێژەکەیان واتاکە بنوێنێ ؛ وەك دوو سیمای جیاوازبن لەگەڵ یەکتردا))[3]. بۆ نموونە لە کوردیدا وشەی (بەر١) و (بەر٢) بە دوو وشەی هاودەنگ دادەنرێت ؛ لە بەر ئەوەی لە ڕێژەیەکدا بەشداری دەکەن ؛ ئەویش (بەر) ـە، بەڵام هەردوو وشەکە لە واتادا جیاوازن ؛ (بەر١) بەواتای ( لاوتەنیشتی هەرشتێك ؛ لای پێشەوە ؛ پێش )

---

(١) د. طالب حوسێن عەلی، هەندی لایەن لە پەیوەندی نێوان ڕستەو واتا لە کوردیدا،ل ٥٥.

(٢) جون لاینز، اللغة والمعنى والسیاق،ل ١٩.

(٣) د. طالب حوسێن عەلی، هەندێ لایەن لە پەیوەندی نێوان ڕستەو واتا لە کوردیدا، ل٥٥ — ٥٦.

دێت، بەڵام (بەر٢) بەواتای ( میوەی درەخت و گیاگوڵ ). دێت ؛ هەروەکو لەم نەخشەیەدا ڕوونکراوەتەوە:




بەهەمان شێوە ئەم وشانەی خوارەوە لە کوردیدا دەبن بە هاوبێژ :




---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ٥٦

(٢) جەمال بابان، هەندێك لەو زاراوانەی واتایەك زیاتر ئەبەخشن،گۆڤاری کۆڕی زانیاری،ب٢، بەشی یەکەم،ل ٢٧٧.

ڕان ١ : ئەندامی لەش

ڕان

ڕان ٢ : مێگەل

بار ١ : بارکردن

بار ٢: دیوی شتێك

بار ٣: (( قورسایی شتومەکێ کرابێتە بار

بار ٤: ئازار، ئەزێت، ڕەنج. (( لەش بەباربێ )).[١]

## سەرچاوە بیانییەکان و فرەزاراوەیی

هەندێ لە گرفتەکانی زاراوەسازی ، بۆ گێروگرفتی زمانی سەرچاوە کە زاراوەکانی لێوەر دەگیرێت دەگەڕێتەوە :-

دەشێ سەرچاوەی هەندێ زاراوە، کە هەندێ جار لە ڕێی زمانی عەرەبییەوە دێتە ناو زمانی کوردی، زمانی فەرەنسی یان ئینگلیزی بێت.

هەرچەندە هەردوو زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی هەندێ زاراوە بەکاردەهێنن کەلە بنجدا گریکی یان لاتینین، بەڵام دوو زمانی لێك جیاوازن، شێوازی جیاواز لە دەربڕین بەکاردێنن.

١- لەو کاتەی زمانی ئینگلیزی یان فەرەنسی دوو ناوی جیاواز بۆ هەمان شت یان چەمك دادەنێن، وە لە زمانی کوردیدا هەردوو زاراوەکە وەرگیران بە جیاجیا، ئەوا دوو زاراوەی جیاواز لە ڕووی بنچینەی داڕشتنەوە پەیدا دەبێت، کە ئاماژە بۆ یەك چەمك دەکەن. واتە دوانەیی لە زاراوەدا دروست دەبێت، بۆ نموونە :

(( نایترۆجین NITROJEN لە زمانی ئینگلیزیدا

ئازۆت AZOT لە زمانی فەرەنسیدا )) [٢]

هەمان گاز دەگەیەنن ئەگەر هەردوو وشەکە وەرگیران ئەوا دەبن بە دوو زاراوەی سەربەخۆ بەمەش دوانەیی لە زاراوەدا دروست دەبێت.

---

(١) عەبدولرەحمانی زەبیحی، قاموسی زمانی کوردی،ل ١٨.

(٢) د. علي القاسمي، مقدمة في علم المصطلح،ل ٧٩.

٢- ئەگەر دوو زاراوە هەبن لە تیرەی دارِشتندا هەریەکە جیابێت لەوەی دیکە لە هەمان زمان یان لە دوو زمانی لەیەك جیادا ئەوا دوو زاراوەیی دروست دەبێت، بۆ نموونە :

ئەگەر یەکێکیان لە ئینگلیزی و یەکێکی دیکە لە فەرەنسی وەرگرین، وەریانبگێڕین بۆ زمانی کوردی لە بەرئەوەی لە تیرەی دارِشتندا جیاوازن ئەوا دوو زاراوەی سەربەخۆ دروست دەبێت، وەك :

( کاتژمێری سەرەکی MASTERCLOK ئینگلیزی

کاتژمێری دایك HORLOJEMERE فەرەنسی )[١]

دوو زاراوەی لەیەك جوودامان لادروست بوو بۆ هەمان شت. کە پەیوەندی بە ڕیشەی وشەکەوە هەیە لەم دوو زمانەدا.

زانین و پاراستنی ڕیشەی وشەکان لە کاتی دارِشتنی زاراوەدا سوودی هەیە بۆ ئاسان فێربوون و لەبەر کردنی ئەم زاراوانە، بۆیە پێویستە لە هەڵبژاردنی زاراوەکاندا ئاگاداری فرە سەرچاوەیی زاراوەکان و ڕیشەی زاراوەکەبین لە زمانی سەرچاوە وە، هەڵبژاردنی زاراوەیەك لە تیرەی دارِشتنی ئینگلیزی و یەکێکی دیکە لە فەرەنسی دەبێتە هۆی لە دەستدانی یەکێتی ڕیشەی زاراوەکان.

جگە لەمە، هەتا وەکو ئەگەر زاراوە لە یەك زمانیشەوە وەربگرین لە وانەیە دووچاری گیروگرفت بینەوە بەهۆی :-

١- وشەی هاوواتا لەو زمانەی کە زاراوەی لێوەردەگیرێت، واتە لە زمانی سەرچاوەدا:-

هەبوونی وشەی هاوواتا لەو زمانەی کە زاراوە زانستی و تەکنیکییەکانی لێوە دەگوازینەوە بۆ زمانی کوردی، کێشەیەکی دیکەی زاراوەسازی دروست دەکات. لەکاتی هەبوونی هاوواتاییدا، دەشێ وەرگێڕ نەزانێت ئەم دوو زاراوەیە هاوواتان، بەجیا بۆ زمانی کوردی وەریانبگێڕێت، یان هەردوو وشە هاوواتا کە لە لایەن دوو وەرگێڕ یان زیاتری جیاوازەوە وەربگێڕدرێن، ئەمەش دەبێتە هۆی دروست بوونی وشەی هاوواتا لە زمانی کوردیدا.

٢- وشەی هاوبێژ لە زمانی سەرچاوەدا :- ئەو کێشەیە لە زمانی سەرچاوەدا، دژوارییەکی دیکە دروست دەکات لە دژوارییەکانی گواستنەوەی زاراوە بۆ زمانی کوردی. کە

---

(١) سەرچاوەی پێشوو،ل ٨٠

دەشێ هەروەرگێڕێك بەجۆرێك وەریان بگێڕێت بۆ نموونە (( دەشێ زاراوەی فەرەنسی (PRETEVALVE)

(( هەڵگری دەرەچە )) بێت یان ( کەلێنی دەرەچە ) لە بەر ئەوەی تیژەی (PORTE) هەردووواتا دەگرێتەوە )) [1] :-

((PORTE₁ : هەڵگرە

PORTE₂ : کون، کەلێن ))[2]

## هەوڵە تاکە کەسییەکان :-

زمان گەورەترین بەهرەیە کە ئادەمیزاد هەیەتی ، ئەمەش وای کردووە لە سەرجەم گیانلەبەرانی دیکە جیابێتەوە، دەسەڵاتی بەسەر هەموویاندا بشکێت.

((یەکێك لە گرنگترین ئەو تایبەتمەندییانەی کە زمانی مرۆڤ لە زمانی گیانلەبەرانی دیکە جیادەکاتەوە، توانای داهێنانە، ئەمەش مانای وایە، مرۆڤ لە توانایدا هەیە دەیان و سەدان زاراوەی نوێ بە سەر زاردا بهێنێ، بێ ئەوەی پێشتر بیستبێتی یان گوێی لێ بووبێ))[3].

مرۆڤ جگە لە فێربوونی وشەکانی زمان، فێرە ئەو یاسایانەش دەبێ کە بەهۆیانەوە وشەی نوێباو ڕۆدەنرێ، (( ئێمە هەر لە منداڵی یەوە لەگەڵ فێربوونی وشەکانی زماندا، فێرە ئەو یاساو دەستورانەش دەبین کە وشەیان پێ دروستدەکرێ و دادەڕێژرێ، ئەمەش ڕێگەمان بۆ خۆش و ئاسان دەکات لە تەك وەرگرتنی لە خۆڕاو میکانیکی هەزاران وشەدا، بتوانین بەبیروهۆش لە زمان وردبینەوە، شتی شاراوەی ئاشکرا بکەین و فێری ئەوەبین وەك چەکێکی پێویست بەکاری بێنین...))[4].

---

(١) محەمەد وەسمان، گیروگرفتەکانی زاراوەدانان لە زمانی کوردیدا،ل ٥٦

(٢) د. علي القاسمي، مقدمة في علم المصطلح،ل ٨٤.

(٣) محمد محمد يونس، مدخل الى اللسانيات،ل ٣٤

(٤) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، وشەی زمانی کوردی، ل پێشەکی.

دانان و هاتنەکایەی زاراوەی نویٚ، زمان دەوڵەمەند تر دەکات، دەچێتە سەر خەرمانی ئەو وشانەی کەباب و باپیرانمان بۆیان جێهێشتووین، چونکە بەشێك لە زاراوەکانی زمان ئەوانەن کە خەڵکی ئاسایی دایاننناون. ئاشکرایە باب و باپیرانی ئێمە هەر لە کۆنەوە ئەگەرچی نەخوێندەواریش بوون، سامانێکی باشیان لە زاراوە بەهۆی کاروکاسبی ژیانی ڕۆژانەو باری کۆمەلآیەتییان یان بۆ ئێمە بە جێهێشتووە.(( ئاپۆرەی خەلق کە دێن بەپێی تواناو بۆچوونی زگماکیان وشەی لێکدراو دروست دەکەن بەسەر باریکە ڕێگەی زەقی زمانزانییاندا بەرەو مەبەستی سادەیی ئەو ئەرکە عادەتی یەوە دەزۆن کەمیش وەها دەبیٚ ساتمەی تێدا بکەن چونکە ڕابەریان چرای ناوەکی زمانەکەیانە)) [1].

هەموو زمانێك کلتورێکی دەوڵەمەندی خۆی هەیە لە ناو ئەو کلتورە بەپێی گۆڕانی ژیان چەندین زاراوەی نویٚ سەرهەڵدەدەن، ئەم کلتورە بۆ هەموو داهێنانێکی زمانی دەوڵەمەندە.

بەم جۆرە میللەت خۆی یان جەماوەر دەشیٚ سەرچاوەبیٚ بۆ دروست کردنی زاراوەیزمانی ((بەشی هەرە زۆری موفرەداتی ئەمڕۆی زمانی کوردی ئەو وشە کوردییە ڕەسەنانەن کە لە ناو جەرگەی کوردستاندا هەلقولآون ))[2] زادەو سەلیقەی خۆڕسکی میللەت هێناونیە بەرهەم، بەشێکی دیکەشیان ئەوانەن کە لیژنەی تایبەتی، بۆ نموونە کۆڕی زانیاری دایناون (( لیژنە بە پێی بۆ چوونی خۆی ڕێبازێکی زانستانەی گرتە بەر بۆ دانانی زاراوە، لە مەشدا ڕەچاوی ئەو دەستوورانەی کرد کە لە زمانە پێشکەوتووەکاندا لێرە بە پێشەوە لە دانانی زاراوە پێڕەوی کراون ))[3].

هەروەها دەڵیٚ: (( تاکو ئێستا لە کۆڕی زانیاری کورد ژمارەیەکی زۆر لە زاراوەی کوردی هەڵبژێراون و داڕێژراون))[4].

---

(١) مەسعود محەمەد، زاراوە سازیی پێوانە،ل ٤-٥.

(٢) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، وشەی زمانی کوردی،ل ٣٥

(٣) لیژنەی زاراوە زانستیەکان، زاراوە زانستیەکان، گۆڤاری کۆڕی زانیاری،ل ٤٣٤ — ٤٣٥.

(٤) ئەنجومەنی کۆڕ، لیستەی سێیەمی زاراوەکانی کۆڕ، گۆڤاری کۆڕی زانیاری،ب٢،بەشی دووەم،ل ١٦٩.

بەشێکی دیکەش ئەو زاراوانەن کە کەسانی پسپۆڕو شارەزا لە زانستەکانی سەردەم بەگشتی و زانستی زمان بە تایبەتی، لە پێناو خزمەتکردنی زمانی کوردیدا سازیانکردووە. لێرەدا ئاماژە بە چەند هەوڵێك دەکەین، کە ڕۆڵیان هەبووە لە بواری زاراوە سازی کوردی و هەڵساون بەدانانی کتێب یان فەرهەنگی زاراوە و خستنە ڕووی کێشەکانی زاراوەسازی کوردی و چۆنیەتی دانانیان و چارەسەرکردنیان و، ڕێگا خۆشکردن بۆ دانانی زاراوەی زانستیی نوێباو:—

## (( فەرهەنگۆکی زانستی )) مامۆستا جەمال نەبەز

لە ساڵی ١٩٦٠ دا مامۆستا جەمال نەبەز لە ژێر ناوی ( هەندێك زاراوەی زانستی ) فەرهەنگۆکێکی لە چاپ دا. ( لە ساڵی ١٩٦٠ — ١٩٦١ یشدا بە ڕۆنیۆ سەد دانە یەکی کتێبەکەی کە لە ژێر ناوی (فەرهەنگۆکی زانستی ) دا بوو بڵاوکردۆتەوە )[(١)]

((یەکەمیان نزیکەی سێ سەد زاراوە دەبێت و دووەمیان نزیکەی سێ هەزار زاراوە یەك دەبێت))[(٢)]

مامۆستا لە هەڵبژاردن و سازکردنی زاراوەکانیدا، تا ڕادەیەك ڕێبازێکی زانستی گرتۆتە بەر، بە وێنە لە پێشەکی نامیلکەیەکدا کە لە ژێر ناونیشانی ( هەندێك زاراوەی زانستی ) دایە، دەڵێ:—

(( ووشەکانی ئەم فەرهەنگۆکە ئەکرێت بە سێ بەشەوە :

بەشی یەکەمیان : ئە و ووشانەن کە تا ئێستا لە کوردی دا نەبوون و ناچار بووم دروستیان بکەم، پاش لێ کۆڵینەوە و وردبونەوەیەکی زۆر. ئەم وشانە هەندێکیان بە ئەستێرە(*) نیشانەکراوە.

بەشی دووەمیان : ئەو ووشانەن کە خەڵکی بیستونیان، بەڵام بۆ یەکەم جارە کە بەو مانا زانستیانە بەکار ئەهێنرێن.

---

(١) جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی،ل ١٨.

(٢) د. کامل حەسەن بەسیر، زاراوەی کوردی،ل ١٠٩.

بەشی سێ یەمیان : ئەو ووشانەن کە لە مەو پێش زانراون. ژمارەی ئەم بە شەش لە چەند ووشەیەك تێ پەڕ ناکا ))[1].

هەروەها لە شی کردنەوەی هەندێ وشە دا باسی چۆنیەتی بەکارهێنانی دەکات، وەك ((بارستایی، بارست : کتله. کورد ئەڵێن : فیسارە شتەکە ( بارستایی )، یان ( بارست )ی خانوویەك ئەبوو. لێرەدا مەبەست لە ( بارستایی )، کێشانەی ئەو شتە نیە. بەڵکو مەبەست لە هێند (کمیة ) ی ئەو ماددەیەیە. واتا ( کتلة )ی ماددەکە))[2].

هەروەها لە ڕاڤەکردنی زاراوەی (بناغە ) دا دەڵێ :-

(( بناغە، بنچینە : اساس. ووشەی (بناغە ) لە (بن ) و (ئاخ) ەوە هاتووە. (ئاخ) لە کوردی دا بە مانای (گل یان ئەرز ) دێ. کەوا تە ( بن ئاخە – بناخە – بناغە ) مانای : بن گل، بن ئەرز ))[3]

هەروەها مامۆستا کامل حەسەن بەسیر لەم بوارەدا ، ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبووە.

**(( زمانی عەرەبی و کێشەی زاراوەی کوردی ))ی د. کامل حەسەن بەسیر**

بیرو بۆ چوونەکانی خۆی لە وتارێکدا بلاّوکردۆتەوە، کە لە بەشی یەکەمی بەرگی دووەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد دەرهێنراوە وەك نامیلکە بەناوی ( زمانی عەرەبی و کێشەی زاراوەی کوردی ) لە چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد چاپکراوە. لەم وتارەدا، مامۆستا لە بارەی کێشەی زاراوەی کوردی و وەرگرتنی زاراوە، لە زمانی عەرەبییەوە هەوڵ دەدا وەلاّمی پرسیارێك بداتەوە ((تاچ رادەیەك زمانی عەرەبی، ئەتوانێ کێشەی زاراوە لە زمانی کوردیدا چارەسەر بکات))[4].

---

(١) جەمال نەبەز، هەندێ زاراوەی زانستی، ل پێشەکی.

(٢) سەرچاوەی پێشوو،ل ٤.

(٣) سەرچاوەی پێشوو،ل ٥.

(٤) د. کامل حەسەن بەسیر، زمانی عەرەبی و کێشەی زاراوەی کوردی،ل ٧٥٣.

## (( زاراوەی کوردی )) ی د. کامل حەسەن بەسیر

ساڵی (١٩٧٩ )، د. (( کامل حەسەن بەسیر )) کتێبێکی داناوە، بە ناوی ( زاراوەی کوردی )، ئەم کتێبە بە بناغەیەکی تارادەیەك باش دادەنرێت، خاوەنەکەی هەوڵی داوە ڕێبازێکی زانستی بگرێتە بەر، بۆ لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنی زاراوەی کوردی، بەشێوەیەکی تیۆری باس لە چۆنیەتی دانان و سازکردن و کێشەکانی زاراوەی زمانی کوردی دەکات، کە ئەمەش هەنگاوێکی گرنگەو تارادەیەك کەلێنێك پڕ دەکاتەوە لە بواری زاراوە سازی کوردی.

## (( زاراوە سازی پێوانە )) ی مامۆستا مەسعود محەمەد

- مامۆستا ( مەسعود محەمەد ) یەکێکە لەو نوسەرە بە توانایانەی کە لە مەیدانی زاراوە سازی کوردیدا، ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبووە، سەرەتا وەکو ئەندامێکی کارا لە کۆڕی زانیاری کورد، بەشداری کردووە لەو وتوویژ و لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنانەی کە سەبارەت بە داڕشتن و وەرگێڕان و هەڵبژاردنی زاراوەو گرتنەبەری ڕێبازێکی زانستیی بۆ زاراوە سازی کوردی کراوە. لەم بارەیەوە تێبینی و سەرنج و بۆ چوون وپێشنیازەکانی خۆی دەربڕیوە و چالاکانە لەم مەیدانە دا کاری کردووە.

کۆڵنەدانی لەم بوارەدا هێنانەکایەی کتێبێك بوو بە ناوی ( زاراوەسازی پێوانە )، لە ساڵی (١٩٨٨ )دا بە چاپ گەیشتووە، لە (٤٤٥ ) لاپەڕە دا لە وردەکاری زاراوەدانان دواوەو، باسی چۆنیەتی ڕۆنانی زاراوەی کوردی کردووە، خامە ڕەنگینەکەی تێدا گێڕاوەو حەشارگەکانی بەسەر کردۆتەوە.

مامۆستا (( کەمال جەلال غەریب )) لە ساڵی ( ١٩٧٤ )، فەرهەنگی زانیاری عەرەبی –کوردی، ب ١–٢، سلێمانی. چاپ کردووە.

هەروەها لە ساڵی (٢٠٠٤ ) کتێبی ( ئینسکلۆپیدیاچییە ؟)ی چاپکردووە.

کە بە شێوەیەکی زانستی باس لە ئینسکلۆپیدیاو جۆرەکانی و کێشەکانی دانانی ئینسکلۆپیدیا دەکات، کە ئەمەش وەکو سەرەتایەکی تیۆری ڕێگە خۆشدەکات بۆ دانانی ئینسکلۆپیدیای کوردی و گەشە سەندنی زاراوەی کوردی و بوژاندنەوەی فەرهەنگی زمان. دەرکەوتنی ئینسکلۆپیدیا، لە میللەتێکدا بە ڕووداوێکی گرنگ دادەنێت، لەم بارەیەوە

دەڵێ: (( دەرکەوتنی ئینسکلۆپیدیا، لە میللەتێکدا بە ڕووداوێکی گرنگ لە مێژووەکەیدا دادەندرێت، قۆناغێك لە قۆناغەکانی پێگەیشتنی رۆشنبیری ئەو میللەتە دەردەخاتو بەڵگەیەکە بۆ فراوانی ئاسۆیی زانیاری بە هەمووڵایەکدا ، هەروەها دەرکەوتنی ئینسکلۆپیدیا لە میللەتێکدا بە ڵگەیەکە بۆ ئەوەی کە ئەو میللەتە بڕیاری داوە بە پێی بەهاکانیْ (قیم ) ئەو سەدەیە بژی ))[1].

**(( بەرکولێکی زانستە زاراوە سازی کوردی ))ی مامۆستا جەمال عەبدول**

لە ساڵی (٢٠٠١ )، مامۆستا جەمال عەبدول کتێبێکی داناوە، بەناوی (( بەرکولێکی زانستە زاراوەسازیی کوردی )).

نوسەر لەم کتێبەدا باس لە ڕێبازەکانی دانانی زاراوەو چۆنیەتی داڕشتنی زاراوەی نوێباوی کوردی دەکات، هەوڵی ئەوە دەدات، کە بە پێی ڕێبازێکی زانستی زاراوەی کوردی دابندرێت، هەروەك چۆن لە زمانە پێشکەوتووەکاندا پەیڕەو دەکرێت. بەتایبەتی گرنگی ئەم کتێبە لەوەدایە کە بە ناوی ( چەند سەرنج و پێشنیازێك، دەربارەی هەندێك پێشگرو پاشگری پێویست، لە سازکردنی زانستە زاراوەی کوردیدا...) نموونەی چەندین پێشگرو پاشگری هێناوەتەوە، بە کوردی ڕوونی کردۆتەوە، کە بۆچی بەکاردێن، بۆ ئەوەی لە بواری زاراوەسازیی کوردیدا، سوودیان لێ ببینرێت. هەروەها مامۆستا جەمال عەبدول جگە لەم کتێبە چەند فەرهەنگێکی داناوە، وەك :-

فەرهەنگی زیوار، کە لە ساڵی ١٩٩٦ چاپکراوە.

فەرهەنگی شەوکار، کە لە ساڵی ١٩٩٨ چاپکراوە.

هەروەها فەرهەنگی کیمیا، کە چاپی دووەمی لە سڵی ١٩٩٩ دا بە چاپ گەیشتووە. ئەم فەرهەنگە، تەرخان کراوە بۆ (( سووکە ڕوونکردنەوەو لێکدانەوەیەکی، نزیکەی ١٧٥٠ زانستە زاراوەی کیمیای گشتی )). بە کورتە پێناسەیەك، ڕاڤەی هەر زاراوەیەکی زانستیی دەکات، بە وێنە :- ((کارلێکی نالەخۆ (نارەها ) : ئەو کارلێکە یە کە گۆڕانی ووزەی سەربەستە کەی موجەب دەبێت، ئەم جۆرە کارلێکە لە خۆیەوە ڕوونادات))[2].

---

(١) کەمال جەلال غەریب، ئینسکلۆپیدیا چییە ؟،ل ٣.

(٢) جەمال عەبدول، فەرهەنگی کیمیا، ل١٨٦.

(( فەرهەنگی زاراوەی زماننناسی )) ی

د. ئەورەحمانی حاجی مارف

(( فەرهەنگی زاراوەی زماننناسی )) کە لە ساڵی (٢٠٠٤ ) نووسەر چاپی کردووە، فەرهەنگێکی ( کوردی – عەرەبی – ئینگلیزی )یە،ئەم فەرهەنگە زاراوەی گشت ئاستەکانی زماننناسی لە خۆگرتووەو پێناسەیان کراوە. بەرانبەر بە زاراوە کوردییەکانیش، شێوەیان لەم دوو زمانە : (عەرەبی، ئینگلیزی ) دانراوە.

بۆ تێگەیشتن لە زاراوەکانی ئەم فەرهەنگە :

(( (( فەرهەنگی زاراوەی زماننناسی ))، ( کوردی – عەرەبی – ئینگلیزی ) بە پێی پێویستی هەر زاراوەیەك ؛ یان بە گوێرەی کێش و سەنگی مەرام و نیازو مەبەستی ڕاگەیاندنیان،هەوڵدراوە، بە پێناسە کردن بێ، یان بە لێدوان و لێکدانەوە بێ، یان تەنیا بە بەرانبەر یەکدی دانانیان و ڕاگرتنیان بێ...کارو ئەرك بە ئەنجام بگەیەندرێت)).(١)

هەروەها جگە لەو هەوڵانەی کە باسمان کرد، چەندین هەوڵی دیکە لە بواری زاراوەسازی کوردی دراون، چەندین فەرهەنگ و کتێب و نامیلکە لەم بارەیەوە دەرچووە، کە ئەگەرچی ژمارەیان کەمەو، لە بارەی زانستی زاراوەسازی و چۆنیەتی چارەسەرکردنی کێشەکانی و بەرەو پێشەوە بردنی، نەگەیشتوونەتە ئاستێکی پێویست، بەڵام بەسەرەتایەکی باش دادەندرێت، وەك :–

کتێبی (( گیروگرفتەکانی زاراوە دانان لە زمانی کوردیدا ))
(( محەمەد وەسمان )). و فەرهەنگی (( زاراوەی گەلی ڕاگەیاندن )) ی
(( بەدران ئەحمەد حەبیب ))... چەند هەوڵێکی دیکەش.

ئەم هەوڵانەی تاکەکەس لە بواری زاراوە داناندا، لایەنی چاك و نگەتیڤیان هەیە.

ئەم هەوڵە تاکە کەسیانە بە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندبوونی فەرهەنگی زمان دادەندرێن ئەگەر بیت و لەلایەن کۆڕی زانیارییەوە ڕینمایی بکرێن و کارەکانیان هەڵسەنگاندن و وتوێژیان لە بارەوە بکرێت. هەرچەندە هەڵبژاردن و داتاشین و دۆزینەوەو داڕشتنی زاراوە ئەرکی کۆڕی زانیارییە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە زاناو ڕۆشنبیران لە

---

(١) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، فەرهەنگی زاراوەی زماننناسی،ل ٤.

ئاست خۆیانەوە نەتوانن بەشداری ئەم پرۆسەیە بکەن. بەهۆی ئەم هەوڵە تاکەکەسییانە، چەندین زاراوەی نوێباو هاتوونەتە ناو فەرهەنگی زمانی کوردی و دەوڵەمەندیان کردووە، کە ئەمڕۆ ئەو زاراوانە دەبیندرێن و خەریکە خۆیان دەچەسپێنن، هەندێ زاراوەی چاکیان هێناوەتە کایەوە.

لێرەدا هەندێ نموونە لەو زاراوە نوێباوە کوردییانە دەهێنینەوە کە بە هەوڵی گروپ و تاکە کەس و کەسانی پسپۆڕو ڕۆژنامە نوسان دانراون، لە چاپەمەنییە کوردییەکانی ئەمڕۆدا بەرچاودەکەون :-

( پەرچەکردار، جیهانبینی، سەرتاپاگیر، شێوازگەرا، دەسەلاتخوازی، دوانەیی یەکان، دژە جەمسەر، چاکسازی، پەراوێزبوون، نامۆیی، هیچگەری، سنوربەند، بە ئەندامبوون، باوکسالاری، پەرلەمانتار، سەختگیر، گەندەڵی، پاکتاوکردن، شوێنگە پێگە، وا بەستەیی، پەناهەندە، وتاربێژی، وانەبێژی، دەسەلاتی چوارەم، پەناهەندە، تاراوگە، سەدەی کۆچ، زەمینەسازی، ژیاندۆست، بالایی، چەپڕەو، نەتەوەخواز، ڕاڤەکاری، بازاڕی ئازاد، تەسکبینی، هاوسنوور، دەسەلاتی ڕەها، کۆمەڵگای چەپێنراو، ئاگایی، پەچە پۆشکردن، هاوساتی، میدیای سارد، چاوی سێیەم، دەرونشیکاری، خۆپەسەندی، زنجیرسازی، ساتەوەخت، ناوکۆیی...هتد )، چەندین زاراوەی دیکە. خەریکە وردە وردە جێگەی خۆیان دەگرن و لە لایەن قسە پێکەرانەوە پەسەند دەکرێن.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم هەوڵە تاکە کەسیانە، نابێ بە ڕەهایی و بە شێوەیەکی ڕەمەکی و بێ لێپرسینەوەو گرتنە بەری ڕێبازێکی زانستی ئەنجام بدرێن هەرکەس خۆی بە زاراوەدانەر دابنێ و ئەرکی فەرهەنگی زمان ئالۆزبکەن یەکێك لەو کێشانە کە بەهۆی هەوڵی تاکە کەسییەوە دێنە بەردەم زاراوەسازی کوردی ڕێکنەکەوتنی پسپۆڕانە لە سەر زاراوەیەك و سەر هەڵدانی بیرو ڕای جیاوازە، زمانەوانەکان ڕێکناکەون لە سەر زاراوەیەکی یەکگرتوو، بۆ واتایەکی یەکگرتوو، بە وێنە :-

**چەند زاراوەیەك و دەربرینێکی جۆراو جۆر بەرانبەر بەیەك واتا بەرچاو دەکەون :-**

لە لێکۆڵینەوە ئەکادیمییەکان، ئەم دەربرینانە بەرچاو دەکەون :-

- سەرچاوەی پێشوو
- هەمان سەرچاوەی پێشوو

یاخودبەکارهێنانی ئەم زاراوانە بۆ هەمان واتا:-

- زانکۆ – زانستگا
- شاعیر – هەستیار – هۆنەر
- هەڵبەست – شیعر – هۆنراوە
- بۆ زاراوەی ( ناوی سادە ) یان هەر سادە بە تەنیا ئەم زاراوانە بەکارهاتووە :-

((١-شێخ محەمەدی خاڵ ( سادە )ی لە فەرهەنگەکەیدا بەکاهێناوە.

٢- جگەرخوێن ( سادە ) ی لە رێزمانەکەیدا بەکارهێناوە.

٣- نوری عەلی ئەمین (پەتی ) لە رێزمانەکەیدا بەکارهێناوە.

٤- کردۆییف ( ئاسان ) ی لە رێزمانەکەی بەکارهێناوە.

٥- هەژار وا پێشنیار دەکات کە وشەی ( ساکار ) بەکار بهێندرێت ))[1].

**بۆ (ناسادە ) ئەم زاراوانە بەکارهاتوون :-**

(( ١- سەعید صدقی زاراوەی ( تێکەڵ ).

٢- تۆفیق وەهبی زاراوەی ( لێکدراو ).

٣- مەردۆخ ( پەیوەست ).

٤- کردۆ بیف زاراوەی ( بارگران ).

٥- نوری علی (ئاوێتە).

٦- رشید کورد ( لێکدائی).

٧- جگەر خوێن ( پەرچەم ) ))[2] ی بەکرا هێناوە.

هەروەها لە بارەی جۆرەکانی کار، نوسەران چەند ناوێکیان بەکارهێناوە :-

(( ئەو کارەی سەعید صدقی بە (( تەنیا ))ی دای دەنێ، لای هەورامانی ((ساکارە))و لای ئەوانی تر هەموویان (( سادەیە )). دیسانەوە (( تێکەڵ )) لای سەعید صدقی بەرامبەر (( ناسادە )) ی نەبەزو (( لێکدراو )) ی هەورامانی و (( دارێژراو )) ی کتێبی قوتابخانەکان و رێزمانی ئاخاوتن دەوەستێ))[3].

---

(١) لیژنەی (( زمان و زانستەکان ))، رێزمانی ئاخاوتنی کوردی،گۆڤاری کۆڕی زانیاری، ل ٣٩٩.

(٢) لیژنەی رێزمان و زمان، کۆبوونەوەکانی لیژنەی زمان و زانستەکانی،ل٨.

(٣) محەمەد مەعروف فەتاح، کارپۆلین کردن بە پێی رۆنان،رۆشنبیری نوێ، ژ(١٢١)، ل ٤١.

هەروەها زمانەوانانی کورد لە سەر ناوی هەردوو جۆرە دەنگی زمانی کوردی بۆچوونی تەواو

هەندێ ناوی جیاوازیان وەکو : (( بێدەنگ، نەبزوێن، دەنگبەر، گیر )) بۆ کۆنسۆنانتەکان و (( دەنگدار، بزوێن، دەنگبزوێن، خۆ دەنگ...)) بۆ ڤاوڵەکان داناوە. بۆ نموونە:

(( ( تۆفیق وەهبی )، ڤاوڵەکان بە ((بزوێن یان دەنگبزێن)) و د. ( مارف خەزنەدار ) بەبزوێنو دەنگداری دادەنێت، ( تایەر سادق ) کۆنسۆنانت و ڤاوڵەکان بە ((سازو ناساز )) ناودەبا، زەبیحیو د. ( ئەورەحمانی حاجی مارف ) دەڵێن : ((بزوێن)) باشترە، ((دەنگدارو بێدەنگ)) ڕاست نییە.

کۆڕ تیپی دەنگدار بە ((حەرف صحیح و صامت )) ی عەرەبی داوەتە قەڵەم. ڕاستیەکەی

(( حەرف صحیح )) و (( حەرف صامت )) هەردووکیان یەك مانایان هەیەو یەکن. ئەوەی ببزوێ دەنگدارەو ئەوی نەبزوێ بێ دەنگە))[1].

هەروەها (( تیپ )) و (( پیت )) کە دوو وشەی کوردین بەرانبەر بە ((حەرف))ی عەرەبیو (( Letter )) ی ئینگلیزی، لە زمانی کوردیدا بە کاردەهێندرێت، پێویستە بڕیار لە سەر یەکێکیان بدرێ،نەك هەر نووسەرێ بە ئارەزووی خۆی یەکێکیان بەکاربێنێ.

بە بۆچوونی د. ( کەمال فوئاد ) (( تیپ )) گونجاوترەو دەڵێ :–

(( پیت لێرەدا، بە مانای Particle نەك Letter بەکارهاتووە. لە عەرەبیدا، بۆ هەردووکیان ((حەرف )) بەکارئەهێنن. بۆ وێنە ئەڵێن ((ئەلحروف ئەلئەبجەدیە )) بۆ مەبەستی دووەم. وە ئەڵێن :

(( حروف ئەلجەڕو ئەلعەتف )) بۆ مەبەستی یەکەم. هەر ئەوەشە کە گەلێکی تووشی ئەو هەڵەیە کردووە، کە بۆ هەردوو مەسەلەکە لە کوردیدا (( پیت )) بەکاربێنن و جیاوازی لە نێوان (( تیپ)) بۆ ((حەرف–Letter )) و (( حەرف – Particle )) دا نەکەن)[1].

(٢) جەمال نەبەز، سەرنجێك لە چەند زاراوەیەکی تازە بەکارهاتوو وکۆڕی زانیاری کورد، گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات، ژ(٢٢)،ل٨٨.

به بۆچوونی ئێمە :- زاراوەی (( پیت )) گونجاوترە، چونکە (( تیپ)) بە واتای کۆمەڵ یان دەستە دێ، واتای (( فرقة)) ی عەرەبی و ((Group )) ی ئینگلیزی دەگەیەنێ. بۆیە وای بە باشتر دەزانین، (( پیت )) وەکو زاراوەیەکی زمانەوانیی و (( تیپ )) یش وەکو زاراوەیەکی گشتی بەکاربێنین.

زاراوەی (( تیپ )) لە بواری وەرزشیشدا بەکار دێت (( تیپی وەرزشی سلێمانی ))، بۆ ئەوەی کێشەی هاوواتایی نەیەتەکایەوە، باشترە لە بواری زمانەوانیدا، زاراوەی ((پیت)) بەکاربهێنین.

هەروەها نوسەران و زمانەوانان، لە هەندێ زاراوەی دیکە دا یەکگرتوونین، بە وێنە :

زاراوەی (( زمان و زبان )) بۆ زمان و (( زاراو، زاراوا، زاراوە، شێوە، بەش، بن، خوار، نیمچە، بێچوو، لەهجە، دیالێکت )) بۆ یەك مەبەست بە کاردەهێنن.

هەندێ لە ڕوناکبیرو نوسەرەکانمان جیاوازی لە نێوان ( زمان، دیالێکت و بەشە دیالێکت ) دا ناکەن. بۆیە، هەندێك جار لە نەسینەکان ئەوە دەبینرێ، لە بری ئەوەی بڵێن : زمانی کوردی، دەڵێن : (( زمانی سۆرانی، بادینانی، زازایی، هەورامی، سلێمانی...تاد )).

لە کۆتاییدا، ئەوە دەڵێن کە :-

پێویستە پسپۆڕانی زاراوە دانان و نوسەران و زمانەوانانی کورد، لە بڕیارەکانیاندا یەکگرتووبن و لە سەر بناغەی تێگەیشتن لە چەمکی زاراوەو قووڵ بوونەوە لە واتای زاراوە بێگانەکان و وردبوونەوە لە سامانی زمانەوانیماندا کارەکانیان ئەنجام بدەن. بۆ مەبەستێك و تاکە واتایەك، تەنیا یەك زاراوە دەستنیشان بکەن. بەڵام، سازکەرەکانی زاراوەی کوردی ((زۆر جار لە سازکردنی زاراوەی نوێباوی پێویستدا، ئاگایان لە یەکترنییە و بەچاوێکی گشتی تەماشای زاراوە هاوواتاکان ناکەن، دەشێ ئاگایان لە یەکدی بێت و بزانن بۆ یەك مەبەستو یەك واتا تاقە زاراوەیەك سازبکەن، بەڵام لە بەردەمارگیری و بۆ بیرو ڕای تایبەتی و لاسایی کردنەوەی زاراوە لە زمانەکانی کەدا هەرجارێك بە سەرپێی و بۆ یەك مەبەست دوو زاراوە یان زیاتر ساز دەکەن ))[٢].

---

(١) د.کەمال فوئاد، زاراوەکانی زمانی کوردی و زمانی ئەدەبی و نوسینیان،گۆڤاری زانیاری،ژ(٤)، ل ٢٢ -٢٤.

(٢) د.کامل حەسەن بەسیر، زاراوەی کوردی،ل ١٤٧.

بەکارهێنانی لە یەك زاراوە زیاتر لە لایەن نوسەرانەوە، بەم جۆرە بەرچاو دەکەوێت:–

١– جیاوازی زاراوە بۆ یەك واتا لە لیستەو نامیلکە یەکەوە بۆ لیستەو نامیلکەیەکی دیکە : بە وێنە لە نوسراوێکدا زاراوەی ( کتێب و ئەدەب و قەڵەم ) بەکاردێت، کەچی، نوسەرێکی دیکە لە نوسینەکەیدا بەرانبەر بە هەمان واتا، زاراوەی ( پەرتوك و وێژەو پێنوس ) بەکاردەهێنێت.

٢– بەرچاوکەوتنی دوو زاراوە یان زیاتر لە لایەن نوسەرێکەوە بۆ تاکە واتایەك لە هەمان لیست و نامیلکەدا، وەك :

- (ئاینده، داهاتوو )
- دەرمانگاو دەرمانخانە
- نوژدار و برینکار ...هتد.

لە ڕاستیدا ئەم ناوە زۆرانە، نیشانەی دەوڵەمەندی زمان نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەرکی فەرهەنگنووس و ئەوانەی کە دەیانەوێ فێری زمانی کوردی بن گران دەکات.

کێشەیەکی دیکە، کە بە هۆی هەوڵی تاکەکەسیی لە دانانی زاراوە، دێتە کایەوە، ئەوەیە کە:

أ– زۆر جار زاراوەی وا دەهێننەکایەوە و بە کاری دەهێنن کە پێویست نین بکەونە ناو فەرهەنگی زمانەوە،بەوێنە،لە کاتێکدا زاراوەی (زانا) مان هەبێت، پێویست ناکات زاراوەی ( زانکار ) بەکاربهێندرێت، ئەمە ئەرکی فەرهەنگی زمان گران دەکات.

ب– ئەگەرلە زمانی کوردیدا، دیاردەیەك یان واتایەکی تایبەتمان نەبێت، پێویست ناکا زاراوەی بۆ دابنرێ، بەوێنە :– (( ئاوەڵناوی کارئاسا )) لە ڕێزمانی کوردیدا، داڕشتەیەکمان نییە بۆ ئەم دەربڕینە، ئیدی پێویست بەوە ناکات زاراوە یان دەربڕینێك لە زمانی کوردیدا، بۆ ئەم واتایە ساز بکەین.

خاڵێکی دیکە لێرەدا، کە شایەنی باسکردن بێت، ئەوەیە :–

ئەو زاراوانەی کە بە هەوڵی کەسانی پسپۆڕیان زمانەوانان دادەندرێت یاخود پێشنیاز دەکرێن، هەندێکیان سەرکەوتوون، بەڵام هەندێکی دیکە یان، پەسەندناکرێن و لە لایەن قسە پێکەرانەوە توانای ڕۆیشتنیان نییە زاراوەی (( خەپلە )) کە بەرانبەر بە زاراوەی ((حەب))ی عەرەبی پێشنیاز کراوە، نەڕۆیشتووەو بەکار ناهێندرێت.

هەروەها ئەو زاراوانەی کە لە کاتی خۆی مامۆستا ( مەسعود محەمەد) پێشنیازی کردوون، هەندێکیان پەسەندکراون، وەك : زاراوەی (( دادگە )) بەرانبەر بە زاراوەی ((محكمة)) ی عەرەبی، زاراوەی (( داواکار )) بەرانبەر بە ((مدعي ))، هەروەها زاراوەی ((زیندەوەر، دیندار، دادخواز...هتد.))، زاراوەی ((گەندەڵ))ی بەرانبەر بە ((مرض باطني)) داناوە، ئەمڕۆ زاراوەی ((گەندەڵی )) بۆ واتایەکی دیکە بەکاردێت. بەڵام هەندێکی دیکەیان سەرکەوتوونەبوون و ئەمڕۆ بەکار ناهێندرێن،وەك:- (( ئایەك، نایەك، سەیرەك پرسەك،جەلوو، دینگار، خوازگاری، داواگیر، دیدەوەر...هتد))[1]، هیچ کامێکیان لە لایەن قسە پێکەرانەوە پەسەند نەکراون.

---

(١) مەسعود محەمەد، زاراوەسازی پێوانە، ل

## قبولٚ کردنی زاراوەکان:-

کاتێك کۆڕێکی زمانەوانیی یان مەڵبەندێکی زانستی، زاراوەیەکی زانستی یان تەکنیکی دادەنێ، مانای ئەوە نییە کە خەڵك وەری دەگرن و بڵاویش دەبێتەوە، بەڵکو لەوانەیە، ئەو زاراوەیە خەڵك وەری بگرن و بەکاری بهێنن، لە وانەشە، پەسەند نەکرێت و بە نوێباوی بمێنێتەوە (( وشەی نوێباو – ئەو وشانەن کەوا بۆ مانایەکی ناسراوی دانەیەك (وحدة ) لە زمان بەکاردەهێندرێن و تازە هاتوونە تە زمانەوەو هێشتا نەچوونەتە ریزی وشەی چالاکی ئەو زمانەوە. ئەو جۆرە وشانە، تا ئەو دەمەی بە تەواوی ڕەگ دانەکوتن و جێگیر نەبن و بڵاونەبنەوەو نەچنە ریزی وشەی چالاکەوە، هەر بە نوێباوی دەمێننەوە ڕەنگی تازەییان تێدا دەبینرێ. بە وێنە وشەی ((ڕێزمان )) – هەرچەندە ماوەی (٣٠) ساڵێك دەبێت لە زمانی کوردیدا پەیدابووە، بەڵام لە بەر ئەوەی بە تەواوی بڵاوبۆتەوەو جێگیر بووەو ڕەگی داکوتاوەو ڕەنگ و بۆی نوێباوی پێوە نەماوە، هاتۆتەریزی وشەی چالاکی کوردییەوە. هەروەها ((نوسەر))،((خوێنەر ))، (( گۆڤار ))، (( چیرۆك))...وەگەلێکی تر لەگەڵ ئەوەدا کە لە مێژ نییە لە زمانی کوردیدا هاتوونەتە ناوەوە، بەڵام چونکە تێکڕای خەڵکەکە وەری گرتوون، لە بەر ئەوە لە نوێباوی دەرچوون و لە ریزی وشەی چالاکی کوردیدا وەستاون))[1].

هەروەها (( ئەمڕۆ زاراوەی (هەواڵگری ) ( الاستخبارات )، ( مایەوزە بەخشەکان ) بەرانبەر (المواد المنشطة )،(بێژەر ) ( المذیع، المذیعة )و چەندان زاراوەی دیکە زۆر بە فراوانی بەکاردێن و لە سەرزاران سووکن هەر چەندە تەمەنیان لە چەند ساڵێك زیاتر نییە.

کەچی وشەی دیکە هەن وەك : (پێنووس ) بەرانبەر ( قەڵەم ) کە واسی ساڵێك دە بێت داندراوە، کەچی نەیتوانیوەجێ بە وشەی ( قەڵەم ) لەق بکات، زۆر لە پێنووسەکە زیاتر بەکاردێت. کەچی

( تێنووس ) کە بۆ (دفتر ) داتاشراوە هەر بەکارنایەت مەگەر بە دەگمەن))[2].

شایانی باسە هەندێ لێکۆڵینەوە کراوە، سەبارەت بە هۆکاری سەرکەوتنی هەندێ زاراوەو بەکارهێنانیان لە لایەن خەلکی، وەکو وردبوونەوە لەو ڕێگا زمانەوانییانەی کە تێیدا

(١) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، وشەی زمانی کوردی،ل ٥٣.

(٢) محەمەد وەسمان، گیرو گرفتەکانی زاراوەدانان لە زمانی کوردیدا،ل ٤٩.

بەکارهاتووە، هەروەها خاسیەتەکانی دەنگی وشەیی ئەم زاراوەیە چییە کە تێیدا بە کارهاتووە، هەروەها تاچ رادەیەك لە لایەن دەزگاکانی راگەیاندن وەکو رۆژنامەو رادیۆو تەلەفزیۆن بەکاری دەهێنن، هەروەها تاچ رادەیەك واتا زمانییەکەی هاوواتای واتا زانستییەکەیە. ئەوەی راستی بێ، تاوەکو ئێستاش هۆکاری راستەقینەی سەرکەوتنی زاراوەیەك یان سەرنەکەوتنی بەتەواوی نەزانراوە.

هەندێك زاراوەی نوێباو هەرچەندە بەپێی دەستوری رێزمانی زمانی کوردی دارێژراون و رەخنە لە چۆنیەتی رێبازی دارشتنیان لە لایەن زمانەوانانەوە نەگیراوە، کەچی لە لایەن قسە پێکەرانی زمانی کوردییەوە نەچەسپاون و نەیانتوانیوە جێگەی خۆیان لە فەرهەنگی زاراوەسازی زمانی کوردیدا بگرن. بە وێنە :- زاراوەی (( پەندیار )) بەرانبەر بە زاراوەی (الحکیم )، زاراوەی (( پەندیاری )) بەرانبەربە زاراوەی (( الحکمة ))[1] بە پێی دەستوری زمانەوانی ( پەند+ یار ) سازکراوە، بەلاّم ئەمرۆ زاراوەی (حەکیم ) لەلایەن خەلّکی بەکاردێت. هەروەها زاراوەی ( هەستیار ) بەپێی دەستوری زمانەوانی (هەست + یار) سازکراوە، بەلاّم بەکار ناهێندرێت.

بەپێچەوانەشەوە وشەی (زانکۆ ) کەبەهۆی گۆران لە شێوەی دارشتنی وشە لە زمانی کوردیدا پەیدا بووە. لە سەرەتاداو ئێستاش هەندێ لە نوسەران رەخنە لە وە دەگرن کە دارشتنی ئەم وشەیە لە شێوازی دەستوری دارشتنی زاراوە لە زمانی کوردیدا لایداوە د. ئەورەحمانی حاجی مارف ،لەم بارەیەوە دەڵێ :-

(( لە زمانی کوردیدا بۆ رۆنانی لێکدراو نزیکەی پازدە رێگەی جیاواز هەیە، وەك : ( ناو+ ناو ) ؛ ( ناو +ناوبەند+ ناو ) ؛ ( ناو + ئاوەڵناو ) ؛ ( ئاوەڵناو +ناو ) ؛ (ناو + رەگی کردار)...

لە نێو ئەو رێگایانەدا، یەککگرتنی ( ناوو رەگی کردار زۆر باوە. وەك :

مەی + گێر ( گێران ) = مەیگێر

کۆل + گێر(گێران ) = کۆلگێر

کار + گێر ( گێران ) = کارگێر

دار + تاش ( تاشین ) = دارتاش

---

(١) لیژنەی زاراوە زانستیەکان، زاراوەزانستییەکان،گۆڤاری کۆری زانیاری، ل ٤٤٧.

سەر + تاش ( تاشین ) = سەرتاش

شەکر + شکێن (شکاندن ) = سەرشکێن

دەست + بڕ ( بڕین ) = دەستبڕ

بەڵام ئەو ڕێگەیەی وشەی (زانکۆ ) یان پێ ڕۆناوە، واتە :

ڕەگی کردار + ناو

زان ( زانین ) + کۆ = زانکۆ

بەهیچ چەشنێك لە زمانی کوردیدا نییە، لە بەر ئەوەی وشەی ناوبراو دژ بە یاساکانی ڕۆنانی وشەی لێکدراوی کوردی سازکراوە، ئەوە دەچێتە خانەی هەڵەی زمانە وانییەوە.

جا کە هیچ یەکێك لەو وشانە ( کۆلگێڕ، ( کارگێڕ )، ( دارتاش )، ( قۆڵبڕ ) (سەرشکێن)... نەشێ بکرێت بە ( گێڕ کۆڵ )، ( گێڕکار )، ( تاش دار )، ( بڕقۆڵ )، ( شکێنسەر)... ئەوە ڕاست نییە (زان ) ی ڕەگی کرداری ( زانین ) یش پێش ناوەکە – ( کۆ) بخرێت و ئەمە دەبێتە تێکدانی دەستورە ڕەسەنە ڕێك و پێکەکانی زمانی کوردی.

بۆ زێدە ڕونکردنەوە، بەشێك لەو وشە لێکدراوانەی مۆرفیمی (زان ) هاوبەشیی لە ڕۆنانیاندا کردووە، دەخەمە بەرچاوو ئەوەتە لە سەرجەمیاندا، کەوتووەتە دواوە :

کار + زان = کارزان

قسە + زان = قسەزان

یاری + زان = یاریزان

کوردی + زان = کوردی زان

ڕێ + زان = ڕێزان

زمان + زان = زمانزان

درۆ + زان = درۆ زان

...هتد.

بێ گومان کورد هەرگیز نەیوتووە : ( زانکار ؛ زانقسە ؛ زان یاری ؛ زانکوردی ؛ زانڕێ ؛ زانزمان ؛ زان درۆ...)... کەواتە لە نێو هەموو ئەو وشانەدا (زانکۆ) تاکە وشەیەکە لە سازو ئاوازی کوردییەوە دووربێ...))[(١)].

---

(١) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، زمانی کوردی و خەوشی هەندێ وشەو زاراوەی نوێ، ل٦–٩.

زاراوەی (زانکۆ ) کە لە لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد دا هاتووە، ل ٤٥٤ بەرگی یەکەم بەشی یەکەم – ١٩٧٣ – لە تێبینیەکاندا هاتووە (ڕستەی کۆکردنەوەی زانین) (جامعە العلوم والمعارف ) هێنراوەولە وشەی یەکەم ( کۆ) و لە وشەی دووەم (زان) وەرگیراوە بەرو دوایان پێکراوەو بووەبە زانکۆ.

زاراوەی زانکۆ ئەمڕۆ لە زمانی کوردیدا، بەتەواوی شوێنی خۆی گرتووەو، لەوە دەرچووە کە بەنامۆ بزاندرێت و هیچ زاراوەیەکی دیکە ناتوانێت جێی پێ لەق بکات.

هەروەها وشەی ( گشتاندن ) یش کە لە لایەن مامۆستا ( جەمال عەبدول ) [1] وە دانراوە بەرانبەر (تعمیم) ساڵەکانی هەشتا لە وەرگێڕانی کتێبی کیمیای پۆلی چوارەمی گشتیدا بەکارهێنراوە، هەندێ لە زمانەوانان بەتوندی لێی دواون و بە دژواری دادەنێن، کەچی ئێستا خەریکە دەچەسپێت و زاراوەیەکی گونجاوەو پڕبەپڕی واتای( تعمیم)ە.

دەتوانین هۆکاری سەرنەکەوتنی زاراوە ی زانستی لە بڵاو بوونەوەدا، بۆ چەند خاڵێك بگەڕێنینەوە:–

١– (( هەندێك جار کۆڕی زانیاری، زاراوەیەك دادەڕێژێت بۆ چەمکێك یان دۆزینەوەیەك، بەلأم پێشتر خەڵك بەکاریان هێناوەو ناوێکیان بۆ داناوە.

جا ئەم ناوەش چ دانراوبێ یان هاوردەبێ، ناوە داڕێژراوەکە ناتوانێ بەربەرەکانی ئەو ناوە دانراوە بکات کە پێشتر بڵاوبۆتەوە.

٢– هەندێك جار کۆڕی زانیاری زاراوەیەك دادەڕێژێ بۆ چەمکێك کە پێشتر خەڵك نەیانزانیبێ و ناویان لێ نەنابێ، لە گەڵ ئەوەش ئەم زاراوە نوێیە بڵاونابێتەوە ))[2]، یان زاراوەکە گونجاو نییە، بۆ ئەو واتایەی بۆی دانراوە.

بەم جۆرە دەبینین، ژمارەیەکی زۆر لەو زاراوانەی کە کاتی خۆی کۆڕی زانیاری کورد دایناون، نەیانتوانیوە وەکو زاراوەیەکی نوێباو برۆن و لە لایەن خەڵکی بەکار بهێندرێن، وەك :– (بنگەی دابەشین، جووت هاتن، بنۆسی کارایی، بنۆسیاری...هتد.

ئێمە پێشنیازمان لەم بارەیەوە، ئەوەیە :–

---

(١) جەمال عەبدول، بەرکوڵێکی زانستە زاراوە سازی کوردی، ل٨٤.

(٢) د. علي القاسمي، مقدمة في علم المصطلح،ل١٥٦.

کاتێك شتێکی تازە دێتە کایەوە، یان دۆزینەوە یەکی نوێ دادەهێندرێ، پێش ئەوەی ئەوشتە نوێیە یاخود دۆزینەوەیە بگاتە دەستی خەڵك و بازاڕو شوێنە گشتییەکان، لەلایەن کۆڕی زانیارییەوە ناوێکی بۆ دابندرێت، دواتر داوا لە خەڵك نەکرێت کە ئەو ناوەی کۆڕی زانیاری بۆ ئەم شتە یاخود دۆزینەوەی داناوە، بەکاریبهێنن و واز لەو ناوە بهێنن کە پێی ڕاهاتوون.

## بۆ چارەسەرکردنی حاڵەتی دووەم :-

پێشنیازمان وایە (( کەتەنها زمانزان زاراوە زانستی و تەکنیکی یەکە دانەڕێژێ، بەڵکو پێویستە پسپۆڕوبەکارهێنەریش بەشداری دانانی زاراوەکە بکەن، تا واتا زانستییەکە بۆ زاراوەکە گونجاوو باشتربێت و خەڵکیش لایان پەسەندبێت ئەم بیروبۆچوونە لە لیژنەی زاراوەکانی ڕێکخراوی نێو دەوڵەتیدا، پەسەندکراوە )) [1].

---

(١) سەرچاوەی پێشوو،ل ١٥٦ –١٥٧.

## شێوەکانی مۆرفیم ( نمط المورفيم – Allomorph )

بەچەند شێوەیەك کەلەیەك مۆرفیمدا کۆدەبنەوە، دەڵێن شێوەی مۆرفیم. (بەشێکی زۆری شێوەی مۆرفیمی زمانی کوردی ئەوانەن کە هۆی فۆنەتیکی پێکیان دەهێنێ. بە وێنە ئەگەر مۆرفیمی (وە) لە وشەی (( چوونەوە )) دا ببێتە (ەوە )، ئەوە مۆرفیمێکی دیکە پەیدا نابێ، بەڵکو شێوەی هەمان مۆرفیمە، بەڵام پێویستی فۆنەتیکی ئەو شێوەیەی پێداوە. یاخود ئەگەر مۆرفیمی (ەکە) کە نیشانەی ناسیاوی یە بە چەند شێوەیەکی دیکە، وەك (کە – یەکە...) بەرچاو بکەوێ، ئەوە ناکرێ بە مۆرفیمێکی دیکە دابنرێ، بەڵکو ئەوانە مۆرفیمی (ە کە )ن...

ئەو جۆرە حاڵەتانە کە لە زانستی زماندا بە شێوەی مۆرفیم ناسراون، لە زمانی کوردیدا زۆرن، وەك:

| | |
|---|---|
| گە/ گا | ڕێگە–ڕێگا، جێگە – جێگا |
| ێك / یێك / یەك / ێ | شەوێك – چرایێك – چەقۆیەك – ڕۆژێ |
| وان / ەوان | گاوان – باخەوان |
| بەند / بەن | ناڵبەند – ناڵبەن |
| وەر / ەوەر | سەروەر – جانەوەر |
| کە / ەکە / یەکە | دەرگا – کوڕەکە – چرایەکە. |

لە زمانی کوردیدا، شێوەی مۆرفیم لە ڕێگەی تێچوونی بزوێن یاخود پەیدابوونی نیمچە بزوێنەوە دروست بوون، کە ئەویش هۆی فۆنەتیکیيە).[(١)] شێوەی مۆرفیم، لە بواری زاراوەسازیدا، زۆرجار دەبێتە هۆی هاتنە کایەوەی بیروبۆ چوونی جیاواز، وەك :

پاشگری (گە – گا ) کە شێوە مۆرفیمی یەکدینە، دەچنە سەرناوو هەندێك بەشە ئاخاوتنی دیکە، واتای شوێن و جێگە دەگەیەنن.

هەندێك جار بیری وا دێتە کایەوە، کە مۆرفیمی (– گا ) بۆ شوێنی گەورەبەکاردێت. مۆرفیمی (گە) ش بۆ شوێنی بچووك بە کاردێت. [(٢)]

---

(١) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، وشە ڕۆنان لە زمانی کوردیدا،ل ٣٥.

(٢) چاو پێکەوتن ، د. بەکر عومەر عەلی.

((مامۆستا جەمال نەبەز پێشنیاری کردووەکە، لە زمانی کوردی ئەدەبیدا، هەر تەنیا پاشگری ((گە)) بەکاربهێنرێ باشترە، بێ ئەوەی ئەم جیاوازی یە ڕوون بکاتەوە ))[1].

ئەم بۆ چوونانە بواری زاراوە سازیمان لێ تەسك دەکاتەوە. ئێمە باوەڕمان وایە :—

کە ئێستا ئەم دووانە وا تێکەڵبوون، کە بە هەردووشێوەیان زاراوە مان بۆ دروست دەکەن، بۆ پاڵپشتکردنی ئەم بۆچوونەوش چەند نموونەیەك دەهێنینەوە :—

(کارگە) کە پاشگری (گە)ی وەرگرتووە، لەوانەشە شوێنێکی گەورە بێت، (کۆگا)، (دەزگا) کە پاشگری (گا) یان چۆتە سەر مەرجیش نییە شوێنێکی گەورەبن.

هەروەها ئەم دوو پاشگرە، زۆر جار دەچنە سەر هەمان وشە بەبێ جیاوازی گەورە و بچووکی شوێنەکە، وەك :—

تۆمارگە — تۆمارگا

فرۆشگە — فرۆشگا

خەڵوەتگە — خەڵوەتگا

دایەنگــە — دایەنگا

ئەمــەش ڕاســتی ئــەم بۆچــوونەمان بــۆ دەردەخــات، کــە ئــەم شــوێنانە بەگــەورە و بچووکیانەوە، هەردوو شێوە مۆرفیمی ( گە — گا ) وەردەگرن.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، پێویستە ئاماژە بەوە بکەین، کە :—

هەرچەندە هەردووکیان، بۆ شوێنی گەورە و بچووك بەکاردەهێندرێن، بەڵام لە هەنـدێ بەکارهێناندا جیاوازییان هەیە (( (گە) زیاتر گونجاوو لەبارو مۆسیقی ترە بۆ پێکهێنانی ناوی جێگا لە چاوگەوە، لە دەربڕیندا سوکترە، وەك : جومگە، ڕوانگە، فرگە، کەچی (گا) لەگەڵ (ناوی جێگا) کە لە ناوەوە پێك دەهێنرێت گونجاوو سوکترە وەکو :

ســەربازگا، لەشــکرگا، ســەیرانگا... کەچــی (ڕوانگــا، فرگــا، خولگــا، پرســگا، لەشکرگا،... هتد لەسەر زماندا نارێك و قورسە.))[2]

بــەڵام دیسانەوەش، ئــەم بۆچــوونە مــەرج نییــە هــەموو چــاوگێك یــاخود ناوێــك بگرێتــەوە، بەوێنە :—

---

(١) ڕەفیق محەمەد شوانی، ئەو وشانەی لە چاوگەوە وەردەگیرێن،ل ١٤٢.

(٢) ڕەفیق محەمەد شوانی، ئەو وشانەی لەچاوگەوە وەردەگیرێن،ل ١٤٢.

(( خوێنـدن)) هەرچـەندە چاوگیـشە، کەچـی لەگـەڵ پاشـگری ( گـا ) دا، گونجـاوترو مۆسیقی ترە، وەك لە پاشگری ( – گە).

کەچی وشەی ( تاراو )، پاشگری ( – گە ) وەردەگرێت، دەبێتە ( تاراوگە ). هەروەها

( ژوان + (– گە) ) ⟵ ژوانگە، فەرمانگە...هتد.

٢– شێوە مۆرفیمی ( – یەتی، – ێتی )

هەندێ جار بیرو بۆچوونی جیاواز لەبارەی بەکارهێنانی ئەم شێوە مۆرفیمانە دێتـە کایەوە، کە کامیان بەکاربهێنین بۆزمانی ئەدەبیی گونجاوترە : –

ئەمینداریەتی – ئەمینداریێتی.

چۆنیەتی – چۆنێتی

خۆیەتی – خۆیێتی

بەرپرسیاریەتی – بەرپرسیاریێتی

( – ێتی، – ا یەتی ) :–

کەسێتی – کەسایەتی

بەرامبـەر بـە زاراوەی ( شخـصية )ی عـەرەبی، هەنـدێ کـەس (کەسـایەتی) بـەکار دەهێنن، هەندێ کەس (کەسێتی ) بەکاردەهێنن.

بەبۆچوونی ئێمە :–

بۆ زاراوەی ( شخصية )، (کەسێتی ) باشترە بەکاربهێنرێت، (کەسایەتی)، بۆ خزمایەتی گونجاوترە.

( –یەتی، – ێتی )

یەکیەتی – یەکێتی

( – یەتی، – ێتی، – ایەتی ) :–

چۆنیەتی – چۆنێتی – چۆنایەتی

پێویستە بڕیار لەسەر بەکارهێنانی یەکێکیان بدرێت.

چەندین شێوە مۆرفیمی دیکەش، لە زمانی کوردیدا بەرچاو دەکەوێت.

هاتنەکایەوەی ئەلۆمۆرف دەگەڕێتەوە بۆ سێ هۆکار :–

(( ١- كاری دەنگی دراوسێ وەك ئەو گۆڕانانەی بەسەر مۆرفیمی ( - ەکە ) و (..ان ) داهاتووە.

٢- شێوازی قسەکردن وەك ئەو گۆڕانەی بەسەر مۆرفیمی ( -ەکە) ی نیشانەی ناسیندا دێ. وەك لەکاتی ئاخاوتندا دەردەکەوێت ( کوڕەی بەسەزەمان پەلاماری نانەکەی دا ) ئەلۆمۆرفی ( ە) دەچێتە شوێنی ( - ەکە)

٣- زارەکانی زمان، بۆ نموونە،گۆڕانی ئەلۆمۆرفی (- ەکە) بە (- ۆکە) و (- ێکە) لەوشەی (قاپێکە، جوانۆکە)، بەپێی زارەکانی زمانی کوردی ))[1].

(١) محەمەد مەعروف فەتاح، زمانەوانی، ل٨٥.

## زاراوەی بیانی :-

بۆچوونی جیاواز لە نێوان زمانەواندا هەیە، لەبارەی چۆنیەتی دانانی زاراوە. هەندێ پێیان وایە، پێویست بەوە ناکات سڵ لەوشەی بیانی بکەین، با بە ئازادی لەزمانی ئینگلیزی و فەرەنسی و زمانەکانی دیکەش وەربگرین، ئەگەر سەیری فەرهەنگی زاراوەی کوردی ئەمڕۆمان بکەین، ژمارەیەکی زۆرمان لە زاراوەی ئەم زمانانە بەرچاو دەکەوێت. هەر لەفەتواو قەدەرو وەهم و سروشت و قەرەباڵغ وە بیگرە تا دەگاتە، ریفراندۆم و ئۆپۆزیسیۆن و داتاو ئیمەیل و...هتد.

ئەوانەی ڕێ بەم زاراوانەش دەدەن دەڵێن :- زمان پێیان دەوڵەمەند دەبێت و هەموو زمانە زیندووەکان، وشەو زاراوە لەیەکدی وەردەگرن، زمانی کوردیش هیچی لەزمانانی دیکە کەمتر نییە ، ترسی ناوێت، ئەگەر لە زمانانی دیکەوە وەربگرین، بەرانبەر بەوانەش، هەیە داوا دەکات لەڕەگی وشە کوردییەکانەوە زاراوەی لەبار دابرێژینەوەو دابتاشین و دابنێین بۆ ئەو چەمکە نوێیاوانە، هەر دووبەرە لەکێشەو ململانێیەکی هێمندان.

وەرگرتنی زاراوە لەدراوسێکانەوە

زمانی کوردی ئەمڕۆ ژمارەیەك زاراوەی لەفەرهەنگەکەیدا هەیە کە لەزمانە دراوسێکانی وەکو (عەرەبی، تورکی، فارسی ) یەوە هاتوونەتە ناوی، لەم بارەیەوە بیرو بۆچوونی جیاواز هەیە :-

١. وشەی عەرەبی :-

هەندێ وای بەباش دەزانن کەهیچ وشەیەکی عەرەبی لەزمانی کوردیدا، بەکارنەیەت، ئەمە بەنیشانەی هەژاری و ناپوختەیی زمان دادەنێن.

لە بەرانبەر ئەمانەدا، هەندێ نووسەری دیکە وەرگرتنی وشەی عەرەبی بە دیاردەیەکی ئاسایی دادەنێن.

بەبۆچوونی ئێمە :-

هاتنە ناوەوەی وشەی عەرەبی بۆ ناو زمانی کوردی، ئەگەر بەهۆکاری پێویست بێ، هیچ زیانێك بەزمانەکەمان ناگەیەنێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە، ئەو وشانەی کە هاتوونەتە فەرهەنگی زمانی کوردی و ڕەگ و ریشەیان داکوتیوە، لەناو قسە پێکەرانی زمانی کوردی بڵاو بوونەتەوە، زمانی کوردیان بەپێزو دەوڵەمەند کردووە :-

ئـەو وشـانەی کەلـەناو کۆمـەڵانی خـەڵك و چـینی خوێنـدەوارو تەنانـەت نەخوێندەواریشدا هەن و هەموو کوردێك بەئاسانی تێیان دەگەن و مۆرکێکی کوردانەیان وەرگرتووە، تازە بوونەتە خۆماڵی و خزمەتی زمانەکەمان دەکەن و ئەرکیشیان لەسەرمان نییە.

بەوێنە وشەکانی وەکو :- (( وەهم و قـەدەر و خـەت و خـەیاڵ و قەڵـەم و ماڵ و ئیش و خێرو بەرەکەت و مزگەوت و وەفاو موبارەك و زەکات و تەزبیح و خزمەت و خودبەو مێزەرو شـەربەت و قەسـاب و بـەقاڵ و حـەنان،... چـەندین وشـەی دیکـە هـەموو کوردێك دەیانزانن، هۆگریان بووین و ناسراون، ناشێ لەزمانە کەمان وەدەریان بنێین )) [1].

بەڵام هەندێ وشەی عەرەبی کە کەوتونەتە نـاو زمـانی کـوردی، بـەبێ ئـەوەی زمـانی کوردی پێویستی بەم وشانە هەبێت. بۆ خۆدەرخستن و خۆجیا کردنەوە لەخـەڵکی ئاسـایی، یـاخود بـەهۆی کاریگـەری بوونیـان بـەزمانی عـەرەبی، لـەکاتی قـسەکردندا، زاراوەو دەستەواژەی عەرەبی درێژو قورس بەکاردەهێنن، ئـەم دەرکەوتـە یـە وەنـەبێ تـەنیا لـەنێو کوردا هەبێ، بەڵکو لە نێو زۆر گـەل و نەتـەوەی دیکەشـدا بەرچـاو دەکـەوێت، هەنـدێ جـار چینی سەرمایەدارو سەروەی کۆمەڵ وشەی زمـانێکی دیکـە بـەکار دەهێـنن، بـۆ ئـەوەی لـە زمانی چینی خوارەوەی کۆمەڵ جیاواز بن.

((ئەرستۆکراتەکانی ( ڕووس ) لە سەردەمێکی مێژووی دیاریکراودا، لە نێو خۆیاندا بە زمانی

( فەرەنسی ) گفتوگۆیانکردووە))[2].

خـاڵێکی دیکـە لـەبارەی بـەکارهێنانی وشـەی عـەرەبی لـەزمانی کوردیـدا ئەوەیـە، کەهەندێ کەس جگە لەوەی لەکاتی ئاخاوتن یان نوسیندا، زۆر وشەی عەرەبی بەکاردەهێنن و بەزمانی کوردی ڕەوان قەسـەناکەن، وشـەی هاووتـای کـوردی وعـەرەبیش بـەدوای یەکـدا دووبارە دەکەنەوە وەك ( ڕێز و ئیحترام، ویـژدان و زەمـیر، کـورت و موختەسـەر، ڕەخنـەو نەقد، شیعر و هەڵبەست، یاسا و قانون، خوو ئولفەت، وەعد و پەیمان، پرسـیار و سـوئال،

---

(١) هەژار موکریانی، کوردو سەربەخۆیی زمان، گۆڤاری کۆڕی زانیاری،ل ٢٨٥.

(٢) حوسێن محەمەد عەزیز، سەلیقەی زمانەوانی و گرفتەکانی زمانی کوردی،ل٤٥٣.

وەلاّم و جەواب، گەورە و عازەب، سەرچاوە و مەصدەر، ئاینزاو مەزهەب، زاهیر و ڕواڵەت، شەوو ڕۆژ و لەیل و نەهار، ناپاکی و خیانەت... هتد).

ئەم شێوە نووسینە بارگرانی دەخاتە سەر زمانی ئەدەبی کوردی، چونکە سەرەڕای ئەوەی کە وشەکان هاوواتان، بەدوو زمانی کوردی و عەرەبیشن کە هەردووکیان یەك واتا دەبەخشن و پێویست بە دووبارە کردنەوەیان ناکات. بۆیە نابێ ئەم جۆرە وشانە، لەزمانی ئەدەبیی و زمانی نووسیندا بەکاربهێنین.

بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەش : دەبێ کۆڕی زانیاری، یان کۆمەڵێ لە زمانزانان کە دەست بەو کارە بکەن، پێش هەموو شتێك وشەی هەموو زارە جیاجیاکانی کوردستانیان بەفەرهەنگ لەبەر دەستدابێ و کەبیانەوێ وشەیەکی کوردی ڕەسەن، لەجێگەی دابنێن ئەوەیان هەڵبژێرن کە لەهەموویان شیاوترەو واتاکەی گونجاو ترە.

خاڵێکی دیکە ئەوەیە، کە ئەمڕۆ لەزمانی کوردیدا، ژمارەیەك لەو وشە عەرەبیانەی کە کەوتوونەتە زمانی کوردی، هاوواتای کوردییان هەیە، وەك :–

| | | |
|---|---|---|
| مەستەرە | – | ڕاستە |
| عەمەلە | – | کرێکار |
| صف | – | پۆل |
| زالم | – | زۆردار |
| حاکم | – | دادوەر |
| محاسب | – | ژمێریارە |
| نادی | – | یانە |
| مەدرەسە | – | قوتابخانە |
| محامی | – | پارێزەر |
| مەحکەمە | – | دادگا |
| موعەلیم | – | مامۆستا ... هتد. |

زۆر جار زاراوەیەکی دراوسێ و زاراوەیەکی کوردی ڕەسەن شان بەشانی یەکدی دەڕۆن، تاله ئاکامدا یەکێکیان بەتەواوی دەچەسپێت و شوێن بەوی دیکەیان لەق دەکات، وەکو :–

خوێندکار – تەلەبە

کە ئێستا خەریکە زاراوەی ( خوێندکار ) لەکرمانجی خواروو دا، بەتەواوی دەچەسپێت و شوێنی زاراوەی ( تەلەبە) ی عەرەبی دەگرێتەوە.

بەشێکی دیکە لەو زاراوە عەرەبیانەی هاتوونەتە ناو زمانی کوردییەوەو، بەرانبەر بەهەمان واتا، وشەی کوردی هەیە، بەلام وشە کوردییەکە نەیتوانیوە شوێنی زاراوە عەرەبییەکە بگرێتەوە، بەڵکو تاوەکو ئێستاش خەڵك زیاتر ئاشنان بە زاراوە عەرەبییەکە بەکاری دەهێنن، بەوێنە :–

قەڵەم – پێنوس

شیعر – هەڵبەست

ئەدەب – وێژە

شاعیر – هەستیار.

لەبارەی زاراوەی ( هەستیار ) هەندێ کەس لەو باوەڕەدان کەزاراوەی ( هەستیار ) بۆیە نەیتوانیوە بڕوات و جێگەی وشەی ( شاعیر ) بگرێتەوە، لەبەر ئەوەی بەوتنی (هەستیار) وشەی

( کەمتیار ) مان بیر دەکەوێتەوە.

ئێمە لەگەڵ ئەو بۆچوونە دانین، بەڵکو ئەمە پەیوەندی بە مێژووی پەیدابوونی وشەکەو چۆنیەتی گونجانی وشەکە لەگەڵ چێژو سەلیقەی زمانی کوردیدا هەیە.

ئەگەر هات و دوو زاراوەی کوردی هاوواتا، بەرانبەر بە زاراوەیەکی عەرەبی هەبوو، پێویستە پەسەندەکەیان هەڵبژێرێن و بەکاری بهێنین و واز لەوی دیکە یان بهێنین، بەوێنە:–

پەیام دار، دەربەست – الملتزم.

## وشەی فارسی

لەنێو ئەو وشانەی، کورد وەریگرتوون، بەشێکیان فارسین کەلەگەڵ زمانی کوردیدا لەیەك خێزانی زمانن.

لەبارەی وەرگرتنی وشەی فارسیش دووبارە بۆچوونی جیاواز هەیە :-

ئێمە لەگەڵ ئەم بۆچوونەداین :-

کە ئەگەر پێویستیی ئەوەی هێنایەکایەوە، کە وشەیەکی فارسی وەربگرین بۆ زمانەکەمان، ئەمە بەکارێکی ئاسایی دادەندرێت، وەخۆمان لەزمانانی دیکە بەکەمتر نازانین، کە ئەگەر وەرگرتنی وشە بێتە پێشەوە درێغی ناکەن ((زمانەکەمان زمانێکی سەبەخۆیەو ناترسین و نایشارینەوە، کە خزمایەتی لەگەڵ فارسیشدا هەیە، زۆر باش دەتوانین، وشەی فارسی وەرگرین، وەك ئەوان کە لەوەرگرتنی وشەی کوردیی و هیچ زمانێکی دیکە سڵ ناکەن))[1].

بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کەبەبێ هۆ وشەی فارسی وەربگرین و لەزمانەکەماندا بەکاریانبهێنین:-

بەوێنە هەندێ لە نووسەران، (( پێشگرو پاشگر ))ە کانیش لەزمانی فارسییەوە وەردەگرن و لەزمانەکەماندا بەکاریدێنن :-

یاخود مۆرفیمی ڕێزمانی وەردەگرن، کەئەمەش زیان بەزمانەکەمان دەگەیەنێت، بەوێنە :- لەزمانی کوردیدا، ئامرازی کۆکردنەوەمان هەیە کە مۆرفیمی (ان)و شێوە مۆرفیمەکانیەتی، بەڵام، هەندێ کەس پاشگری (ها) کە لەزمانی فارسیدا، بۆکۆکردنەوە بەکاردێت، وەردەگرن و هەر بەو شێوەیە وشە کوردییەکانیش کۆدەکەنەوە، وەك (( سەد، جار، هەزار، ملیۆن، ساڵ..))، کە بە کوردی بە (( سەدان، جاران، هەزاران، ملیۆنان، ساڵان...هتد)) کۆدەکرێنەوە، کەچی بە (( سەدەها، جارەها، هەزارەها، ملیۆنەها، ساڵەها... هتد)) کۆیان دەکەنەوە.

لەزمانی ئەدەبیدا، بەکارهێنانی ئەو ئامرازە سینتاکسییە بەپەسەند تر دادەندرێت کە کوردی ڕەسەنە، کە وەکو ئامرازێکی سەرەکی کۆکردنەوەی وشەی کوردی بەکاردێت.

---

(١) هێمن، پاشەڕۆك، ل٢٨.

جگە لەمە بەکارهێنانی هەندێك وشەی زەقی فارسی، وەکو (( میهر، شکستە، پژموردە، بیمارستان... هتد )). کەهەر وشەیەکیان هاوواتای کوردیان هەیە، دەتوانین لە بری ئەوانەدا زاراوەی کوردی ڕەسەن بەکاربهێنین.

هەروەها سەبارەت بە وەرگرتنی وشەی تورکیش هەمان شتە کە نابێ بەبێ هۆکاری پێویست ئەو وشانە وەربگرین و لە فەرهەنگی زمانەکەماندا بە کاریان بهێنین.

## بیرو بۆچونی جیاواز لەبارەی وەرگرتنی وشە لە زمانی عەرەبی — فارسی:

نوسەران لەبارەی وەرگرتنی وشە لە زمانی فارسی و عەرەبی بۆچوونی جیاوازیان هەیە:

١- هەندێ نوسەر پێیان وایە، کە ئەگەر پێویستمان بە وەرگرتنی وشەیەك هەبوو، ئەم وشەیە لە زمانی فارسی وەربگرین باشترە، نەك لە زمانی عەرەبی، لەم بارەیەوە دەڵێن :- ((بە لەبەرچاوگرتنی ئەو ڕاستییەی کە زمانی کوردی سەر بە بنەماڵەی هیندۆ ئەوروپاییەو وە دەگەڵ زمانی فارسی دەچنەوە سەریەك ڕیشە و ڕەچەڵەك، لە بواری ڕیشەییەوە دەگەڵ عەرەبی هیچ پەیوەندییەکی نیە، کاتێك کە لە زەمینەی ڕێنووس ۆ گرامێری زماندا هەر مەسەلەیەك دێتە پێش و ناچاربین بە پێوەری زمانێکی دیکە چارەسەری بکەین، باشترە لە فارسی کەڵك وەربگرین، بۆ وێنە لە هەندێك چاپەمەنیەکانی کوردستانی عێراقدا ئەو چاوگانەی کە لە دوو یان چەند وشە دروست دەبن، بەسەریەکەوەی دەنووسن، وەك : دەست درێژیکردن، دەست پێشخستن، بێدەنگبوون، پشتێکردن، وزۆرشتی لەو بابەتە، هەڵبژاردنی شێوەیەکی ئەوتۆ لە نووسیندا لەژێر تەئسیری (قواعد)ی عەرەبیدا بووە و هۆیەکەشی ئەوە بووە چونکە چاوگی واتە (مصدر)ی ئەوجۆرە کردەوانە وەك یەکانێك چاوی لێ دەکرێ هاتوون و ڕاست ئەو شێوەیان لەسەر چاوگەکانی کوردیش پیادەکردووە و کەڵکیان لێ وەرگرتووە، لە حاڵێکدا دەبوو لەم بارەوە زبانی فارسی وەك ئولگوییەك کەڵکی وەرگیرا با نەك عەرەبی))[1].

هەروەها (هیمن موکریانی) لەم بارەیەوە دەڵێ :-

---

..حی کاویان، کورتەی ئەو شتانەی کەپێم وابووە دەکرێ جێگای سەرنج بن، نوسەری نوێ، ..ل٤٠-٤١.

((کاکە ئێمە لەئەدەبی دەوڵەمەندی زمانی فارسی کە خزمی هەرەنزیکی زمانەکەمانە کەڵك وەردەگرین. وەك نوسەرەکانی ئەو دیونین[*] بەعەرەبی بیربکەینەوەو بە کوردی بنووسین ئەویش بەکوردی داتاشراو. ئەگەر بەفارسیش بیربکەینەوە دیسان زۆر لە زمانەکەی خۆمان دوورناکەوینەوە. چونکە، ڕێزمانەکەمان هێندە لە ڕێزمانی فارسی دوور نییە ))[1].

د. ( عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ ) پێی وایە کە :-

زمانی فارسی، ئەگەر کاریشی کردبێتە سەر شێوەی نوسینی کوردی قاڵبەکەی نەشێواندووە، بەپێچەوانەی زمانی عەرەبییەوە، دەڵێ :-

((فارسیش لەبەرئەوەی ئەچێتەوە سەر گروپی ئێرانی زمانەکانی هیند و ئەورووپی، لەبەر ئەوە ئەگەر کاریشی کردبێتە سەر شێوەی نوسینی شیعرەکانمان، قالبەکەی کوردی نەشێواندووە، بەلآم زمانی عەرەبی کە زمانێکی سامی یە، زۆر لە کوردی دوورە، بۆیە قاڵبی زمانەکەمان ئەشێوێنێ ))[2].

هەندێ نووسەری دیکە، بەپێچەوانەوە بۆ چوونیان وایە :-

لەبەر ئەوەی زمانی فارسی و زمانی کوردی سەربەیەك خێزانە زمانن، داگیرکەری ئێران و هەندێ لە نوسەرانی فارسی هەوڵی ئەوەدەدەن کە بەزۆر ئەوە بسەپێنن کە زمانی کوردی، دیالێکتێکی زمانی فارسییە، واباشترە، کە ئەگەر پێویستمان بەوشە وەرگرتن هەبوو، لە زمانی عەرەبییەوە وەری بگرین نەك فارسی، لەبەر ئەوەی زمانی عەرەبی زمانێکی (سامی) یەو لە رووی ڕێزمان و دەربڕین و وشە دارشتنەوە لە زمانی کوردییەوە دوورە، مەترسی ئەوەی لێ ناکرێ، کە نزیکبوونەوە رووبدات، یان بەدیالێکتێکی زمانی عەرەبی دابنرێت.

---

(*) مەبەست کوردستانی عێراقە.

(١) کەریمی حسامی، یادی هێمن، ل٩٦.

(٢) د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، بۆزمان،ل ١٨١.

((نابێت چاو له فارسەکان بکەین، که زمانێکی زۆر دواکەوتوویان هەیەو لـه عـەرەبی و تورکی ناپوختتره ))[1].

بۆچوونی ئێمه لەبارەی وەرگرتنی وشه، له زمانی عەرەبی یان فارسی ئەوەیه :-

ئەگەر بۆ دەربڕینی مەبەستێك وشەیەکی کوردی ڕەسەنمان نەبوو هیچ جیاوازییـەك نییه، لەوەی که ئەو وشەیه له (( عەرەبی، فارسی، تورکی )) وەربگرین، بەوێنه : - ئایـا چ جیاوازییەك هەیه لەوەی که بۆ دەربڕینی کەرەسەیەك وشـەیەکی کـوردی ڕەسـەنمان نـەبێ، وشەکه له زمانی عەرەبی وەرنەگرین، بەڵکو لەزمانی فارسییەوه وەریبگرین ؟

بۆ نموونه : - ئەگەر هەندێ نووسەری کورد بەوشەی (( پێنوس )) ڕازی نەبن، وشەی (( قەلـەم )) یـش بەعـەرەبی بـزانن، چ سـوودێك لـەوه دایـه وشـەی ( خامـه ) ی فارسـی بەکاربهێنن.

هەرکاتێك زمانەکەمان پێویستی به وەرگرتنی وشه هەبوو، گرنگ نییـه لـه چ زمـانێکی دراوسـێوه وەری دەگرێـت، بـەڵکو گـرنگ سـەرکەوتوویی زاراوه وەرگێراوەکـه و پەسـەند کردنیەتی لەلایەن خەڵکییەوه.

---

(١) فوئاد تاهیر، کورتەی ئەوشتانەی کەپێم وابووه دەکرێ جێگای سەرنج بن، نوسەری نوێ،ژ(١٩)،ل ٤٥.

# زاراوەی جیهانیی

لەم ساڵانەی دواییدا، لەبوارە فەلسەفی و زانستی و تەکنیکییەکاندا، بەتایبەتی لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا، چەندین زاراوەی جیهانی دەبینین، زمانی زۆرینەی ئەو زاراوە زانستیانە زمانی ئینگلیزییە، ئەویش بەهۆی سەرکەوتنی کۆمەڵگەی ئەمەریکییەوە لەبوارەکانی زانست و تەکنۆلۆژیای نوێی پێشکەوتوودا، وەك :—

میکانیزم، پاسەپۆرت، ڕاکێت، مەتریال، ناسیۆنال، مۆدێرینست، مۆدێرنیزم، ئۆرگانیزەکردن، سمبولیزم، ڕاسیزم، سینۆگرافیا، دۆگمائیەت،فانتازیا، یۆتۆپیا، فاشیزم فۆرمەلەکردن، تەکنیك، کلتور، پرۆسە، کۆنکرێت، ئەلتەرناتیڤ، ڕیفۆرم، سیستم، ستراکتۆر، لۆژیك، فۆرم، مۆدیل، ئیستاتیك، سۆسیۆلۆگ، کاپیتالیزم، گلۆبالیزە، دیگیتاڵ، پرۆتستانت، کۆمۆنیزم، ئەنترۆپۆلۆجیا، کۆمۆنیزم، سیستماتیزە، تیۆلۆژی، ئینتەرناسیۆنالیزم، سۆشیال دیموکرات، فیدرالیزم، ئیمپریالیزم، سێنترالیزم، سیمیۆلۆژی، فیلۆلۆژیست، دیالێکتیك، پراکتیزە، ئایدۆلۆژیست، پراگماتیزم، ئەرستۆتالیزم، ئەفلاتونیزم، تیۆکراسی، تۆماویزم، تەکنۆلۆژیا، تەکنۆکراسی، سوریالیزم، دیکارتیزم، یۆتۆپیانیزم، سۆفستایی، فیساگۆرسیزم، ئەتۆمیزم، پلورالیزم، دیالەکتیك، ئینسکلۆپیدیا، کاثولیکیەت، ماتەریالیزم، میتافیزیکیا، پۆزەتیڤیزم، ڕیالیزم، فانتازیا، ماکدۆناڵ، ڤێرتوئێڵ (Virtuell)، ئۆرگانیزە، ئادەرس، ئەتنرۆپۆلۆگ، میتۆلۆجیا، دۆگماخوازی، کۆلۆنیالیزە کردن، پۆست مۆدێرن، مۆدێرن، مۆڵتی میدیاکان، فۆرمی فیزیکی، تەکنۆلۆژیای میدیا، دۆکیومێنت، مانشێت، ئایدیال، سیمای تراژیدی، میتافۆریك، سەنترال، سیناریۆی دیسپۆتیە، کوبیزم، ئۆرفیزم، (orphism)، تۆپۆگرافی، فۆتۆگرافی، ماتماتیك، جیۆلۆجی، بایۆلۆجی، جینۆسایدی، جیۆپۆلیتیك، ڕفرێنس، ئەکتیڤبوون، لیبرالیەت، ئەکتەر، فیلم، کەرنەڤاڵ، ترادسیۆن، لیڤڵ، فاشیزم، ئیمپراتۆریەت، ئەکادیمیەت، پۆست کۆلۆنی، تۆتالیتێر، کۆمەڵگای ڕیسك، سیستەماتیك، سکێچێکی مەنفا، ئارگۆمێنت، پرەنسیپ، ئۆنیڤێرساڵ، ئیدیۆم، پەرەگراف، پارادۆکس، پارادایم، مۆرفۆلۆجی ، سۆشیالیزم، لۆژیکی فۆرماڵ، پرۆگرام، یۆتۆپیاسازی، کۆلۆجیا، فۆنکشن، ڕسیۆنالیزم... هتد.

بێگومان هەبوونی ئـەم ژمـارە زۆرەی زاراوەی جیهـانی و بـەکارهێنانیان لـەزمانی کوردیـدا جێگـەی پرسـیارو تێڕامانـەو نوسـەران و زمانـەوانان و پـسپۆران لـەم بـارەیوە بیروبۆچوونی جیاوازیان هەیە :-

هەنـدێ نوسـەر بـەکارهێنانی زاراوەی جیهـانی و رەنگدانـەوەیان بۆسـەر زمـان بەکارێکی نێگەتیڤانە دادەنێت بەوێنە :-

(( ئێمە کاتی خۆی خواخوامان بوو زمانەکەمان لـەو شـێوە نووسـینەی چـلەکان و پێش چـلەکان پـاك بێتـەوە، کەچـی تـازە بـە سـەدان وشـەی بێگانـە دەئاخرێتـە نـاو نووسـینەکانەوە، کەزۆربـەی هـەرە زۆری نوسـەران واتـای ئـەو وشـانە نـازانن و کـەڵك لـەو نوسینانە وەرناگرن، دەبێت هەریەکە فەرهەنگێکی ئینگلیزی یا فەرەنسی یا ئـەڵمانی بخاتـە بندەستیەوە، تا ئەو وشانە ساغ بکاتـەوە، ئەمـەیش چـەندەیەکی نموونـەی زۆر کـەمی ئـەو وشـانەیە : ( پـۆلێنکردن، فاکتـەر، پرەنـسیپ، ئەبـستراکت، ئەلتـەرناتیف، ئایدیالیـست، ماتەریالیست، ریفۆرمیت، ئارکۆلۆژیا، ئەنارشیزم، پۆرترێت، دیفـاکتۆ، فۆنـەتیك، فرایزۆلـۆژ، کۆنترۆڵ، سیمبۆلیزم )) [(١)].

هەنـدێ نوسـەری دیکـە پێیـان وایـە، ئـەو زاراوە جیهانـەی کـە دێنـە نـاو زمـانی کوردییەوە ئەگەر هات و بە ئاسانی نەیەنە سەرزمان و گۆنەکرێن، لەگەڵ زمانی کوردی بیان گونجێنین :-

((ئەگـەر زانیمـان وەك خۆیـان بەئاسـانی نایەنـە زمـانی کوردییـەوە، دەسـتیان پیـابهێنین و ڕختـەیان بکـەین، وشـەیەکی وەك ( فیتـەر ) ئەگـەر ڕۆژی چـەندین جـاریش لەئاخاوتن و نووسینی کوردییا بەکاری بهێنین، هیچ گرێوگۆڵێکی تیا نابێ، بـەڵام وشـەیەکی وەك (ئەنتەرناشـینال ) وشـەیەکی سـووك و ئاسـان نییـەو کـوردی ڕەمـەکی لـەخۆڕای نییـە بەسـەلیقەی سـادەی خـۆی کردوویـە بـە ( عەنتـەرناش ) و، ئەگـەر ئێمـەیش بڕیـاری سووکترکردن و بـە ( ئەنتـەرناش ) کردنـی بـدەین زۆر لـە جێـی خۆیایـەتی و باشـتر لەگـەڵ سەلیقەی زمانی کوردی ئەگونجێ )) [(٢)].

---

(١) جەلال مەحمود عەلی، فەرهەنگسازی، نوسەری نوێ، ژ(١٩)، ل ٦٣.

(٢) محەمەدی مەلا کەریم، کۆبوونەوەیەك بۆ گفتوگۆ لەبارەی زاراوەوە، گۆڤاری کۆڕی زانیاری ((دەستەی کورد))، ل٣٠٨ – ٣٠٩.

زمانی ئینگلیزی كه تایبەتمەندی ئاسانی و خێرافێربوونی تێدایە، ئامادە باشی تێدایە ببێتە ئەو زمانە جیهانییەی كه لەئایندەدا هەموو جیهان بەكاری بهێنێت.

(( لەبەر ئەوە زۆرێك لە نوسەران و ڕوناكبیران پێیان وایە هاتنە ناوەوەی ئەم زاراوەو وشانە بە زمانە بنەڕەتەكەیان بەسەرچاوەی هەڕەشە بۆ سەر زمانە نیشتمانییەكان دادەندرێت، بۆیە پێویستە ڕێگە لە بڵاوبوونەوەیان بگیرێت یان ڕاستترە بڵێین پێوستە بۆ سەر زمانی بنەڕەتی كۆمەڵگان وەربگێڕێن ئەمەش لە پێناوی نزیككردنەوەیان لە عەقل و بیركردنەوەی تاكەكانی كۆمەڵ پاشانیش بۆ پاراستنی ناسنامەی نیشتمانی ئەو كۆمەڵگەیە))[1].

بۆیە هەندێ لە نوسەرانی كوردیش، هاتنە ناوەوەی ژمارەیەكی زۆر لە زاراوەی ئینگلیزی بۆ ناو زمانی كوردی، بەسەرچاوەی هەڕەشە بۆ سەر فەرهەنگی زمان و ناسنامەی نەتەوەیی دادەنێن.

هەندێ نوسەری دیكە پێیان وایە، بۆ ئەوەی زمانی كوردی، شان بەشانی زمانەكانی دیكە بڕوات و كەڵك لەشارستانیەتی سەردەم ببینێت، دەبێ زاراوەی جیهانی وەربگرین :-

(( ڕاستیەك هەیە دەبێ هەموومان بیزانین شتێك نییە تەواو پەتی بێت، هەموو زمانێك دەبێ لەگەڵ زمانەكانی تر بڕوات، زمانی كوردی بۆ ئەوەی شانبەشانی زمانەكانی تر بڕوات واتە كەڵك لەشارستانیەت و پێشكەوتنی زمانەكانی تر وەربگرێت چوار ڕێگای لەپێشە :

وەرگرتنی وشە كەوەكو خۆی، یان تەلەفوزكردنی بەپێی فۆنۆلۆژی زمانەكە وەك كتاب بۆتە كتێب، یان وەرگێڕان، یان فراوانكردنی واتای وشەكان یان داڕشتنی وشەكە بەپێی سوود وەرگرتن لە زمانەكە خۆی ))[2].

بەباوەڕی ئێمە :-

---

(١) د.ئەحمەد ئەبو زەید، (و): بەرزان جەمال، جیهانگیری ومردنی زمانەكانی دی، زانستی سەردەم،ژ(٢٣)، ل١٦٨.

(٢) د. یوسف شەریف، فەرهەنگسازی،نوسەری نوێ، ژ(١٩)،ل ٧١.

زاراوه جیهانییه‌کان له‌هه‌موو زمانێکی پێشکه‌وتوودا هه‌یه. له‌به‌ر ئه‌وه هه‌ندێك وشه‌ی ئه‌وروپایی هه‌یه، پێویست ناکات وه‌ریانبگێڕین، ((بۆ نموونه ( Television ) به‌زمانی ئینگلیزی، هه‌روه‌ها ڤیدیۆ، کامیرا، میکرفۆن، ڕادیۆ، پرۆتۆن / نیوترۆن. ڤۆلت. ئه‌لیکترۆن، ستدیۆ...هتد. وشه‌ی جیهانین هیچ سوودێکی نییه بکرێنه کوردی و به‌کار هێنانیان وه‌کو خۆی به‌خه‌وشی زمان دانانه‌درێت، له‌هه‌موو زمانه ئه‌وروپاییه‌کاندا به‌کارده‌بردێت، زمانی زیندووش ئه‌و زمانه‌یه که بتوانێ ئه‌م وشه نوێیانه بگرێته باوه‌شی و له ژیانی ڕۆژانه‌یدا به‌کاریانبهێنێ. هه‌ر چه‌نده هه‌ندێك که‌س له‌گه‌ڵ ئه‌و بۆچوونه‌ن که ده‌بێ هه‌موو زاراوه‌یه‌ك وه‌ربگێڕدرێته سه‌ر زمانی کوردی، به‌ڵام ئه‌مه کارێکی ئاسان نییه و به‌گران ده‌وه‌ستێ، زمان یاسای تایبه‌تی خۆی هه‌یه، پێویسته مرۆڤ، له به‌کارهێنانیدا په‌یڕه‌وی بکات له‌به‌رچاوی بگرێت)) (1).

ئه‌و زاراوانه‌ی که‌له‌گه‌ڵ بابه‌ت و شته‌که دێنه زمانه‌که‌و به‌ئاسانی جێگه‌ی خۆیان ده‌که‌نه‌وه، وه‌ك ئه‌و وشه‌و زاراوانه‌ی که له‌بواره جۆراوجۆره‌کانی زانست و مۆسیقاو زۆربواری دیکه‌وه له سه‌رانسه‌ری جیهان و له‌هه‌موو زمانه‌کان وه‌رگیراون و قبول کراون وه‌ك:- دکتۆر و سه‌مفۆنی و ئیمه‌یڵ وشه و زاراوه‌ی دیکه‌ی له‌و بابه‌ته‌و، ده‌ست لێدانیشیان کارێکی ئاسان نییه، له‌کاتێکیشدا که بمانه‌وێت، زاراوه‌ی کوردی له جیاتی زاراوه‌ی جیهانی دابنێین، ده‌بێ ئاسان بن و له‌گه‌ڵ چێژو سه‌لیقه‌ی کورده‌واریدا بگونجێن. ((زاراوه به‌زۆر دانانرێ و وه‌کوته‌وق ناکرێته ملی خوێنه‌ران و نوسه‌ران، به‌ڵکو به‌پێی پێویست وشه‌ی نوێ دروست ئه‌بێ و له شوێنێکی تایبه‌تیدا به‌کار ئه‌هێنرێ))(2)، به‌م جۆره بۆمان ده‌رده‌که‌وێت، که وه‌رگرتنی زاراوه‌ی جیهانیی، به‌پێی یاسای زمانه‌وانی ده‌بێ و سنورێکی دیاریکراوی خۆی هه‌یه، له‌م بارانه‌ی خواره‌وه وه‌کو شتێکی زیاد دێته ناو زمانی کوردییه‌وه :-

١- هه‌ندێ له‌نووسه‌ران به‌هۆی ئه‌وه‌ی ژیانیان له‌هه‌نده‌ران بردۆته سه‌ر، دوای گه‌ڕانه‌وه‌یان بۆ کوردستان، زاراوه‌ی ئه‌و زمانانه به‌کارده‌هێنن. یان هه‌ندێ که‌سی خاوه‌ن بڕوانامه‌ی به‌رز، به‌بێ هۆکاری پێویست، زاراوه‌ی زمانی ئینگلیزی له‌کاتی ئاخاوتن یان له نوسیندا به‌کار ده‌هێنن. هه‌چه‌نده به‌رانبه‌ر به‌شێکی زۆر له‌م زاراوانه وشه‌ی کوردی ڕه‌سه‌نیش

---

(١) د. که‌مال مه‌عروف، ئه‌ده‌بیاتی کلاسیکی و نوێخوازی کوردی،ل ١٢٥.

(٢) غازی فاتح وه‌یس، کتێبی زاراوه‌ی کوردی و چه‌ند تێبینییه‌ك، گۆڤاری کاروان،ژ(٢٤)،ل ٩.

هەیە. کەئەمەش بێگومان زیان لەفەرهەنگی زمانی کوردی دەدات، لەکاتێکدا زمانێکی ئەوەندە نزم و لاوازمان نییە، تا بەلێشاو وشەی جیهانی بەکاربێنین. لەم بارەیەوە نموونەمان زۆرە، تەنانەت هەندێ نوسەر هەتا وشەو زاراوەی جیهانی هەبێ، وشەی کوردیی ڕەسەن بەکارناهێنن بەوێنە :-

هەرچەندە لە زمانی کوردیدا، زاراوەی (دووانە) هەیە کەچی زاراوەی (دوالیزم)ی جیهانی بەکاردەهێنن و لەجیاتی (مرۆڤی ژیر) (هوموسابیەن) بەکاردەهێنن، لەبری (سۆز) زاراوەی (باتۆس) بەکاردەهێنن، لەجیاتی (پاوانکاری) زاراوەی (مۆنۆپۆلی) بەکاردەهێنن، لەبری : (جیهانگەرایی) زاراوەی (گلۆبالیزم) و لەجیاتی (چەقگیری) زاراوەی (سێنترالیزم) بەکاردەهێنن.

٢- هەندێ لەم زاراوانە، زۆر قورس و لەسەر زمان گرانن، بۆ تێگەیشتنیان پێویستمان بەبەکارهێنانی فەرهەنگ دەبێت، نەك چینی نەخوێندەوار، بەڵکو چینی خوێندەواریش بەئاسانی تێیان ناگەن، بەوێنە : -

پرۆتستانتیزم، سیکۆلاستیکیزم، ترانسندنتال، میستاسیزم، کالیڤیزم، گلۆبەلازەیشن، ئەنترۆپۆلوگ، پۆلیتۆلۆگ، سایبەرفاشیزمۆس ( Cyberfashismus)، ئەلکترۆموگناتیسی، ئەنتیگراشیۆن، ئەپۆکالیپتیسی، کۆتزەرفاتیفیەن، مۆنۆپۆل کردن، کۆلاژی ئایدۆلۆژی، سیکیولاریزەیشن (Secularization)، هیترۆتۆپیا، تەکنیکی ترانسپلانتاشیۆن، فەندەمانتالیزمی ئەخلاقی، پۆلیتۆلۆگ، سۆسیۆلۆژیا، ئەنیستتیۆتەکان، سیستماتیزە، ئەرثۆزۆکسیەت، ئینتەرناسیۆنالیزی کۆمۆنیزم، فیلۆلۆژیستەکان، تیۆلۆژسیتەکان، فۆرمیولای ناسیۆنالیزمی، ئۆرینتالیست، نیوپلاستیزیسم ( newplastizm)، کوبیزی سینتینیزم، کۆنستروکتیڤیزم، سیستمی تۆتالیتێر، مۆبیلیتێتی، ئەمبیڤالیتێر، گلۆبالێرکردنی سینیزم، کورپواتیڤیزم، میلێنێومی میتافیزیك، ئۆکسیدێنتالیزم، سێکیولاریزم، ئۆرینتالیستیانەی تەقلیدی، ترادسیۆنی کۆتێنتاڵ، ئەزمونی پەرلەمانتاریزم...هتد.

هەروەها بۆچوونی جیاواز هەیە، لەبارەی وەرگرتنی وشە لە زمانە دراوسێیەکان، یان جیهانییەکان :ـ

لەبەر ئەوەی میللەتی کورد لەمێژوودا داگیرکراوە، هەمیشە زمانەکەی وەك چەکێکی کاریگەر لەپێناو خۆچەسپاندن و مانەوە بەکارهێناوە و ترسی لەناوچوونی هەبووە، بۆیە جۆرە هەستیاریەکی نەتەوەیی لەلا دروست بووە، جا لەبەر ئەوە هەندێك کەس پێیان باشترە کە زاراوە جیهانییەکان بەکاربهێنن، نەك ئەوانەی دراوسێ، چونکە وشە جیهانییەکان لەهەموو زمانەکانی جیهان بەکاردێت.

بۆیە پێیان وایە، ئەگەر پێویستیمان بە وەرگرتنی وشەیەك هەبوو، نابێ ئەو وشەیە لە زمانی نەتەوە باڵا دەستەکانی کوردستان وەربگرین، بەڵکو پێویستە، ئەو وشانەی لە زمانی کوردیدا نین، بەرانبەرەکانیان بدۆزینەوە، یان لە زمانی لاتینی وەریانبگرین، ، هەموو گەلانی سەر ڕووی زەوی، بەبێ جیاوازی دەتوانن، کەڵك لە زمانی لاتینی وەربگرن.

( د. کەمال مەزهەر ) لەبارەی زمانی لاتینیەوە دەڵێ :ـ

(( زمانی لاتینی، دەتوانرێ، بەئاسانیی وشەی لێ وەربگیرێ و وشەی تازەی لێ پێکبێنرێ، لەڕووی دەربڕینیشەوە زاراوەکانی لەسەر زمان سووکترو ڕەوانترن )) (١).

بە بۆچوونی ئێمە :ـ

بەکارهێنانی ئەو وشانە کەلە دراوسێکانیشەوە وەری دەگرین ( کەهەندێك بە وشەی (بیانی ) ناویان دەبەن ) ئەگەر لە جێگەی پێویستی خۆیاندابوون هیچ کارێك ناکاتە سەر زمانەکە. بەڵام ئەگەر توانیمان وشەیەکی کوردیی خۆماڵی لەجێگایاندا دابنێین و وشەکە چەسپاو لەگەڵ زمانەکە ڕێککەوت و لەناو خەڵکیدا بڵاو بۆوە پێویست بەو وشانە ناکات، واتە نابێ بەبێ هۆ وشەی ئەو زمانانە وەربگیرێ و بەکاربهێندرێ.

ئەگەر چەند وشەیەکمان بەرانبەر بەواتایەك لەزمانی کوردیدا هەبێ، بۆچی یەکێك لەو وشانە بەکارنەهێنین و بەدوای وشەیەکی دیکەی، یەکێ لەزمانە دراوسێیەکانماندا بگەڕێین ؟

---

(١) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، ڕێنیسانس، ل٨١.

بەوێنـە :- (( (( کەشـتی، گـەمێ )) ی کوردیمـان هـەبێ، کەچـی هەنـدێ کـەس وشەی (باخرە)ی عەرەبی بەکاردەهێنن، یان وشەی ((زۆر، گەلێ، فرە ))ی کوردیمان هەبێ، بۆچی وشەی (( خەیلی )) ی فارسی بەکاربهێنین. یاخود وشەی ((بەیان)) کەلە ((بیاض))ی عەرەبیەوە وەرگیراوە، لەکاتێکدا وشەی (( پاکنووس ))ی کوردییمان هەیە))[1].

یاخود لەکاتێکـدا پێشگری ((بـێ)) مـان هـەبێ بۆمانـای (( نـەرێتی ))(( بەکـەڵك، بێکەڵك، بەشەرف، بێشەرف، بەدەماغ، بێدەماغ )) بۆچی پاشكۆی ((سز)) بـەكاربێنین :- (( شەرف سز، دەماغسز... هتد )).

بەلام ئەگەر پێویـستی زمانەکـەمان هاتـە پێـشەوە بـۆ وەرگرتنـی زاراوە، لـەزمانی کوردییدا بەرانبەر بە هەمان واتـا وشـەی کـوردی ڕەسـەنمان دەسـتنەکەوت. دەتـوانین ئـەو وشـەیە لـە زمانـە دراوسـێکانەوە وەربگـرین، یـاخود بـۆ پڕکردنـەوەی ئـەو کەلێنـە زاراوەی جیهـانی بـەکاربهێنین و بـە وەرگرتنـی هەریـەکێکیان کـارێکی بـاش دەکـەین، چـونکە هەمەڕەنگی سەرچاوەکانمان دەردەخات، پشت نەبەستن بەیەك سەرچاوە کارێکی پەسەندە و لەگـەڵ ئـەو زاراوە کوردییانـەدا کـە خۆمـان دروسـتیان دەکـەین زمانەکـەمان دەوڵەمەنـد دەبێت.

دەمانەوێ تایبەتمەندی خۆمان بپـارێزین، بـا سەرچـاوەی زاراوە وەرگرتنمـان یـەك زمـان نـەبێ، ئەگەرچـی جیهـانیش بـێ، بـەبیانووی ئـەوەی ئێمـە داگیرکـراوین، جـۆرە هەسـتیارییەك لامـان دروسـت ببێـت و دووربکەوینـەوە لـەوەرگرتنی زاراوە لـە زمانـە دراوسێیەکان، بەوێنە :-

لەبەر ئەوەی زاراوەکە عەرەبییە، ئیدی لەناو خەڵکیشدا ڕۆیشتبێ، هەرجیهانییەکە بەکاربهێنین، کەئەوە کارێکی خراپ دەکاتە سەر فەرهەنگی زمانەکەمان.

زمانەکەمان دەوڵەمەند دەبێت ئەگـەر هـاتوو زاراوەی کوردیمـان نـەبوو، لـەجیاتی یەك سەرچاوە، بالەچەند سەرچاوەیەکەوە وەری بگرین. لەوەیان زمانەکەمان نا کەوێتە ژێـر کاریگەری یەك زمان بەتایبەتی.

لەبەر ئەوە ئاساییە، ئەگەر ئێمە وشـەیەکمان وەرگرتبـێ لـەزمانی عـەرەبی یـاخود فارسی و تورکی، ئەم وشەیە شوێنی خۆی گرتبێ و بووبێتە خۆماڵی و بەکاری بهێنین.

---

(١) حوسێن محەمەد عەزیز، سەلیقەی زمانەوانی و گرفتەکانی زمانی کوردی، ل٤٦٣ - ٤٦٤.

هەندێ زاراوەی جیهانی هەیە، کە بەرانبەریان هاوواتای کوردی هەیە بۆچوونی جیاواز لەم بارەیەوە دێتەکایەوە، کە کام لەو زاراوانە بە کاربهێنین، ئایا هەردووکیان لەزمانەکەماندا بمێننەوە و بەکاریان بیهێنین ؟

بەوێنە :-

ڕیفراندیۆم – ڕاپرسی

کەئەمڕۆ هەردوو زاراوەکە لەزمانی کوردیدا بەکاردێت.

بۆچوونی ئێمە لەم بارەیەوە ئەوەیە :-

ئەگەر زاراوەی ((ڕاپرسی )) دوورایی تەواوی واتای (( ڕیفراندیۆم )) ی جیهانی بدات و لەناو خەڵکیدا بڕوات، واباشترە زاراوە کوردییەکە بەکاربهێنین لەبواری نوسین و زمانی ئەدەبیدا، بەڵام ئەگەر زاراوە کوردییەکە ئەو توانایەی نەبوو، هەردوو زاراوە ( کوردی – جیهانییەکە ) شان بەشانی یەکدی بەکاردەهێندرێن، تاوەکو یەکێکیان بە تەواوی دەچەسپێت و دەبێتە زاراوەیەکی سەربەخۆ.

هەروەها هەمان شتیش سەبارەت بەزاراوەکانی : –

سۆسیۆلۆژی – کۆمەڵناسی

جیۆلۆژی – زەویناسی

سمبۆلیزم – هێماگەری

سایکۆلۆژی – دەرونزانی

مۆنۆیزم – تاکگیر

پسپۆر – شارەزا – تایبەتمەند...هتد.

١- زاراوەی جیهانی - عەرەبی

هەندێ زاراوەی جیهانی و عـەرەبی، کـەهاوواتان لەفەرهـەنگی زاراوەسـازی زمـانی کوردیدا دەبینرێت، وەك :- ئۆتۆنۆمی - حوکمی زاتی

پۆلس - شورتە

ئۆپۆزیسیۆن - معارەزە

کافتریا - حانوت

باگراوند - خلفیە

کۆپی - استنساخ... هتد.

ئەگەر بتوانرێ زاراوەیەکی کوردی خۆماڵی لەجیاتی هـەردووکیان بەکاربهێنـدرێت و لـەنێو خەڵکیـدا بـڕوات و بـەکاری بهێـنین پەسـەندترە، بـەلام ئەگـەر ئەمـە نـەکرا، ئـەم دوو زاراوەیە شان بەشانی یەکدی دەڕۆن تاوەکو یەکێکیان شوێنی ئەوی دیکەیان دەگرێتەوە.

کامیان زیاتر شوێنی خۆیان گرتووەو لەگەڵ سازگەی زمانی کوردیدا گونجێنراون و لەلایەن قسەپێکەرانەوە پەسەندترە، ئەویان بکرێت بە زاراوەیەك و بەکاربهێنرێت.

٢- لەکاتێکـدا هـەردوو زاراوەکـە ( جیهـانی - عـەرەبی ) بەیـەك ئاسـت و ڕادە لەناوخەڵکیـدا بلاوبووبنـەوە، واباشـترە، لـەزمانی نوسـیندا، زاراوە جیهانییەکـە بەکاربهێندرێت.

٣- زاراوەی ( جیهانی - عەرەبی - کوردی )

| | | |
|---|---|---|
| جینۆساید | قەتل و عام | بەکۆمەڵ کوژیی/ ڕەشەکوژی |
| نێگەتیڤ | سلبی | نەرێتی |
| پۆزەتیڤ | ئیجابی | ئەرێ |

بەبۆچـوونی ئێمـە :- ئەگـەر زاراوە کوردییەکـە بـچەسپێت، ئـەویان بـەکاربهێنین باشـترە، وەئەگـەر نـەتوانرا زاراوە جیهـانی وعەرەبیەکـە، کامیـان لەلایـەن خەڵکیـەوە پەسندکراو توانای ڕۆیشتنی هەبوو، ئەویان بەکاربهێنین.

# وەرگێـــڕان

دەبێ لە وەرگێڕانـدا ئاگاداربین، بەجۆرێك ئەم كارە ئەنجام بدەین كە لەگەڵ ڕێزمانی زمانی كوردیدا بگونجێت، بەوێنە :-

بەپێی ئەو بۆچوونەی كەزمان لەشێوەی هەرەم دایە :-

ڕستە

فرەیز + فرەیز

وشە + وشە + وشە + وشە

مۆرفیم + مۆرفیم + مۆرفیم + مۆرفیم + مۆرفیم

فۆنیم + فۆنیم + فۆنیم + فۆنیم + فۆنیم + فۆنیم + فۆنیم

لای بونیادگەرەكان : - لەدانە پێكهێنەرەكانەوە بەرەو ڕستە دەچن.

لای چۆمسكی :- لەڕستەوە بەرەو دانە پێكهێنەرەكان، دەچێت.

واتە : بۆچوونی یەكەم : - لەبچووكەوە بۆ گەورەیە.

بۆچوونی دووەم : - لەگەورەوە بۆ بچووكە.

زمان لەچەند ئاستێكی جیاواز و تێكچڕژاو پێكهاتووە، ئەم ئاستانە لەكەرستە پێكهاتوون. هەریەكە لەم كەرەسانەش، پەیوەندییان بەیەكەوە هەیە، بەڵام بە ڕادەو پلەی جیاواز. بۆیە دەبێ پەیوەندییە كان بدۆزینەوە، هۆكاری ئەو پەیوەندییانەش بدۆزینەوە.

بەوێنە :- هەندێك وەرگێڕان كەلەزمانی عەرەبییەوە، یاخود لەزمانێكی دیكەوە بۆسەر زمانی كوردی دەكرێت، تێبینی ئەوەی تێدانەكراوە كەدەبێ ئەم وەرگێڕانە، قالبێكی كوردانەی بەبەردا بكرێت و لەگەڵ دەستوری ڕێزمان و چۆنیەتی ڕیزبوونی كەرەسەكان لەڕستەی زمانی كوردیدا، گونجاوبێت، وەك :-

١- وەرشەی ڤیانی ئەلیكترۆنی

كە ئەمە یەكسەر لەزمانی عەرەبییەوە وەرگێردراوە بۆ زمانی كوردی :-

ورشة ڤیان الالكترونیة.

كەپەسەندترە وەرگێڕانەكە بەم شێوەیە بێت :-

وەرشەی ئەلیکترۆنی ڤیان .

یان : هۆڵی چۆپی خێزانی.

کەپەسەندترەکەی :-

هۆڵی خێزانی چۆپی یە.

لەبەر ئەوەی بەپێی یاسای ڕیزبوونی کەرەسەکان لەزمانی کوردیدا، دیارخەر لەچەند حالەتێکی تایبەتیدا نەبێ، هەمیشە دەکەوێتە دوای دیارخراو، بەم جۆرە :-

وەرشە : — دیارخراوە

ئەلیکترۆنی : — دیارخەرە







واپەسەندترە بڵێین :- ( وەرشەی ئەلیکترونی )

( هۆڵی خێزانی )

هەروەها :- فڕنی ئۆتۆماتیکی سەرچنار.

نەک : — فڕنی سەرچناری ئۆتۆماتیکی.

یان : — بانکی ناوەندیی سلێمانی.

نەک :— بانکی سلێمانی ناوەندیی.

دەڵێین و دەنووسن (( جەنگی جیهانی یەکەم.

جەنگی جیهانی دووەم ))[1].

( یەکەم جەنگی جیهانی ).

(دووەم جەنگی جیهانی ).

ئەم ڕستانە، هەموویان پەسەندن، بەڵام سێیەم و چوارەمیان پەسەندترن، لەبەر ئەوەی:-

١. مەبەست جەنگی جیهانییە، نەك جیهانی یەكەم و جیهانی دووەم.

٢. بەپێی ئەوەی ( ژمارە ) دەبێتە دیارخەر، كە ئەمەش یەكێكە لەو حاڵەتە تایبەتییانەی زمانی كوردی، كە ( دیارخەر ) پێش دەكەوێت :-

(( ژمارە لەڕۆڵی دیارخەردا چ بنچی بێ و چ پلەیی بێت و بەیارمەتی نیشانەكانی (- ە م - ە مین)ەوە دارێژراو بێت دەوری دیارخەر دەگێرێت ژمارە بەهۆی پێوەندی لێكدەری سینتاكسیەوە بەدیارخەرەوە دەلكێت و دەكەوێتە پێش ئەوەوە )) [2].

ئەو كەرەسانەی پەیوەندییان بەیەكەوە زیاترە حەزدەكەن و مەیلیان هەیە بەلای یەكەوە بن، لەمەشدا ڕیزبوونەكەیان ڕەچاودەكرێت ( یەكەم) دەرخەرەو پێش دەكەوێت.

ئێمە لێرەدا دەربڕینی (پەسەند و پەسەندتر ) بەكاردەهێنێن، بەو پێیەی لە زانستی زمانەوانیی نوێدا، هەموو دەربڕینەكان پەسەندن، بەڵام هەندێ دەربڕین لەڕووی دەستورە زمانەوانییەكان و چۆنیەتی دارشتنی ڕێزمانییەوە، لەوانی دیكە بەپەسەندتر دادەندرێت، لەكاتێكدا لە زانستی زمانەوانی كۆندا هەندێ دەربڕین دروستەو هەندێ دەربڕینی دیكە دروست نییە و بەهەڵەی زمانەوانیی دادەندرێ.

پێویستە ئەو نوسینانەی، كەبۆ سەر زمانی كوردی وەردەگێڕدرێن، لە قاڵبێكی كوردی ڕەسەن دابڕێژرێن، ڕستەكان وەك زمانی عەرەبی و فارسی و توركیی و زمانانی دیكە دانەڕێژن، واتە بەكوردی بیربكەینەوە و بەكوردی بنووسین.

(( ڕستەی وا دەبینرێ، هەموو وشەكانی كوردی ڕەسەنن، كەچی تێی ناگەین، ، لەسەر ڕێزمانی عەرەبیی دارێژراوە. ئەویش، زۆر لەڕێزمانی كوردی دوورە )) [3].

---

(١) فوئاد تاهیر سادق، هۆشیاری زمانەوانی،ل ٤٦.

(٢) كوردستان موكریانی، سینتاكسی ڕستەی سادە لەزمانی كوردیدا، ل ١٢٨.

(٣) هێمن موكریانی، پاشەڕۆك،ل ٢٩.

بەوێنە :– وەرگێڕانێکی وەکو :– بخۆرەوە شەربەتی مێوژ.

کەوا پەسندترە وەرگێڕانەکە بەم شێوەیەبێت :–

شەربەتی مێوژ بخۆوە.

١– ڕستەکە پێك هاتووە لە :– ( ف. ن + ف. ك )




( بخۆرەوە ) دەربڕینێکی ناوچەیی یە، هاتنی ( رە) بۆ ناوکارەکە پێویست نییەو، ئەرکێکی زیادە.

جگە لەوە واپەسەندترە لە ڕیزبوونی کەرەسەکان لەزمانی کوردیدا، فرەیزی ناوی لە پێش فرەیزی کاریەوە بێت، لەمەوە چەوتی وەرگێڕانی ( وشە بەوشە ) دەردەکەوێت، کەزۆربەی کات مەبەست ناپێکێ و ڕاستیش ون دەکات. نموونەی وا لە وەرگێڕداروەکانمان زۆرە (( وەك ئەوەی ( قلم رصاص )، کە هیچ پەیوەندییەکی بەقورقوشمەوە نییە و واتا عەرەبیەکەشی چەوتە، وەرگێڕدرابوو بە (پێنوسی قورقوشم) کەبوترێ پێنوسی (گرافیت) یان (خەڵوز) ڕاسترە)) [1].

---

(١) جەمال عەبدول، بەرکولێکی زانستە زاراوەسازی کوردی،ل٧٥.

(( یاخود لەزمانی ئینگلیزیدا، لەکاری هەڵکەندن ( حفاری ) بیردا، بەبیر یان چاڵی ژێر تاقیکردنەوە wildcat دەگوترێ. کەمانای ڕاستەقینەی ئەم زاراوەیە ( پشیلەی وەحشی)یە))[1].

لەمەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە پێویستە پێش ئەوەی سەیری زمانە واتا بکەین، سەیری واتای زارەکە بکەین، پیت بە پیت وەرنەگێڕین مەگەر بەتەواوی لەگەڵ زاراوە واتا دا جووت بێت.

هەروەها هەندێ لە نوسەرانی کورد، نوسینەکانیان لەقالبێکی فارسی دادەڕێژن، کەلە ڕووی ڕێزمانەوە لەگەڵ زمانی کوردی بەتەواوی ناگونجێن، بەوێنە :-

(( دیارە لەوەها بارێکی ئالۆزدا هۆنراوەکان و شوێنەوارەکانی مەستورە دەستاو دەست کەوتووەو لەناو چووە ))[2].

لە سەرەتادا، دەبێ ئەوە ڕوون بکەینەوە، کە ( وەها ) دەربڕینێکی فارسیەو لە کوردی (( وا)) دەنوسرێ، ((جگە لەوەش (( وەها )) یان (( وا )) لەبەر ئەوەی دیارخەرە (ئاوەڵناوەو وەسفی ( بارەکە ) دەکات)، پێش وشەی (( بارێکی )) ناکەوێ، لەبەر ئەوەی ئاوەڵناو کە ڕۆڵی دیارخەر ببینێت، لەپێش (( دیارخراو )) ەوە نایەت. بۆیە ڕاستتر وایە بنووسرێ : (( لەبارێکی وا ئالۆزدا )) ))[3].

بۆیە پێویستە، ئەو نوسینانەی کەلە زمانەکانی دیکەوە، بۆسەر زمانی کوردی وەردەگێڕدرێن، زمانزانان و کەسانی پسپۆڕ پێیان دا بچنەوە و لێکۆڵینەوە و گفتوگۆیان لەبارەوە بکرێت، بۆ ئەوەی نوسینەکانمان قالبێکی کوردانەی ڕەسەنیان پێوەدیار بێت و لە دەستورێکی زمانەوانیی ڕاست و دروست دابڕێژرێن.

هەروەها زمانی کوردی ، لەبواری زاراوەی تەکنیکی زانیستەکاندا ، دووچاری هەندێ گرفت بۆتەوە، هۆی سەرەکی ئەم گیروگرفتانە بەگشتی ئەمانەن :-

---

(١) ئامیرە سەففارزادە (و) : قادر وریا، بنچینەکانی وەرگێڕان، ل٣٩ – ٤٠.

(٢) سەدیق بۆرەکەیی، دیوانی مەستورەی کوردستانی،ل٥.

(٣) حوسێن محەمەد عەزیز، سەلیقەی زمانەوانی و گرفتەکانی زمانی کوردی،ل٢٩٦.

## ١- ژێردەستەیی :

زمـانی کـوردی ، کەئـەمڕۆ زمـانی زگمـاکی زیـاتر لەچـل ملیـۆن کەسـە ، هەمیـشە ئامانجێکی سەرەکی ڕاستەوخۆی سیاسەتی داگیرکـەرانی کوردسـتان بـووە. زمـانی کـوردی بەدرێژایی مێژووی کۆلۆنیبوونی کوردستان وبەتایبەتی لەسەدەی بیستەمدا ، لەکێـشمەکێش و زۆرانبازی نێوان کوردو داگیرکەرانیدا بەکارهێنراوەو کاریگەری ئەو زۆرانبازیانەشـی پێـوە دەرکـەوتووە. قەدەغـەکردنی زمـانی کـوردی لەلایـەن هـەموو داگیرکـەرانی کوردسـتانەوەو سەپاندنی زمانی خۆیان بەسەر کوردیدا ، ڕۆڵی زۆری بینوە لەسنورداركردنی زمـانی کـوردی (( بەکارهێنانی هەر زمانێ سنووردار بکـرێ ، توانـای ئـەو زمانـەش سـنوردار دەبێتـەوە))[1] داگیرکردنی کوردستان چ لەلایەن داگرکەرانی کلاسیك (( هەردوو ئیمپراتۆریـەتی سـەفەوی و عوسمانی ))ەوە چ لەلایەن داگرکەرانی مۆدێرن (( تورکیا ، سوریا ، عێـراق و ئێـران )) ەوە بـەردەوام بـووە ، بـەم جـۆرە زمـانی کـوردی خزمـەتێکی بەرچـاوی نـەکراوە لـەم بـوارەداو لـەکارگێڕی و فێرکردنـدا بـە فراوانـی بـەکار نـەهاتووە، ئەمـەش بووەتـە هـۆی ئـەوەی وەك پێویست گەشەو پێشکەوتن بە خۆیەوە نەبینێ.

---

(١) مهاباد قەرەداغی، زمان و ناسنامە،ل ٨٨.

## ٢- نەبوونی دەوڵەت :

هۆکارێکی دیکە لە هۆکارەکانی خزمەتنەکردنی زمانی کوردی ، بە وێنەی زمانە پێشکەوتووەکانی جیهان ، نەبوونی دەستەلاتێکی سەربەخۆو حکومەتێکی کوردییە.

بێگومان هەبوونی دەوڵەتێکی نەتەوەیی بۆکورد ، ڕۆڵێکی گەورەی دەبێت لەبوژاندنەوەو گۆڕان وپێشکەوتن ویەکگرتنی زمانێکی دیاریکراوی نەتەوەیی. بەپێچەوانەشەوە، ئەو نەتەوانەی ژێردەستن ، خاوەنی دەوڵەتی نەتەوەیی خۆیان نین ، ئازادیی وسەربەخۆیی یان لێ زەوتکراوە ، ڕێگایان نەدراوە ، بەزمانی نەتەوەیی خۆ یان بخوێنن ، لەبوارە جیاجیاکانی ژیان، (( ڕۆشنبیری ، زانستی ، هونەری ، کۆمەلأیەتی و رامیاری )) دا زمانەکەی خۆیان بەکاربهێنن ، ڕۆژبەڕۆژ ، زمانە کەیان بەرەو لاوازبوون ڕۆیشتووە.وەك ( ئیسماعیل بێشکچی) دەڵێ: (( ئەگەر ویستمان سەر بەنەتەوەیەك دانەوێنین ، وەك کۆیلەی لێ بکەین، ناسنامەی نەتەوەیی لێ زەوت کەین ، ئەگەر ویستمان داگیرکەر لەناو چەیەکدا دەستەلأتی هەبێ، پێوستە، ئەلفوبێی ئەونەتەوەیە لەناو بەرین، پێوستە نەیەڵین ئەوگەلە یا ئەو نەتەوەیە، بەزمانی خۆی ئاخافتنکا، تابەربەستێ لەمییانەی خۆی کلتورەکەیدا دروسکەین))[1].

نموونەی وادەبیندرێ لەمێژوودا، کەهەندێك نەتەوە، بەهۆی دەستەلأتی ڕامیارییەوە توانیویانە، زمانەکەی خۆیان پێشبخەن و گەشەی پێ بکەت ، لەئەنجامیشدا ، بناغەی زمانێکی یەکگرتووی خوێندنەوە و نووسینان دارشتووە ، پێچەوانەکەشی زانراوە.

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت نەبوونی دەوڵەتێکی یەکگرتووی کوردی ، گەلێك ڕەگدانەوەی نێگەتڤیی بۆ سەر زمان و زاراوە سازی کوردی هەیە ، کورد وەك نەتەوەیەك لەهەموو پارچەکاندا شەڕی لەناوبردنی کراوەو زمانەکەی یا قەدەغە بووە یا بوارێکی تەسکیان بۆ هێشتۆتەوەو زمانی داگیرکەریان بەسەردا سەپاندووە ، ئەمەش کاریگەری خۆی هەبووە :

ا – بەهۆی بەکارنەهێنانی زمان لەبوارەکانی زانست و پەروەردەو فێرکردندا و تەنانەت کاروباری ڕۆژانەش ، هەندێك لەکوردەکانی ئەو پارچانەی کوردستان ، نەك هەر لەزمانی کوردەکانی دیکەی کوردستان تێناگەن، بەڵکو هەندێکیان زمانی دایکیشیان

---

(١) ئیسماعیل بێشکچی، و زهیر عبدالملك، کردستان و مستعمره دولیه،ل٥١.

لەبیرچـوّتەوەو نـایزانن ، سـەرەڕای جـوّراو جـوّری ئەودەوڵەتانـەی کوردسـتانیان داگیرکـردووە ، زمـانی نەتـەوە داگیرکـەرەکانیش جیـاوازن ، بەوێنـە :- کـوردێکی کوردستانی تورکیا ، کەزمانی تورکی دەزانێ ، لەکوردێکی کوردستانی ئێران تێ ناگات کەزمانی فارسی دەزانێت.

ب - بەکارنـەهێنانی زمـان بەبـەردەوامی، لـە خوێنـدن و پـەروەردە و بـوارە زانـستی و تـەکنیکیو ڕۆشـنبیریە جیاوازەکانـدا، ڕێگـە لەگەشەسـەندن و پێـشکەوتنی زمـان و دۆزینەوەو داهێنانی زاراوەی نوێیاوو دەوڵەمەند بوونی فەرهەنگەکەی دەگرێت.

ج- هەستی لاوازیی و تۆوی باوەڕ بەخۆنەبوون لەدەروونی تاکی کورد دا ، دەڕوێنێ. بەرانبەر بەزمانەکەی خۆی، یان هەندێك جار ترس لەبەکارهێنانی زمانی کوردی، لە دەروونی تاکدا دروست دەبێت، بەهۆی ئەوسیاسەتەی داگیرکەران بەرانبەر بە زمانی کوردی بەکاری دەهێنن، یان بەکەم سەیرکردنی زمانی کوردی بە بەراورد لەگەڵ زمانی نەتەوە سەردەسەکانی کوردستان، هەبۆیەش زۆرلەنوسەرە بەتواناکانی کورد تاوەکو ئێستاش دەبیندرێن ،کەبەرهەمەکانیان بەزمانی کوردی بلاّو ناکەنەوە ،بەڵکو بەیەکێك لە زمانەکانی (تورك ، فارس ، عەرەب ، ڕوس) دەنوسن و بەو زمانەش بەرهەمەکانیان بلاّو دەکەنەوە.

د - دەرككردنـی مرۆڤـی کـورد بەهـەبوونی خـۆی وەکوتـاکێکی نەتـەوەیی تایبـەت لـەو ساتەوەیە کە دەرك بکات خاوەنی زمـانێکی تایبەتـەو دەبـێ بـەو زمانـە بـدوێ و خـۆی بناسێنێ یەکێك لەسیماکانی هۆشیاری نەتـەوەیی ، گرنگیـدانی ئەونەتەوەیـە بـەزمانی خۆی، هەوڵ دا نیەتی بۆ گەشەسەندنی ئەو زمانـەو ئـەوکلتورەی کـە وەك ڕە هەنـدێکی تایبەت دەیناسێنێ بەدەورو بەری خۆی.

## ٣- پێشنەکەوتنی زانستیی :

نەبوونی داهێنـان و دۆزینـەوەی گـەورەی زانسـتی لەکوردسـتاندا بـۆ ئـەوەی زاراوەی نوێباوی کوردی بەسەردا ببڕێت ، وەك دەزانین زۆربـەی زاراوە زانسـتی و تەکنیکییـەکان لـە دانانی داهێنەران و دۆزەرەوان و زانایانە ، زۆرجاریش بە ناوی خۆیانەوە ناویان لێنراوە.

بەم جۆرە دەتوانین، بڵێین :- یـەکێك لـەهۆکارەکانی دواکـەوتنمان لـەبواری زاراوەی زانیـستیی ، دواکـەو تنمانـە لـەکاروانی زانـست و پێـشکەوتنی سـەردەم. ئێمـە ئەگـەر هـیچ زانیارییەکمان لەبارەی چەکی ئـەتۆم یـاخود زانـستی فرۆکـەوانی و مانگـە دەسـتکردەکان و چۆنیەتی دروستکردنی ئۆتۆمبیل و کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت نەبێت ، چۆن دەتوانین زاراوە بۆ پارچەو بەشەکانی ئەم ئامێرانە دابڕێژین و لەفەرهەنگی زمانی کوردیدا بەکاریان بهێنین.

هوروژمی رۆژانەو بەردەوامی دۆزینەوەی چـەمکی زانـستی لـە وڵاتـە پێشکەوتووەکان وادەکـات زمـانی کـوردی بەسـەختی بتوانێـت لـەخۆیان بگرێـت و زاراوەی نێوێباویـاون بـۆ دابنێت.

## ٤- نەبوونی کۆڕێکی زانیاریی :-

لەقۆناغی ئەمڕۆی زمـانی کوردیـدا ، پێوسـتیمان بـەکۆڕێکی زانیـار یـی هەیـە ، وەکـو کۆڵەگە یەکی پتەو بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی کە دێنە بەردەم زانـستی زاراوەسـازیی کوردی.

دامەزرانـدنی ( کـۆڕێکی زانیـاری کوردسـتان ) هـەنگاوێکی نەتـەوەیی پـیرۆزە ، بـەڵکو پێویستییەکی نیشتیمانی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری گەلەکەمانە.

خزمەتکردنی زمانی کـوردی ، دەروازەیەکـە بـۆ خزمـەتکردنی رۆشـنبیری و هۆشـیاری کوردسـتان ، ئـەرکی سەرشـانی هـەموو خـاوەن دەسـەڵاتێکی هـزری و پێنـوس بەدەسـتە. کەدەڵێین هەبوونی کۆڕێکی زانیاری پێویـستە ، لەبەرئەوەیکـە (( ئـەم جۆرەکۆڕانـە لەهـەر وڵاتێکدابن گەورەترین دەستەڵاتێکی زانـستانەن بۆبڵاوکردنـەوەو چەسـپکردنی هـەموجۆرە دانان و گۆڕین و چارەسەرکردنێك لەبارەی زمانەوە )) [١].

---

(١) جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی،ل ١٤.

( کـۆری زانیـاری کـوردی ) بـەپێی ژمـارەی (١٨٣) ی سـاڵی ( ١٩٧٠ ) دامـەزرێنرا لـە (١٩٧٠/٧/٢٩) یاسـای دامەزرانـدنی کـۆڕی زانیـاری کـورد دەرچـوو ، کەیـەکێك بـوو لـە دەستکەوتەمەزنەکانی بەیاننامەی (١١) ی ئادار.

( کـۆڕی زانیـاری کـورد ) لەسـەرەتای دامەزراندنیـەوە هـەوڵی دانـان و سـازکردنی زاراوەی هەمـەڕەنگی پێویـستی داوە ، بەرهـەمی هەوڵەکـەش ئەوچوارلیـستەیە. کەلەچـوار ژمـارەی گۆڤـاری کـۆڕدا بلاّوکراوەتـەوە لەدوایـشدا لەسـێ کتێبـی سـەربەخۆدا کـە کتێبـی ( زاراوەی کارگێڕی ١٩٧٣-١٩٧٤)و (زاراوەی هەمەچەشنە ١٩٧٤ )و ( لیـستەی چـوارەمی زاراوەکـانی کۆڕ ١٩٧٥ ) ن چاپکراون.

کۆڕی زانیاری کورد ، لەبارەی دانان و داڕشتن و وەرگێڕانـی زاراوە ، نـەك تـەنیا بایـەخێکی تەواوی پێدابوو ، بەڵکو بەشی زۆری کـاتی خـۆی بـۆ ئـەم کارەگرنگـە تـەرخان کردبـوو. وە لێژنەیـەکی تایبەتیـشی بـۆ لێکۆلێنـەوەی زاراوەی زانـسیتیدانـاوە ، لـەبارەی دانـان و سازکردنی زاراوەوە ، کوڕی زانیاری کورد ، لەهەوڵەکانی پێش خۆی بەوە جیادەکرێتـەوە ، کەتاڕدەیەك ڕێبازێکی زانستی لەم ڕووەوە گرتۆ تەبەرو ئەوزاراوانەی کـە دانـراوە ، وتوێـژو گفتوگۆیان لەسەر کراوە ، بەوێنە :-

لەبەرگی یەکەمی و بەشی یەکەمی گۆڤاری ( کۆڕی زانیاری کورد ) داهاتووە :-

(( ئەنجومەنی کۆڕلەکاتی دانان و هەڵبـژاردنی زاراوەکانیداهـەوڵی داوە لەهـەموو ڕوویەکـەوە کـەڵك لـە بەرهــەمی شـاعیرە کۆنــەکان و فۆلکلـۆرو قـسەی بـاوی نـاوی لادێ و ناوچـە جیاوازەکانی کوردستان و فەرهەنگە کوردییەکان وەربگرێت )) [1].

هەروەها دەڵێ : (( لێرەدابە پێویستی دەزانین ئـەویش بخەینـە بەرچـاوی ئەنجومـەنی کـوڕ بــەدانانی زاراوی نـویێ نایــەوێت زاراوو وشــەبەکارهێنراوەکانی تــر لەناوبــچێت وەئەمــە بەهەڵەیەکی گەورە دادەنێت )) [2].

---

(١) ئەنجومەنی کۆڕ، زاراوی کارگێڕی گۆڤاری کۆڕی زانیاری،ل ٤٢١.

(٢) ئەنجومەنی کۆر . کارگێڕی گۆڤاری کۆری زانیاری ،ل ٤٢٢.

بەرهەمی کۆبوونەوەو گفتوگۆکانی ئەنجومەنی کۆڕ ، لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆڕ بوو کە دەوروبەری ( ١٥٠٠ ) زاراوەی تێدا بڵاوکراوەتەوە ، دواتریش لیستی دووەم و سێیەمی بەدوا داهات ، لستی سێیەم لەسێ بەش پێکهاتبوو :-

١-(( ئەوزاراوە هەمە جۆرو بابەتانەی ، کەئەنجامی لێدوان و لێکۆڵینەوەی ئەنجومەنی کۆڕن.

٢- زاراوەی زمان ، کەئەنجامی ڕەنج و تەقەلاّی لێژنەی زمان و زانستەکانی و لیژنەی لێکۆڵینەوەی زمانە.

٣- زاراوەی پزیشکی ، بەرهەمی ئەولێژنەیە یە کەلەدوو پزیشکی شارەزاو چەندکوردی زانیکی بەتوانا دروست بوو))[1]. لەدوای ئەمەش ، لستیی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم بلاّو کرایەوە ، کەتێکڕای زاروەکانی زمان و بەشێك لەزاراوەی کتێبی فێرگەکان و هەندێك زاراوەی کارگێڕی تێدا خراوەتە ڕوو کەلەسێ بەش پێکهاتبوون.

١- زاراوەی زمان

٢- زاراوەی کارگێڕی

٣- زاراوەی کتێبی فێرگەکان.

لەدوای ئەمەش لیستی پێنجەمی زاراوەکانی کۆڕی بەدواداهات کەلەبەرگی سێیەم بەشی دووەم ، ( ١٩٧٥ ) دا بلاّوکراونەتەوە ، کەبریتی بوون لەزاراوەی هەمەجۆر ، لەبەرگی چوارەمیش لیستی زاراوە زانستییەکان بلاّو کراوەتەوە بەناوەی ( لیستی زاراوەکانی فەلسەفەو ژیر بێژی )یەوە سەرەڕای لیستەی شەشەمی زاراوەکانی کۆڕ ، لەدانان و لێدوانی ئەنجومەنی کۆڕ. سەرنجام کۆڕ تاڕادەیەکی باش لەکارەکانیدا سەرکەوتووە ، هەرچەندە ئەم سەرکەوتنە تائێستانەگەیشتۆتە پلەی پێویست ، بەڵکو کارەکانیان هەندێ کەم و کورتی تێدا دەبیندرێ ، بەوێنە :- بەپێی سەرنج دەردەکەوێت لەو چوار لیستەدا ، کەکۆڕی زانیاری بۆ زاراوەکانی داناوە گەلێ زاراوە هەن لەشوێنی خۆیاندانین ، پربەپری واتا کانیان دانەنراون ، هەروەها زاراوەی هاوواتا یاخود دوانەیی لەزاراوەدا بەرچاو دەکەوێت. بەلاّم کۆڕ هەستی بەم کەم و کورتیە کردووە ، بە لگەش بۆ ئەمە، زۆر بەڕاشکاوانە بانگی زاناو خوێندەوارانی کورد دەکات ، بۆچەسپاندنی ڕەخنەکانیان ،ئێمە لەو باوەڕەداین، کە

---

(١) سەرچاوە پێشوو،ل ١٦٩-١٧٠.

زاراوەکانی گە نجینەیەکی بەنرخن بۆ زانستی زاراوە سازیی کوردی ، دەتوانین ئەم کارانـەی کۆڕ لەبارەی دارشتن و وەرگێڕانی زاراوەی کوردی و پێکهێنانی لیژنـەکانی بـە سـەرەتایەکی باش دابنێین ، لەرێچکەی قۆناغاکانی دیکەی زاراوە سازیی کوردی.

ئەوکەلێنەی ئەمڕۆ لەبواری زاراوە سازیی کوردیدا ، هەسـتی پـێ دەکرێـت ، نـەبوونی کۆڕێکی زانیارییە ، کەبەپێی ڕێبازێکی زانستی و لەسـەر ئاسـتێکی جیهـانیی پێـشکەوتوودا بەرنامەکانی دابڕێژێت. کەئەمەش زۆر کێشەی بۆ زاراوە دانان و پێشخستنی زمـانی کـوردی دروست کردووە. لەهەشتاکانەوە ئیـدی کـۆری زانیـاری ، دەسـتەی کـورد کارەکـانی سـست بوون و وەستان میری ئەوکاتە بە ئاشکراکەوتبووەشەڕ فرۆشتن بە کورد و زمانەکەی. بۆیـە ئێستا ، یـەك سەرچـاوەی گـشتی زاراوە دانانمـان نییـە ، وەلـەم بارەیـەوە ، چـەند کـەم و کورتیەك تێبینی دەکرێت ، وەك :-

١- (( نەبوونی یەك سەرچاوەی ناوەندی بۆ دانانی زاراوە هەرچەندە کـۆڕی زانیـاری ڕۆڵێـك لەم بوارە دا دەبینـێ بـەڵام زانکۆ و وەرگێـڕان و دام و دەزگاکـانی دیکـەش سـەرەڕای نوسـەرو ڕۆژنامـە نووسـان و بنوسـانی ڕادیـۆو تەلـەفزیۆن ... هتـد. ئـەمڕۆ ڕۆڵێکـی بەرچاویان هەیە))[1]

٢- نەبوونی لیژنەیەکی زانستیی پسپۆڕ ، کە لەلایەن کۆڕی زانیارییەوە پێکهێنرا بێـت ، بـۆ هەڵسەنگاندن و تـاوتوێکردنی ئـەو زاراوانـەی کەبەرهـەمی ( هـەوڵی تاکـە کەسـێن ، بەتایبـەتی ئـەو ژمـارەزۆرەی زاراوە کەلـەدوای ڕاپەڕینـەوە دانـراون ، بـاش و بەکەڵکەکانیان لێ هەڵبژێردرێت، هەڵەو ناتەواوەکا نیشیان ڕاست بکرێتەوە ،بۆ ئـەوەی دووربن لە دوانەیی زاراوە.

٣- چارەسەرکردنی کێشەی دیالێکت وبەشـە دیالێکتـەکانی زمـانی کـوردی و هەوڵـدان بـۆ پێکهێنانی زمانی ئەدەبی یەکگرتووی سەرتاسەری کوردستان.

- وەبەپێی سیستەمێکی زانیستی رێك وپێك کاربکات ، بەم شێوەی خوارەوە :-

١- (( پێکهێنـانی لیژنەیـەکی فـراوان لەنوێنـەرانی هـەموو زارە کوردیـەکان بـۆ دانـانی فەرهەنگی زمانی نەتەوایەتی کوردی بەمەرجێك ئەم لیژنەیە لـە کەسـانی پـسپۆڕ و زانـا پێکهاتبێت و لەبەرتیشکی ئەم ڕێبازە پەسندکراوە کارەکەی ئەنجام بدات.

---

(١) محەمەد وەسمان، گیروگرفتەکانی زاراوە دانان لە زمانی کوردیدا،ل ٤٨.

٢- دەستنیشانکردنی ماوەیەك بۆ کۆمەڵێك لەزاناو پسپۆرەکانی فۆنەتیکی زمان بۆ لێکۆڵینەوەی دەنگەکانی زمانی کوردی و هەڵسەنگاندنی هەموو چەشنەکانی رێنووسی کوردی ، ئەمجا گێرانی سیمینارێك بەمەبەستی یەکالاکردنەوەی هەموو بیرو رایەك لەم کۆرەداو وەرگرتنی بریاری کۆتایی لە ساغ کردنەوەی دەنگەکانی زمانی نەتەوایەتی و چۆنیەتی نووسینەوەیان بە رێنووسێکی یەکگرتوو ، بەمەرجێك هەموو لایەنێکی کوردی کەسی و میریی و جەماوەری پەیرەوی ئەم رێنوسەبکات.

٣- پێکهێنانی لیژنەی پسپۆر بە ژمارەی بابەتەکانی زانست و زانیاری و وێژەو رامیاری وئابوری و لایەنەکانی دیکەی ژیان بۆ لێکۆڵینەوەی فەرهەنگی زاراوەی کوردی دانراوو پێشنیازکردنی ئەو زاراوانەی کەهێشتادانەنراون. ئەو جاکۆبوونەوەی ئەم لیژنانە لە سیمیناردا دوای ساڵێك لە پێکهێنانی بۆ چەسپاندنی زاراوەی پەسەندکراو لەبەر تیشکی رێبازەکانی لەدایك بوونی وشەی کوردیداو پێکهێنانی فەرهەنگێکی گشتی زاراوەی کوردیی نەتەوایەتی کە سەرچاوەی هەموولایەك بێت لەچالاکی بیری و زانستی ژیان))[1].

(١) د. کامل حەسەن بەسیر، زمانی نەتەوایەتی کوردی، ل٤٤- ٤٥.

# زاراوە زانستییەکان

١- باشتروایە پێش ئەوەی لیژنە زاراوە زانستیەکان ، یاخود هیچ نامیلکە یەکی لەو بابەتە بلاوبکاتەوە ، ڕاستەوخۆ بینێری بۆئەو زاناو ڕۆشنبیرانەی لەو بوارانەدا دەستیان هەیەو داوایان لێ بکات هەریەکە بەپێی تواناو بۆچوونی خۆی بیانکات بەکوردی ، لەماوەیەکی دیاریکراودا، دوای ماوەکە ئەو وەلامانە کۆبکرێنەوە ، ئەوکاتە یان هەر لەلایەن لیژنەکە خۆیەوە یان لەلایەن لیژنەیەکی تایبەتمەند بەوکارە ، هەموو هەوڵێك بدرێت ، ڕاست و گونجاوەکانیان لێ هەڵبژێرین و چاپی بکەین، ئەوکاتە جارێکی دیکەش بلاوبکرێنەوە، ماوەیەکی دیکەش بۆ بیروڕا لەسەر دەربڕینی دا بندرێت، دواجار جێگیر بکرێت.

٢- سود لە هەموو ئەو فەرهەنگ و نامیلکەو نوسراوانەی کە تایبەتن بە زاراوە، وەربگیرێت، ئەو زاراوانەی کە لە کتێبەکانی خوێندندا بەکارهێنراون، باش و گونجاوەکانیان پشتگیری و جێگیر بکرێن و واز لە ناتەواوەکانیان بهێندرێت و بۆ ئەم مەبەستەش، نابێ بەڵگەی چەسپین و نەچەسپینی ئەو زاراوانە ببێتە مایەی مانەوەیان و بە هەڵە بەکار بهێندرێن.

٣- ((هەوڵ بدرێ ئەو زاراوە زانستیانەی لە چەند زانستێکی جیاواز بەکاردەهێندرێن، لەلایەن چەند پسپۆرێکی شارەزای هەربابەتێکی زانستیەوە یەك بخرێن، بە وێنە : پێویستە هەموو ئەو زاراوانەی لە بواری ئەندازەی بیناسازیدا بە کاردەهێندرێن یەك بخرێن و دووربن لە هاوبێژی و هاو واتایی.

٤- لەدارشتنی زاراوەی زانستیدا ، کارێکی وابکرێت ، زاراوەکان پێش هەموو شتێك چەمکە زانستیەکە بەوردی دەربڕین ، ئینجا لایەنە زمانەوانیەکەو تا لە توانابێت ، هەوڵی ژیاندنەوەو زیندووکردنەوەی ئەو وشەو زاراوە دێرینانە بدرێ کەلەگەڵ زاراوە زانستیەکەدا دەگونجێن ، ئەگەر نەیشبوو ، دارشتنی زاراوەکە بەجۆرێکی وابێت . دووربێت لەدەقە وەرگێڕان))[1].

٥- کۆڕی زانیاری ، کەلەهەموو ولاتێکدا ، بەگەورە ترین دەسەلاتی زانستیانە دادەنرێت . چەند ئەرکێکی گرنگ بەجێ دەهێنێ ، یەکێك لەو ئەرکە گرنگانەی کە ئەم کۆڕە دەیبینێت :-

---

(١) جەمال عەبدول، بەرکولێکی زانستە زاراوەسازی کوردی،ل ٤٢ ٤٢.

یەکخستنی هەوڵی تاکەکەسییە ، ئەگەرچی ئەم هەولآنە هەر دەمینێن ، بەلآم پێکهێنانی لیژنەی جیاواز جیاواز بۆسازکردنی زاراوە بەکارێکی زانستی ترو باشتر دادەندرێت.

## ٥- نەبوونی دەزگای کلتوری و ئاکادیمیی:

یەکێ لەگرفتەکانی زمانی کوردی ئەوەیە ، دەزگایەکی چاپەمەنیی و بلآوکردنەوەی نەتەوەییمان نییە ، تابەشێوەیەکی ڕێك و پێك ، هەموو کارەکانی چاپکردن و بلآوکردنەوە ، لەئەستۆی خۆی بگرێ ، ئەمەش ، لەرِیێ خوێندەواری بەکوردی ، پەرەسەندنی زمانی کوردیی و پێشکەوتنیدا ، بەکۆسپێکی گەورە دادەندرێ.

کێشەی ئابوری ، بەچەڵەمەیەکی گەورەی نوسەران و ئەکادیمییەکانی کورد دادەنرێت، بەشێوەیەك نەتوانن ، بەئاسانی وەك پێویست خزمەتی زمان و وێژەو فەرهەنگی نەتەوەکەی خۆیان بکەن ، بەرهەمەکانیان چاپکەن و بلآوی بکەنەوە ، جگە لەوەش بازاڕی چاپەمەنیی کوردیش ، بەرهەمی نووسەرانی بەئاسانی تێدا ساغ نابێتەوە جێی ئەم کەم و کورتیە ئابورییە یان بۆ بگرێتەوە.

(( ئەمڕۆ نەتەوەی کورد ژمارە یەکی باش خوێندەوارو ڕوناکبیرو نوسەری ئەکادیمیی لەبوارە جۆر بە جۆرەکانی (( زمان ، وێژە و هونەری کوردیی )) تێدا هەیە، بەلآم، لەلایەکەوە یەکگرتوونین ، لەلایەکی دیکەشەوە ، ئەو دەزگا نەتەوەیی یە یەکگرتووە مان نییە ، تا هەموو کارەکانیان ئاسان بکات. چونکە ، لەتوانای هیچ نووسەرێکدا نییە ، بەتەنیا باڵ ، کارەکانی خۆی جێ بە جێبکاو بەرهەمەکانی بلآوبکاتەوە. جگە لەوەی ، کاری بەکۆمەڵ ، گەلێ لەکاری تەنیایی و هەرکەس بۆخۆی ، باشترو ، بە بەرهەمترو ڕێکوپێکترە))[1].

---

(١) حوسێن محەمەد عەزیز، سەلیقەی زمانەوانی و گرفتەکانی زمانی کوردی،ل ٥٤٧.

## ٦- نەبوونی فەرهەنگ :

فەرهەنگ تۆمارگەیەکە ، بۆ پاراستنی وشەکانی زمان لە فەوتان و لەناو چوون ، ((کتێبێکی سەرچاوەیی و مەرجەعە وشەو زاراوەی زمانێکی دیاریکراوی تێدایە کەبە شێوەیەکی تایبەتی ڕێکخراون لەگەڵ پێناسەی هەروشەیەك و دەرخستنی هاو واتاکەی لەهەمان زماندا ، یاخود لەزمانێکی دیکە. لەگەڵ ڕوونکردنەوەی ئەو وشانەی کە لێوەی وەردەگیرێن و بەکارهێنانی و مانا جیاجیاکانی و هەروەها دەرخستنی لایەنی مێژوویی وشەکان و چۆنیەتی گۆکردنی ))[1].

فەرهەنگ جۆرێکە لەجۆرەکانی سەرچاوەی بنەڕەتی ، واتە ئەو سەرچاوە یان ئەو کتێبەیە کە زانیاری تایبەتی تێدا تۆماردەکرێت ، لەبارەی وشەکانی زمان و واتاکانیان.

(( جگە لەڕێزکردنی وشە ، هەروەها لێی کۆڵراوەتەوەو مانای روون کراوتەوەو لێکدراوەتەوەو شی کراوەتەوەو زانیاری دەربارەی چۆنێتی نوسینیان و بەدەما هاتنیان و پەیدا بوونیان... دراوە ))[2].

یەکێك لەئەرکە پێویستییەکانی پەرە پێدانی زمانی کوردی دانانی فەرهەنگی تایبەت بە بوارە جیاجیاکانی زانستی سروشتی و مرۆیی ، سەرەڕای فەرهەنگی نەتەوەیی ، بەڵکو پێویستمان بە ئینسکلۆپیدیای نەتەوەییە.

زمانی هەر نەتەوەیەك بەفەرهەنگەکەی هەڵدەسەنگێنرێت ، کەواتە دەتوانین، بڵێین فەرهەنگ پێناسەیەکە کە کلتورو رۆشنبیری و پلەی شارستانیەتی و پێشکەوتوویی و کەسایەتی ئەو میللەتەی پێ دەردەکەوێت کەبەو زمانە دەپەیڤن.

(( ئەرکی سەرەکی فەرهەنگ ، یارمەتی دان و ناساندنی وشەو پێناسی وشەیە بە کەسێك کەشارەزایی تەواو یاهەر ناسیاوی دەگەڵ وشە یا وشەگەلێك نیە. کاتێك کەسێك لەکتێبێك یا لەزمانی کەسێکەوە وشەیەك دەبیستێ و مانای ئەم وشە نازانێ پەنا بۆ فەرهەنگ دەباو فەرهەنگ وەك پشت و پەنایەك دەبێ دەستی بگرێ و داواکەی بۆبە جێ بێنێ و ناسیاوی تەواو بدا بەخوێنەر )) [3].

---

(١) د. محمد علي الخولي، معجم علم اللغة النظري،ل ٧٤.

(٢) د. ئەورەحمان حاجی مارف، وشەی زمانی کوردی،ل ٦٩.

(٣) عەلی نانەوازادە، فەرهەنگی هەرمان،ل ٨.

دیاردەی فەرهەنگ نووسین لەبنەڕەتدا دیاردەیەکی مۆدێرنە :–

(( لە دوای دواچارەکی سەدەی هەڤدەهەمی زایینی ئەکادیمیای پاشایەتیی فەڕەنسا بڕیاری ئەوەی دا تاکو لەلایەن لێکۆڵەرەوەو نوسەرو فەلسەفەکارانەوە دەست بکرێت بە دانانی ئەنسایکلۆپیدیایەکی گەورە سەبارەت بەژیار و کلتوربەگشتی و ئەدەب و فەلسەفەو زانستە سروشتییەکان بەتایبەتی. لەناوەڕاستی سەدەی هەژدەهەم دا ئاکامی کاری چل فەلسەفەکارو لێکۆڵەرەوەی فەڕەنسی بوو بە ئەنسایکلۆپیدیایەکی ٢٨ بەرگی کە بە ئەنسایکلۆپیدیای ((دیدێرۆ)) ناسراوە. بەم ئاکامە فەڕەنسا توانی خێرا خۆی لە ئاکامە ئیجابییەکانی مۆدێرنێتە خاوەن بەش بکات. لە وڵاتانی دیکەی ئەورووپاش هەمان پرۆژە بەشێواز گەلی جۆراو جۆر، گرنگایەتی پێ دراوە، بۆ نموونە، لەئینگلتەرا دوکتۆر ساموێل جانسۆن یەکەم فەرهەنگی تا ڕادەیەك گشتگیری زمانی ئینگلیزی نووسی، کە بەیەکەم فەرهەنگی مەزن و مۆدێرنی زمانی ئینگلیزی دادەنرێ))[1].

مێژووی فەرهەنگ نووسین لە ڕۆژهەڵاتدا مێژوویەکی هاوچەرخە، بۆ سەدسالێ ڕابردوو دەگەڕێتەوە، ئەمڕۆ لە وڵاتە ڕۆژهەڵاتییەکانیش بایەخێکی بەرچاو دەدرێت بە دانانی فەرهەنگی جیا جیا لە سەرجەم ئاست و بوارەکانی ژیان و لقەکانی زانست و تەکنۆلۆجیا بۆ خوێنەرە جۆر بە جۆرەکان.

یەکێ لە کارە گرنگەکانی، هەر نەتەوەیەکی زیندووو، بە دانانی فەرهەنگی زمان دەست پێدەکات. هەر نەتەوەیەك، چەند زیاتر فەرهەنگی هەبێ، هێندەش زمانەکەی دەوڵەمەند تر دەبێ. چونکە فەرهەنگ بە یەکێ لە بناغە سەرەکیەکانی زمان و نەتەوەکە دادەنرێ، هەموو دیالێکت، بەش و لقە دیالێکتەکانی زمان کۆدەکاتەوە. بە هۆی فەرهەنگەوە، خەرمانی وشەی کوردی گرد دەکرێتەوە، وشەو زاراوەی میللی لە لەنێوچوون دەپارێزرێ.

فەرهەنگ، زمان لە (( شێواندن، لاوازی، داتەپین و مردن )) دەپارێزێ. نەوەی نوێ، بە وشەی کوردی کۆن و نوێ پێدەگەیەنێ، زمانیان دەوڵەمەند دەکا. هەربە هۆی فەرهەنگەوە دەتوانین، لە زاراوەی دیالێکتە جیاوازەکانی زمانی کوردی، زمانەکانی دیکەی بیانی و نەتەوەکانی جیهان بگەین. هەموو نەتەوەیەکی وشیار، پێشکەوتوو، خاوەن تواناو دەسەلات، هەر لە کۆنەوە تا ئەورۆ، هەوڵێکی زۆریان داوە تا چەندین فەرهەنگی

---

(١) بەختیار سەجادی. محەمەد مەحمودی، فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی،ل ٠٧

جۆربەجۆریان نووسیوە. بۆیە، ((زمانە زیندووەکان، ژمارەی فەرهەنگەکانیان گەیشتووەتە (١٥٠٠) فەرهەنگ))[1].

## فەرهەنگ جۆری زۆرە لەوانە :-

١- فەرهەنگی زمانی نەتەوەیی : ئەم جۆرە فەرهەنگە، بەزمانی نەتەوەیی دادەنرێ، لەنێوان دیالێکت و بەشە دیالێکتەکانی زمانێکدا دەنوسرێ و وەك : فەرهەنگی کوردی – کوردی بەهەردوو بەشە دیالێکتی کرمانجی خواروو و هەورمانی.

٢- فەرهەنگی زمانی نەتەوەیی بیانی : ئەم جۆرەیان بە زمانی نەتەوەیی دەست پێدەکا. بەرانبەرەکەشی، بە یەکێ لە زمانی نەتەوەکانی جیهان دەبێ وەك : فەرهەنگی ( کوردی – ڕوسی).

٣- فەرهەنگی زمانی بیانی – نەتەوەیی :- ئەم جۆرەشیان بە پێچەوانەی هەردوو جۆرەکەی پێشوو، بەیەکێ لە زمانە بیانییەکان دەنوسرێ، بەرانبەریشی، واتاکانی بە زمانی نەتەوەیی تۆماردەکرێ وەك : فەرهەنگی ( ئینگلیزی – کوردی ).

ئەگەر بەراووردێ لەنێوان نەتەوەی کوردو نەتەوەکانی دیکەی جیهاندا بکەین، دەبینین:-

کورد بەهۆی گەلێ هۆکاری وەك نەتەوەیی، ڕامیاریی، زمانەوانیی، ئایینی، کەلتورییەوە، لە بواری فەرهەنگ داناندا، لە چاو نەتەوەکانی دیکە تاڕادایەك دووا کەوتووە.

هەوڵدان بۆ دانانی فەرهەنگی کوردی بۆ سەدەی هەڤدەم دەگەڕێتەوە، یەکەمین فەرهەنگی کوردی لە ساڵی ١٠٩٤ ی کۆچی بەرانبەر بە ١٦٨٢ – ١٦٨٣ ی زایینی دانراوە، ئەمەش مانای وایە تەمەنی فەرهەنگنووسیی کوردی ئێستا گەیشتۆتە (٣١٨ – ٣١٩) ساڵ.

((یەکەمین فەرهەنگی کوردی لە لایەن بنکەیەکی ئایینیەوە سەریهەڵداوە، کە دانەرانی دەرچووانی مزگەوت و پیاوانی ئاینداربوون و دواتر کڵێسەش بەشداری دانانی فەرهەنگی کوردی و زمانێکی دی بیانی کردووە ))[2].

---

(١) تاهیر سادق، ڕێنوس – چۆنیەتی نوسینی کوردی،ل ٦٠

(٢) د. کوردستان موکریانی، مێژووی فەرهەنگی هۆڵەندی و فەرهەنگی کوردی لە بەراوردێکی کورتدا،نوسەری نوێ، ژ(١٩)، ل ١٤٠.

یەکەمین فەرهەنگی کوردی، فەرهەنگێکی دوو زمان بووە، کە بەزمانی کوردی بە هۆنراوە دانراوە.

کاروانی فەرهەنگنووسی کووردی لە دووای ((نەوبەهار))ەوە تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم زۆر بە خێرایی نەڕۆیشتووە. تا ئەو کاتە لە فەرهەنگی ((ئەحمەدی)) شێخ مارفی نۆدێی (١٩٧٥) و ((الهدية الحميدية في اللغة الكردية))ی زیائەدین پاشا (١٨٩٣ – ١٨٩٤) ی زایینی بترازێ : هیچ فەرهەنگێکی وامان بەرچاو ناکەوێ، شایانی باسکردن بێ.

(( هەروەها یەکەمین فەرهەنگی زمانێکی بیانی – کوردی کە لە لایەن بێگانەوە نووسرابێ): (گارزۆنی (١٧٨٧) کە مسیۆنێرێکی کاثولیك بووەو هەژدە ساڵ لە نێو کوردانی ئامێد دا ژیاوە، ڕێزمانی کوردی بەزمانی ئیتاڵی نوسیوەو لە پاشکۆیدا فەرهەنگێکی ئیتاڵی – کوردی داناوە.

هەر لە سەدەی نۆزدەمدا ژابا ١٨٦٠ یەکەم فەرهەنگی فریزیۆلۆژی قەوارەی پازدەهەزار فرێزی بلاّوکردەوە.

مسیۆنێری ئەمەریکی (س. ری) ١٨٧٢ فەرهەنگێکی کوردی – ئینگلیزی داناوە. یەکەمین فەرهەنگی کوردی دووزمان، کە کوردێك دایانبێت و لە شێوەی فەرهەنگ بچێت و پەسنی فەرهەنگی پێوەبێت فەرهەنگی (رابەر) ە کە عەرەبی – کوردی یەو گیو موکریانی لە ساڵی (١٩٥٠)دا چاپیکردووەو هەروەها ئەم فەرهەنگە بەیەکەمین فەرهەنگی سەدەی بیستەم دادەنرێت، کە کوردێك ئامادەی کردبێت))[1].

یەکەمین فەرهەنگی کوردی – کوردی فەرهەنگی ((خاڵ))ە، کە لە ساڵی ١٩٦٠ – ١٩٦٤ دا چاپکراوەو لە لایەن (شێخ محەمەدی خاڵ ) دانراوە.

فەرهەنگی کوردی – کوردی کە زۆربەی دیالێکتەکانی زمانی کوردی گرتبێتە خۆی فەرهەنگی کوردستانە، کەلەلایەن گیوی موکریانی دانراوەو لە ساڵی (١٩٩٩) دا چاپکراوە.

لە ناو دونیای فەرهەنگسازیی کوردیدا بەدەیان فەرهەنگی کوردی و زمانانی دیکە چاپ کراون، کە کورد دایناون، وەك :

---

(١) د. کوردستان موکریانی، مێژووی فەرهەنگی هۆڵەندی و فەرهەنگی کوردی لە بەراوردێکی کوردتدا، نوسەری نوێ، ل١٤٠.

فەرهەنگی کوڵکە زێڕینە – کوردی – فارسی – عەرەبی – فەڕەنسی – ئینگلیزی هەروەها فەرهەنگی کوردی – عەرەبی. عەرەبی – کوردی. کوردی – ئینگلیزی. ئینگلیزی– کوردی. ڕوسی – کوردی. کوردی – ڕوسی. ئەڵمانی – کوردی و...... هتد.

زانایان و فەرهەنگ دانەرانی کورد – تاڕادەیەك هەوڵی دانانی فەرهەنگیان بە پێی بابەت داوە، بۆ وێنە ساڵی (١٩٦٠) د. جەمال نەبەز بە ناوی ((هەندێ زاراوەی زانستی)) فەرهەنگێکی عەرەبی – کوردی لە هەولێر داناوە.

کۆڕی زانیاری کورد (( زاراوەی کارگێڕی )) و (( زاراوەی زانستیان )) بڵاوکردوە.

لە نێوان ساڵانی ١٩٧٤ – ١٩٨٣ دا کەمال جەلال غەریب سێ فەرهەنگی زانیاری عەرەبی – ئینگلیزی – کوردی چاپکردو د. ( مارف خەزنەدار ) لەگەڵ دیوانی نالیدا، فەرهەنگێکی تایبەتی بۆ نالی داناوە.

(( لەگەڵ هەبوونی هەوڵی تاکەکەسی لە بواری فەرهەنگنووسی کوردیدا، بەڵام کورد، لە هەرسێ جۆرە فەرهەنگەکە، ژمارەیەکی زۆر کەمی هەیە، ئەو فەرهەنگانەش کەهەن، زۆربەیان لەو فەرهەنگانەن، کەلەزمانێکی بیانییەوە بۆکوردی نوسراون، زۆربەی هەرە زۆریشیان، لە لایەن ڕۆژهەڵاتناس و گەڕۆك و شارەزا بیانییەکان نوسراون.

هەروەها زۆربەی فەرهەنگەکان لە ئاستی ئەو ئەرکەدانین، کە دەیانەوێ ئەنجامی بدەن، شانکیی فەرهەنگسازەکان لەوەدایە گەورەترین ژمارە وشەو کەرەستەی زمانی تۆماربکەن، واتە گرنگی بدەن بە قەبارە نەك بە جۆر، ئەم تێڕوانینە هەڵەیە لەبێ هێزی و هەژاری دەروازە فەرهەنگییەکاندا ڕەنگی داوەتەوە))[1]. زۆربەی فەرهەنگە کوردییەکان ((بەپێچەوانەیئەوانەی وڵاتە پێشکەتووەکان تەنیا مانای قامووسی وشەکان لەبەرامبەریاندا دانراوە و، یاخود هاوواتا عەرەبی و فارسییەکان نوستراوەتەوە و، هیچ زانیارییەکی تر لەبارەی بنج و بناوانی وشەو تەنانەت لەباری ڕێزمانییەوە بەخوێنەر نادەن. ئەمەش وێرای ئەوەی لەوانەیە جار بەجار هەڵەیان تێدابێت چونکە دانەری ئەو فەرهەنگانە لەبەر نەبوونی سیستەمێکی یەکگرتووی ئەکادیمیك و نەبوونی سەرچاوە و بەڵگەی نوسراو بەشێوەیەکی تاکە کەسی ئەو کارەی کردووە و، لەزۆر شوێنیشدا پشتی بەستۆتە بیرو بۆچوونی

(١) پ.د. محەمەد مەعروف فەتاح، زمانەوانی و فەرهەنگ سازی و دەوڵەمەندکردنی دەروازە فەرهەنگییەکان، نوسەری نوێ،ژ(١٩)،ل ١٦٩.

کەسایەتی خۆی. لەپاڵ ئەمەشدا لە کتێبخانەی کوردیدا، مەخابن، فەرهەنگی وێنەدارو شیکارانە بۆ ئاستە جۆراو جۆرەکان (لەمنداڵی قەتابخانەوە تالێکۆڵەرەوە و مامۆستای زانکۆ) بەشێوەیەکی بەرفراوان و بەربلاو لەبەر دەست دانییە))[1].

زۆر بوار لە فەرهەگنوسی کوردیدا بەبێ چارەسەر ماوەتەوە ((هەرچەندە لە کاری فەرهەنگنووسی کوردیدا هەندێ کێشەی ئاڵۆزی زانستی وشە بەگشتی و زانستی فەرهەنگ Lexicography نووسی بە تایبەتی چارکراوە، لەگەڵ ئەوەشدا گەلێك کێشەی تری زانستی وشەو زانستی فەرهەنگ نووسی لە زمانی کوردیدا هێشتا بیرونوکی قەڵەمیان نەگەیشتوەتێ))[2].

ئەگەر فەرهەنگ دانان، بۆنەتەوەکانی جیهان، کارێکی ئاسانبێ، ئەوا بۆ کورد بەکارێکی گران دادەنرێ، چونکە :-

١- (( کورد خاوەنی دەوڵەتێکی نەتەوەیی نییە، لەبەر ئەوە خاوەنی دەزگای کلتوری و ئەکادیمی خۆی نییە، بۆیە لەوبوارەدا ناتوانێ، هەم کادیری ئەکادیمیی پێگەیەنێ، هەم بودجەیەکی باشی بۆ تەرخان بکا، تا ئەو کارانە وەك پێویست، بەئەنجام گەیەنێ.

٢- زمانی کوردی لە چەند ((دیالێکت، بەشەدیالێکت)) ێکی جیاواز پێکهاتووە. ئەم دابەش بوونە، گرفتی بۆ زمانەوان و پسپۆڕەکان دروستکردووە. لەبەرئەوە، ئەگەر دانانی فەرهەنگێك بۆ هەموو دیالێکتەکانی زمانی کوردی، بەکارێکی گران دابنرێ. لەوانەیە، فەرهەنگدانان بۆیەکێ لە دیالێکتەکانی زمانی کوردی، کارێکی ئاسانتر بێ.

٣- لە ماوەیەکی کەمدا ناتوانرێ، ئەو کارانە جێبەجێ بکرێ. بەڵکو پێویستی بە ماوەیەکی درێژ هەیە. لەم بارەشدا، ئەم توانایەمان نییە.

٤- لەبواری زمانەوانیدا، شارەزاو پسپۆڕی زماننناس زمانزانمان کەمە، ئەوانەش کە هەن یان لەئاستی ئەرکی نەتەوەییدا نین، یان بواری ئەنجامدانی ئەو کارەیان بۆ

---

(١) بەختیار سەجادی، محەمەد مەحمودی، فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی،ل ٨.

(٢) عەبدولرەحمانی زەبیحی، قاموسی زمانی کوردی،ل ٩١.

نەڕەخساوە))[1]. لەگەڵ ئەوەشدا، تا ئەمڕۆ، گەلێ فەرهەنگ و فەرهەنگۆك بەشێوەی ناميلكەو پەرتوك، يان لەپاشكۆی بەرهەمەكانيان، لەلايەن دۆستانی كوردەوە بلاوكراوەتەوە. هەروەها، هەندێك لە شارەزايانی كورديش، لەو بوارە كاريان كردووە، بەلام ئەم فەرهەنگانە زۆربەيان، فەرهەنگێكی تێكەلاوی كوردی و يەكێ لە زمانەكانی ديكەی بيانی بوون، لە زمانێكی ديكەوە، بۆ كوردی نوسراون نەك لە كوردييەوە، بۆزمانێكی ديكە بنوسرێ، بۆيە ئەو فەرهەنگانەی لە زمانێكی ديكەوە، بۆ كوردی نوسراون، پتر لەسەرفەرهەنگی ئەو زمانانە دەژمێرێت. وەك :

فەرهەنگی (عەرەبی – كوردی، فارسی – كوردی، ڕوسی – كوردی و... هتد ).

هەرچەندە شاعيری گەورەی كورد (( ئەحمەدی خانی )) يەكەم فەرهەنگی، بە زمانی كوردی و بەشەدياليكتی كرمانجی ژووروو داناوە. بەلام ئەو فەرهەنگە، تا مێژوويەكی زۆر هيچی ديكەی بەدوادا نەهات، لە زمانی عەرەبيشەوە بۆ كوردی نوسراوە.

لەسەدەی بيستەمی ڕابردوودا، بەتايبەتی لە ناوەڕاستی سەدەی بيستەمدا بر فی فەرهەنگ دانانی كوردی گڕوتينێكی زياتری بەخۆديت و (لەم بوارەدا زانايانی مەزنی كوردی (جەلادەت بەدرخان) و (عەلائەدين سەجادی) و(شاكير فەتاح) و (گيوموكريانی) و (شێخ محەمەدی مەردۆخی) و (جگەر خوێن)ی شاعير و ( شێخ محەمەدی خاڵ ) و(هەژار موكريانی) و (د.عيزەدين مستەفا ڕەسول) و دەيان ڕوناكبيری ديكە ڕۆڵی بەرچاويان بينيوە.

ئەمڕۆكەش وا خەريكە كاری فەرهەنگنووسی كوردی جێگەی شايانی خۆی لەژيانی ڕۆشنبيری و زانستی گەلی كوردا دەگرێت و دەيان زاناو ڕۆشنبير لەم مەيدانەدا هەنگاوی گەورەيان ناوە بەرهەمی دانسقە لەبەردەستدان (( لە فەرهەنگی (هەمبانە بۆرينە)ی هەژارەوە بگرە تا (شارەزووری )ی بەڕێز (شەفيق قەزاز) تا فەرهەنگی (شەوكار، زيوار، كيميا)ی مامۆستا جەمال عەبدول و چەندين فەرهەنگی ديكەی بوارە جياجياكانی زانست هەموو نيشانەن بۆ بايەخدان بەم بوارە و هەنگاونان بەرەو فەرهەنگی تايبەتی بۆ بوارە جياجياكانی زانستی و كاروباری ديكەی ژيان ))[2].

---

(١) حوسێن محەمەد عەزيز، سەليقەی زمانەوانی و گرفتەكانی زمانی كوردی،ل٤٨٩.

(٢) محەمەد وەسمان، بەرەو فەرهەنگی پزيشكی يەكخراو،ل ١٨.

لە قۆناغی ئێستاکەی زمانی کوردیدا، پێویستمان بە ئامادەکردنی فەرهەنگێکی یەکگرتوو هەیە، کە ئەم سوودانەی خوارەوە بەزاراوەسازی و زمانی کوردی دەگەیەنێ :

١- فەرهەنگ دەبێتە هۆی لابردنی جیاوازی شێوەکان لەنوسینەکانی ڕۆشنبیرانی کورد، چونکە لەم حاڵەتەدا وشەی کوردی سەرچاوەکەی هەرچی و هەرشوێن بێ دەبێ بە موڵکی ڕۆشنبیرانی کورد.

٢- ڕوونکردنەوەی وشە کوردییەکان سوود بەخش دەبێ لەگشت بوارەکانی زانستو ئەدەب. ئەم فەرهەنگە دەبێتە هۆی توانامەندی چیرۆکنووسان و زانایان لە خستنە ڕووی بیرو بۆچوونەکانیاندا.

٣- (( لەدایك بوونی ئەم فەرهەنگە یارمەتیدەر دەبێ بۆ هەر لیژنەیەکی تایبەتی پسپۆڕایەتی لەپاشەڕۆژدا بۆ وەرگرتن و دیاریکردنی زاراوەی تایبەت، ئەم فەرهەنگە دەبێ بە بانکی زمان و زمانەوانی گەلی کورد.

٤- لەدایك بوونی ئەم فەرهەنگە دەبێتە هۆی دەستپێکردنێکی ڕاستەقینە بۆ بووژاندنەوەی زمان.

٥- فەرهەنگی وا دەبێتە هۆی شانازی نەتەوایەتی نەك بۆ ئەم دەستە و سەر دەمە، بەڵکو بۆ ڕۆڵەکانی سەردەمەکانی کەش فەرهەنگ دەبێ بە هێمایەکی جوانی بەستراو بە بوونیەتی نەتەوایەتی گەلی کوردەوە بێگومان بوونی نەتەوایەتی بەستراوە بەزمانەکەیەوە، لەم بۆچوونەوە زمانەکەمان خۆشەویسترین شتە کە شانازی پێوە دەکەین و ویژدان قبوڵی ناکا خۆشەویسترین شتمان پەرش و بڵاو بێ، بێ کۆکردنەوە و چاودێری کردن لە جێگایەکی پیرۆز... لە فەرهەنگی یەکگرتووی کورد))[1].

٦- لە قۆناغی ئەمڕۆی زمانی کوردییدا، پێویستە فەرهەنگێك هەبێت، کە زاراوەی گشت بوارەکان بگرێتەوە بەتایبەتی لەدوای ڕاپەڕینەوە هەزاران وشەو زاراوە هاتوونەتە ناو زمانەکەمان یان بەشێوەیەکی تازە بەکاریان دەهێنین. بۆیە پێویستە هەوڵی دانانی فەرهەنگێکی گەورە یان چەندین بەرگی گەورە بیت، بدەین. ئەمە وەکو سەرچاوەیەکی

---

(١) بەدرخان سندی، فەرهەنگی یەکگرتووی کورد پێویستیەکی نەتەوایەتی مەزنە، نوسەری نوێ ژمارە (١٩)،ل ٢٠٠١.

گشتی بۆ زمانی کوردی، کە یەکەمین جار کوردی – کوردی بێت. پاش ئەوە ئەمجا گرنگی دان بە فەرهەنگی تایبەتی لقەکانی زانستی، کیمیا، فیزیا، کۆمەڵناسی، پزیشکی، کارگێڕی، بواری یاساو دادگەری بدرێت.

گرنگی دان بە فەرهەنگێکی نوی، واتە هاوچەرخ، کە ((بیرو بۆچوون و ئامێر و دوراییە ئەپستمیە نوێکانی لەخۆ گرتبێت. سەرەڕای گێڕانەوەی وشەو زاراوەکان بۆ بنچی وشەکەو چاکە پەرەسەندن و گۆڕانی دەستنیشان بکرێت تا دەگاتە واتای ئێستای، سەرەتای ئامازەکردن بە دیالێکتی وشەکەو ئەوناوچانەی کە بەزۆری تیایدا بەکاردێت بە ئەو واتایە تایبەتیەی تیایدا بەکاردێت))[1] ئەو وشەو زاراوانەی کە لە هەرزمانێکەوە هاتوونەتە نێو زمانی کوردی، دەبێ لە پێشیان بنوسرێ کە لەچ زمانێك وەرگیراون، بەنیشانەیەك دیاری بکرێن.

جگە لەو فەرهەنگانەی تا ساڵی (١٩٧٥ز) لە بەرهەمەکەی د.(ئەورەحمانی حاجی مارف)دا ناویان هاتووە وەك (( قاموسی زبانی کوردی )) عەبدورەحمان زەبیحی و هەنبانە بۆرینەی – هەژار... هتد)) تا ئێستا، چ لە کوردستان و چ لە هەندەران، چ لەلایەن کورد خۆی، چ لەلایەن شارەزاییانی بیانییەوە، نزیکەی سەد فەرهەنگ و فەرنگۆکی کوردی بڵاوکراوەتەوە،لێرەدا بە پێویستی دەزانین، ناوی هەندێك لەو فەرهەنگ و فەرهەنگۆکانەی کە ئەمڕۆ لە کتێبخانەو هەندێ شوێنی دیکە دا بە بەرچاو دەکەون، کە پسپۆڕوشارەزاو ڕۆژهەڵاتناسەکانی کورد و بیانی نوسیویانن. ئەم فەرهەنگانە، لەچەند سەرچاوەیەکی جیاواز کۆکراونەتەوە. بەپێی مێژووی بڵاوبوونەوەیان،هەندێکیان بە کورتی لێ بژمێرین، تاوەکو بۆمان ڕوون بێتەوە، مێژووی فەرهەنگ نووسی کوردی، لەکەیەوە دەستپێکردووە و کام فەرهەنگ لەدوای کام فەرهەنگەوە هاتووە، بۆ ئەوەی، زنجیرەی مێژووی فەرهەنگ نوسیی کوردی، بەشێوەیەکی ڕێك و پێك دەربخەین :

١– ئەحمەدی خانی، نەوبەهار – ١٦٨٢ – ١٦٨٣ز.

٢– یوسف زیائەدین پاشا خالیدی – (الهدیة الحمیدیة في اللغة الکردیة )، ئەستەنبوڵ، ١٨٩٣.

٣– شێخ مارف نۆدێ، ئەحمەدی، سلێمانی، ١٨٩٥.

---

(١) محەمەد وەسمان، چەندلاپەڕەیەکی ڕۆژنامەنووسی،ل ١٥٥.

٤- ئی. ئا. ئوربیلی، فەرهەنگی کوردی - ڕوسی، ١٩٢٠.

٥- جەلادەت عالی بەدرخان، فەرهەنگۆك، گۆڤاری (هاوار)، شام.

٦- خەبەرناما ژ زمانێ فەلەیی، کورمانجیی، ڕەوان، یەریڤان، ١٩٣٣.

٧- شاکیر فەتاح، فەرهەنگۆك، ئینگلیزی - کوردی و کوردی - ئینگلیزییە، ڕەواندوز،١٩٣٤.

٨- خەبەرناما تێر مینۆلۆجیێ فەلەیی - کورمانجی، یەریڤان، ١٩٣٥.

٩- عەبدوڵڵا زیوەر - ١٩٤١.

١٠-گیوموکریانی، (( ڕابەر )) عەرەبی و کوردییە، هەولێر، ١٩٥٠.

١١- گیوموکریانی، ((کۆلکە زێرینە))، کوردی - فارسی - عەرەبی - فەڕەنسی - ئینگلیزی، چ١، ١٩٥٥.چ٢، ١٩٦٦.

١٢- فەرهەنگی کوردی - مراد ئاوڕەنگ ((کوردی - فارسی)).

١٣- عیزەدین مەلا مستەفا، فەرهەنگۆك، بەغدا، ١٩٥٥.

١٤- فەرهەنگی مەردۆخ، تاران، ١٩٥٦، کوردی - فارسی - عەرەبی.

١٥- سەمەندیی سیابەند، ئارامیی چاچان، خەبەرناما ئەرمەنیی - کوردیی، یەریڤان،١٩٥٧.

١٦- ئی. ئۆ، فاریزۆف، فەرهەنگی ڕوسیی - کوردیی، مۆسکۆ، ١٩٥٧.

١٧- چ.خ. باکایێڤ، فەرهەنگی کوردیی - ڕوسیی، مۆسکۆ، ١٩٥٧.

١٨- فەرهەنگی خاڵ، ب١ - ١٩٥٩ - ١٩٦٠، ب٢ ١٩٤٠،ب٣ - ١٩٧٦.

١٩- نەقابەی م. سولەیمانی، فەرهەنگۆکی ((زاراوەی زانستی)) ١٩٦٠.

٢٠-ق. کوردۆییڤ، فەرهەنگی کوردیی - ڕوسیی، مۆسکۆ، ١٩٦٠.

٢١- جەمال نەبەز، هەندێك زاراوەی زانستی، سلێمانی، ١٩٦٠.

٢٢- جەمال نەبەز، فەرهەنگۆکی زانستی، هەولێر، ١٩٦٠ - ١٩٦٧.

٢٣- گیوی موکریانیی، ((مەهاباد)) کوردیی و عەرەبییە، هەولێر، ١٩٦١.

٢٤- جگەرخوێن، فەرهەنگا کوردیی، ب١-٢، بەغدا، ١٩٦٢.

٢٥- عەلائەدین سەجادی، کوردیی - عەرەبیی - فارسیی، بەغدا، ١٩٦٣.

٢٦- موسا عەنتەر، فەرهەنگا کوردی - ترکی، استانبوڵ، ١٩٦٧.

٢٧- م. اورەنگ، فرهنگ كوردی، تهران، ١٩٦٨.

٢٨- مەلا عەبدولكەریمی مودەریس، ((دووڕشتە))، فەرهەنگێكی عەرەبیی و كوردییە بە هەڵبەست، بەغدا، ١٩٧٠.

٢٩- عەبدولقادر بەرزنجی، فەرهەنگی زانیاریی، سلێمانیی، ١٩٧١.

٣٠-لیژنەیەكی تایبەتی لە زاناو كوردی زانی بەتوانا، فەرهەنگۆكی زاراوەی پارێزگای سلێمانی، عەرەبی - كوردی، ١٩٧١.

٣١- معروف قەرەداغی، فەرهەنگی كشتوكاڵ، ب١-٢، بەغدا، ١٩٧٢ -١٩٧٣.

٣٢- بەڕێوەبەرێتی گشتی خوێندنی كوردی، فەرهەنگی كوردیی - عەرەبیی، گۆڤاری ((پەروەردە و زانست ))، ژمارە ٤، بەغدا، ١٩٧٢.

٣٣- كەمال جەلال غەریب، فەرهەنگی زانیاریی، عەرەبیی - كوردیی، ب١-٢، سلێمانی، ١٩٧٤.

٣٤- زاراوەی كارگێری، دانان و لێدوانی ئەنجومەنی كۆڕ، پێشەكیی و ڕێكخستنی د.ئەورەحمانی حاجی مارف، ١٩٧٤.

٣٥- زاراوەی هەمە چەشنە، دانان و لێدوانی ئەنجومەنی كۆڕو لیژنەكانی، پێشەكی و ڕێكخستنی د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ١٩٧٤.

٣٦- لیستەی چوارەمی زاراوەكانی كۆڕ، دانان و لێدوانی ئەنجومەنی كۆڕو لیژنەكانی، پێشەكی و ڕێكخستنی د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ١٩٧٤.

٣٧- محەمەد ئەمینی میری سەییدیان، كردی - فارسی - عەرەبی.

٣٨- فەرهەنگی (( ئەلقاموس ئەلعەسری )) كوردیی - عەرەبیی، عەلی سەیدۆ گۆرانی.

٣٩- ئەستێرە گەشە، كوردیی - عەرەبیی، فازیل نیزامەدین، ١٩٧٧.

٤٠-عەبدورەحمانی زەبیحی، قاموسی زبانی كوردیی، ب ١، ١٩٧٧. ب٢، ١٩٧٨.

٤١-فەرهەنگی لەك و لوڕ، حەمدی ئیزەد پەناە، ١٩٧٨.

٤٢- كەمال جەلال غەریب، ئەلقاموس ئەلعلمی، ئینگلیزیی - كوردیی،بەشی دووەم،١٩٧٩.

٤٣- فەرهەنگی فارسیی -كوردیی، شوكروڵڵای بابان، ١٣٩١.

٤٤-هەژار، هەنبانە بۆرینە، فرهنگ كوردیی - فارسیی، چاپی یەكەم، سروش، ١٣٩٦.

٤٥- کەمال جەلال غەریب، ئەلقاموس ئەلعلمی، عەرەبیی - ئینگلیزیی - کوردیی، بەشی سێیەم، ١٩٨٣.

٤٦- ق. کوردۆییڤ، ز. یوسف، فەرهەنگی کوردیی - ڕووسیی (( سۆرانی )) دەزگای چاپەمەنی ((زمانی ڕووسی )) مۆسکۆ، ١٩٨٤.

٤٧- فەرهونگی ئاری - کوردیی، کوردیی - کوردیی - عەرەبیی، سابیر حەمەدو عەلی عەبدوڵلا گرد عازەبانی، بەشی یەکەم، ١٩٨٤.

٤٨- فەرهەنگی نۆبەرە (( ئەلباکورە ))، عەرەبیی - کوردیی، بەشیءیەکەم، گیو موکریانی، ١٩٨٤.

٤٩- فەرهەنگی گەنجینە، عەرەبیی - کوردیی، عەلی عەبدوڵلا، ١٩٨٨.

٥٠-فەرهەنگی کوردیی - ئینگلیزی، شەوکەت ئیسماعیل حەسەن، ١٩٨٩.

٥١- فەرهەنگ کاروانی، فارسیی - کوردیی، ئەبوبەکر رەشید، ١٩٩٣.

٥٢- فەرهەنگی زیوار، جەمال عەبدول، ١٩٩٦.

٥٣- فەرهەنگی شەوکار، جەمال عەبدول، ١٩٩٨.

ئەو فەرهەنگو فەرهەنگۆکانەی زمانزان و ڕۆژهەلاتناسە بیانیەکانیش نووسیویانە، ئەمانەن:

٥٤- ماوریزۆ گارزۆنی ١٧٨٧. ئیتالیی - کوردیی.

٥٥- پ. س. پالاس، فەرهەنگی بەراوردی هەموو زمان و شێوەکان، پیترسبۆگ، ١٧٨٧.

٥٦- کلودیۆس جێمس ریچ، ١٨٣٦- ١٨٣٧.

٥٧- پیوتەرلێرخ، ١٨٥٦ - ١٨٥٧ - ١٨٥٨. کوردیی (( کرمانجی ژووروو)) - ڕووسی، کوردیی ((زازا)) - ڕووسی.

٥٨- سامۆل رهیا، ١٨٧٢، فەرهەنگۆکی کوردیی - ئینگلیزیی.

٥٩- ئەلێکساندەر ژابا، ١٨٧٩. کوردیی - فەرەنسی.

٦٠- ئەلبێرت سۆسین، ١٨٨٧-١٨٩٠ فەرهەنگۆکی کوردیی - ئەڵمانیی .

٦١- س. ئا. یەگیزارۆف، ١٨٩١. کوردیی - ڕووسیی و ڕووسیی - کوردیی.

٦٢- مێجەرسۆن، لەندەن - ١٩١٣، بەغدا - ١٩١٩. ئینگلیزی - کوردیی.

٦٣- باسیل نیکیتین، ورمێ - ١٩١٦ فەرهەنگۆکی ڕووسیی - کوردیی.

٦٤- ئاغا پێترۆس، بەغدا- ١٩٢٠. ئاسوریی - کوردیی و یەزیدی.

٦٥- ر.ف.جاردین، بەغدا، - ١٩٢٢-کوردیی - ئینگلیزیی.

٦٦- جویس بلاو، پاریس. ١٩٦٥. کوردیی - فرەنسیی - ئینگلیزیی.

٦٧- تۆفیق وەهبی، نیویۆرك - ١٩٦٥. کوردیی - ئینگلیزی.

٦٨- تۆفیق وەهبی و ئەدمۆنس، لەندەن - ١٩٦٦. کوردیی - ئینگلیزیی.

٦٩- ئەرنێست مەکاریۆس، ئەمێریکا، ١٩٦٧. کوردیی - ئینگلیزیی.

٧٠- فەرهەنگی ژەنەراڵ - ئۆغۆد تۆبابا.

هەروەها، کۆمەڵێ فەرهەنگی دیکەشمان هەیە، چ لە کوردستان و چ لە دەرەوە لە لایەن نوسەرو شارەزایانی زمانی کوردییەوە چاپکراون.

لە کۆتاییدا دەڵێین : -

فەرهەنگ نووسین کارێکی زانستییەو پێویستی بەکادیری پسپۆڕو لێهاتووی زمان‌و هەموو بوارەکانی دیکەی زانست هەیە، میللەتی کوردیش سەرەڕای ئەو هەموو نەهامەتییەی بەسەری هاتووە، ئەم بوارەی لە بیرنەکردووە، ئەو کارانەی کە لەم بوارەدا کراون جێگەی ڕێزن، بەلآم، هەموو ئەو فەرهەنگ و فەرهەنگۆکانەی کەهەشن، چ لە زمانی کوردییەوە، بۆ زمانەکانی دیکەی بیانی، یان لە زمانە بیانییەکانەوە، بۆ زمانی کوردی بێ لە هەڵەو کەموکورتی بەدەرنێن، ناتوانن بە تەواوەتی تاسەو ئارەزووی خوێنەرو لێکۆڵەرە کوردو بیانییەکان بشکێنن.

بۆ یە پێویستە، کادیرە ئەکادیمییەکانی کورد، لەو بوارەدا بەپەرۆشەوە هەوڵ بدەن‌و ڕاژەی زمانەکەیان بکەن، بۆ ئەمەش : -

سەرەتا دەبێ، لە فەرهەنگە کۆنەکانەوە دەستپێبکەین، هەموو ئەو فەرهەنگو فەرهەنگۆکانەی، چ لەلایەن کەسانی پسپۆڕی بیانی، چ لەلایەن شارەزاو فەرهەنگناسەکانی کورد خۆیەوە، هەر لەکۆنەوە تا ئەوڕۆ، لە سەر زمانی کوردی دانراون، پێویستە، وەك گەنجینەیەکی گرنگ و لە بن نەهاتووی، زمانی کوردی لێیان بڕوانین و هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکەین.

باشتر وایە سەرەتا کۆمیتەیەکی زمانەوانیی و فەرهەنگدانان دامەزرێنین، لە هەنگاوی یەکەمدا، هەموو ئەو فەرهەنگانەی تا ئەوڕۆ نوسراون کۆ بکرێنەوەو، پاشان شارەزایان بە

سەر ئەو فەرهەنگانەدا بچنەوەو هەموو هەڵەو ناڕاستیەکیان بخەنە لاوە، ئینجا، لە بەر ڕۆشنایی میتۆدێکی زانستانەدا، سەرلە نوێ ڕێکیان خەنەوە، کەڵکیان لێ وەرگرن، فەرهەنگێکی گەورەی نوێی کوردی دابنێن، جێگەی زۆربەی زۆری وشە کوردیەکانی تێدا ببێتەوە.

(( لە هەنگاوی – دووەمیشدا، پێویستە، پسپۆڕو شارەزایانی زمانی کوردی، گرنگییەکی تەواو، بە فەرهەنگ بدەن، بە تایبەتی فەرهەنگێکی زمانەوانیی ((کوردی – کوردی))، لە هەرچوار دیالێکتە سەرەکیەکەی زمانی کوردی دابنێن. بۆ ئەم کارەش، پێش هەموو شتێ دەبێ، بە دوای وشەو زاراوە کوردی یەکاندا بگەڕێین. تا وشەی کوردی ڕەسەنمان هەبێ، وشەی بیانیی بە کارنەهێنن.

هەروەها پێویستە، بایەخێکی یەکجار زۆر، بە جۆرەکانی فەرهەنگی (( ئینسکلۆپیدی و فیلۆلۆژی)) بدەن. زمانزان و زماناسەکانی کورد، بە پەرۆشەوە لەو بوارەدا کاربکەن))[1].

لە ئێستاوە پلانی گونجاوی بۆ دابڕێژین و کار بۆ جێبەجێ کردنی بکەین، وەکو پرۆژەیەکی نەتەوەیی. بۆ بە جێهێنانی ئەم کارەش هەوڵی هەمەلایەنگیری و پرۆژەکاری چالاکترە لە هەوڵی پەرش و بڵاو و ناتەواو و هاوکاری کۆڕی زانیاری کوردستان و یەکێتی نوسەران و زانکۆکانی کوردستان زۆر پێویستە.

---

(١) حوسێن محەمەد عەزیز، سەلیقەی زمانەوانی و گرفتەکانی زمانی کوردی،ل٤٩٥ – ٤٩٦.

## بنەماکانی دانانی زاراوە و یەکخستنیان :

زمان نەك هەر ئامێرێکی پەیوەندی کردنەو بەس، بەڵکو هۆکارێکی بنچینەییە بۆ بەیەکبەستنەوەی نەوەکانی ڕابردوو و دوارۆژ. زمان زانست و کەلەپوورو ئەدەب و هونەری نەتەوە دەپارێزێت. ئەرکێکی زمان ئەوەیە، هێمای نوسراو یان بێژراو بهێنێتە کایەوە بۆ دەربڕینی چەمکی زانستی و تەکنیکی و فەلسەفی و سەرجەم بوارەکانی ژیان. کەهۆکاری سەرەکی گۆڕان و گەشەسەندنی زانیاری مرۆڤ و پێشکەوتنی کۆمەڵگەن.

لێکۆڵەرەوان دەتوانن ڕادەی پێشکەوتنی هەرنەتەوەیەك لەبواری شارستانیەتی و زانستییەوە، لە ئەژمارکردنی زاراوەکانی و توانای دەربڕینی بۆ واتاو مەبەستەکان لەگەڵ ڕەورەوەی پێشکەوتن دیاری بکەن.

## یەکخستنی پێوانەیی زاراوەکان

ئەم پرۆسەیە لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی دیکە جیاوازی هەیە. لەبەر ئەوەی چەمکەکان و سیستەمی چەمکەکان جیاوازن، ئەوەش دیاردەیەکی زانستییە، لەبەر ئەم هۆیە زاراوەکان لەسەر بنچینەی ڕێککەوتن لەسەر چەمك و سیستەمەکەیان دەبێت، واتە لەسەر واتاو بواری گەیاندنی.

لەبەر ئەوە تایبەتکاران لێکۆڵینەوەی بەراوردکاری جیا جیا لەبارەی چەمکەکان و سیستەمی چەمکەکان لەزمانە جیاجیاکاندا دەکەن، ئەم ئەرکەش لەئەستۆی کۆڕی زانیارییە، یان لەسەر ئاستی جیهانیشدا ڕێکخراوی جیهانی.

**پێناسە** : -

((یەکخستنی پێوانەیی بەگشتی واتای وایە یەك زاراوە بۆ یەك چەمکی زانستی دیاری بکرێت. واتا دوورکەوتنەوە لەهاو واتایی و هاو بێژەیی و هەموو ئەو شێوازانەی دەبنە هۆی ئاڵۆزی زانستی و تەکنیکی. ئەم یەکخستنە پێوانەییەش بەم شێوەیە دەبێت : –

١. واتای زاراوەکان لەڕێگای پێناسەکردنیان دیاری بکرێت.
٢. دیاری کردنی شوێنی هەرچەمکێك لەنێو پێڕەوی چەمکەکان بەپێی پەیوەندییە ژیربێژی یان ئەنتۆلۆژییەکانی نێوان چەمکەکان.
٣. یەك زاراوە بۆ هەر چەمکێك دیاری بکرێت، کەبەوردی لەنێو هاو واتاکانیدا هەڵبژاردرابێت.

٤. دانانی زاراوەی نوێ بۆ هەر چەمکێك ئەگەر زاراوەی لەبار بۆ هاو واتاکانی کەهەن و لەئارادان دەستەبەر نەبوو ))[1].

لە ئەنجامدانی ئەم ئەرکەشدا پێویستە پەیڕەوی چەندان بنەمای بنچینەیی بکرێت :-

١. لەچەمك و پەیوەندییەکانی نێوان چەمکەکانەوە بەرەو زاراوە چوون، نەك بە پێچەوانەوە.

٢. ڕەچاوکردنی ئاسانی دەربڕین و لەخۆگرتنی چەمکەکە لەدانانی زاراوەدا.

٣. ڕەچاوکردنی باری ڕێزمانی و تایبەتییەکانی زمانەکەو ڕێسای باوی زاراوەسازی و نەگۆڕینییان مەگەر بە هۆکاری زۆر بەهێزو دروست نەبێت.

بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکە مەزنەیش چەندان دەستاوێژی، بێژەیی، مۆرفۆلۆژی... هتد. بۆبەرهەمهێنانی ئەو زاراوانەی کەوا چەمکە زانستی و تەکنیکییە نوێیەکان دەردەبڕن لەئارادان. ئەو دەستاوێژانەش :

(( ١. داڕشتن ٢. لێکدان ٣. خوازە ( پێچەك ) ٤. داتاشین

٥. خواستنەوە (وەرگرتن) ٦. وەرگێڕان ))[2].

(١) د. علي القاسمي، مقدمة في علم المصطلح، ل٣٥-٣٦.

(٢) محەمەد وەسمان، گیروگرفتەکانی زاراوە دانان لەزمانی کوردیدا،ل ٤٤.

# بوونی كۆڕێكی زانیاری و یەكخستنی زاراوەكان

یەكخستنی زاراوەكان كارێكی گرنگ و پێویستە، پەیرەوكردنی ئەركێكی زانستی و نەتەوەییە، بێگومان بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەركە مەزنەش پێویستمان بەلیژنەیەك دەبێ كە لەكەسانی شارەزا لەبواری زانستەكان وزمانەوانی بەتواناو لێهاتوو پێكهاتبێت. هەروەها شارەزاییان لەهەموو دیالێكت و بەشە دیالێكتەكانی زمانی كوردی.

زاراوەسازی زانستێكی ئاڵۆزە چەند زانستێك بەشداری تێدا دەكەن، ڕووبەڕووی چەندین كێشەی جۆربەجۆر دەبێتەوە، یەكێك لەو كێشانەی كە ئەمڕۆ هەستی پێ دەكرێت، هەوڵ نەدانە بۆ دانانی فەرهەنگێكی یەكگرتووی زاراوە هەروەك پێشتر باسمان كردن، كەزمانەوانان و پسپۆڕان و مامۆستایان و خوێندكاران، بتوانن لەهەموو شوێنێكی كوردستان سوودی لێ ببینن، جگە لەمە، كێشەیەكی دیكە هەوڵ نەدانە بۆ یەكخستنی زاراوەكانمان، بەتایبەتی زاراوە زانستییەكان و بەكارهێنانی زاراوەیەكە بەرانبەر بە واتای جۆربەجۆر، كەئەمەش لەگەڵ ئەو پێوەرە زانستییەدا ناگونجێت، كەبۆ زاراوە دانان پێشنیاز كراوە، ئەویش : -

(( دانانی یەك زاراوە، بەرانبەر یەك واتا ))یە.

بۆیە پێویستمان بە كۆڕێكی زانیارییە، كە هەڵسن بە یەكخستنی زاراوە زانستییەكان و چارەسەركردنی ئەم لایەنانەی خوارەوە :-

١. یەكدیگیربوونی زاناكان و یەكخستنی بیرو بۆچوونەكانیان و یەكێتی تێڕوانینی ڕۆشنبیرو وێژەوانەكانمان لەسازكردن و هەڵبژاردنی زاراوەیەك بۆ واتایەكی دەستنیشانكراو.

٢. یەكخستنی زاراوەكانی خوێندن :

یەكێك لەبنەما گرنگەكانی هەركتێبێك، زمانڕەوانییەتی، كتێبەكە هەرچەندێك بەپێزو ئاخنراو بێت لەبابەتی زانستی، ئەگەر هەڵەی زانستی تێدا بێت، لەبەر چاوی خوێنەردا، ئەو بایەخەی نابێت، هەروەها باش نوسین و جوان دارشتنی ڕستەو پەرەگما كردنی دەربڕینەكانی و توندو تۆڵی و پێكەوە گرێدانیان، زاراوەكانی خوێندن، كە پێویستە ڕوون دەربڕابێت و بەئاسانی مامۆستاو خوێندكارانیش تێیان بگەن، بۆ ئەم مەبەستە پێویستە دوور بێت لە ئاڵۆزی و دەستەواژەی قورس و دەربڕینی درێژو گرانی بەپێی توانا كەم تێدابێت.

هەروەها ڕێککەوتنی مامۆستاکان لەسەر زاراوەیەکی یەکگرتوو لەوانە وتنەوەداو دانانی کتێب و لێکۆڵینەوە لەم بابەتدا، تاکە ڕێگای فێرکردنی خوێندکاران و یەکخستنیانە لەسەر گەیاندنی زانیاری و ڕۆشنبیری بۆ مێشك و هەستیان.

ئەم کێشەیەش نەك هەر لەزمانی کوردیدا، بەڵکو لەزمانانی دیکەش ( بەوێنە زمانی عەرەبی)دا هەیە و پێویستە ئەم زاراوانە ڕێکبخرێن.

لەبارەی گرنگی دان بەزاراوەی فێرگەکان لە ژمارەیەکی بەرگی دووەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاریدا هاتووە :-

(( ئەنجومەنی کۆڕ لە کۆبوونەوەکانی خولی سێهەمییدا، بایەخێکی زۆری بەو زاراوانەدا کەلەکتێبی فێرگەکاندا بەکارهێنراون و بەشێکی زۆریان لەگۆڤاری ( پەروەردەو زانست ) دا بڵاوکراونەتەوە )) [(١)].

بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێت، کە:-

دانانی زاراوەی یەکگرتوو، یەکخستنی بیرو بۆچوونەکان سەبارەت بەو زاراوانەی کە لە کتێبەکانی خوێندندا هەن، یەکێکە لەکێشەکانی ئەمڕۆی زاراوەی کوردی، بەوێنە :-

ئەگەر چاوێك بەو کتێبانە دا بگێڕین، زۆرجار دەبینین دوو زاراوە یان پتر بۆهەمان مەبەست دانراوە، مامۆستاو خوێندکارانیش، هەریەکە بەئارەزووی خۆی، زاراوەیەك بەکاردەهێنن، وەك :-

بکەر – کارا

دیارخەر – دەرخەر

دیارخراو – دەرخراو – تەواوکراو

ئاوەڵفرمان – ئاوەڵکار – ئاوەڵکردار

تەواوکەری ڕاستەوخۆ – تەواوکەری یەکسەری

ڕستەی خەبەری – ڕستەی هەواڵی

خوازە – خواستن – ئاوەڵواتا – میتافۆر

ڕوخسار – فۆرم – شێوە – شکڵ

ئەدەب – وێژە

---

(١) ئەنجومەنی کۆڕی زانیاری، لیستەی دووەمی زاراوەکانی کۆڕ،گۆڤاری کۆڕی زانیاری،ل٨٩٤.

قافیه – سەروا

کێش – وەزن

ئەدڤێرب – ئاوەڵ گوزارە

ئامرازی پەیوەندی – پرێپۆزیشن

مەسعود محەمەد لەم بارەیەوە دەڵێ :–

(( تا ئێستا چەندین زاراوەی جودا جودا بۆ باسەکان و بەشەکانی ڕێزمانی کوردی کەوتوونە سەرزارو ناو نووسینەوە تا وا بووە یەك عینوان دووسێ زاراوەی بۆ دانراوە وەك وشەکانی ( فرمان، کار، کردار...) کوا بۆ زاراوەی (verb، فعل ) بەکاردێت. )) [1]

ئەگەر نموونەیەك لەسەر زاراوەیەکی ڕێزمانی بهێنینەوە، زیاتر ڕاستی ئەو بۆچوونەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە :–

کێشەی زاراوە هەیە لەسەر ناونانی ( ڕستەی ئاڵۆز ) کەلە لایەن نوسەرانەوە، چەند ناوێکی بۆ دانراوە، وەك :

ڕستەی ئاڵۆز، ڕستەی ئاوێتە، (( ڕستەی تێکەڵ )) [2]

- یەکخستنی ئەو زاراوانەی کەلە کۆلیژەکان مامۆستاو خوێندکار بەکاری دەهێنن، لەگەڵ ئەوانەی کەلە خوێندنگا ناوەندییەکان بەکاردەهێندرێت، هەوڵدان بۆ هەڵبژاردنی یەك زاراوە بەرانبەر یەك واتاو پەیڕەوکردنی لە کتێبە مەنهەجییەکانی هەموو قۆناغەکانی خوێندن هەر لەسەرەتاییەوە تا دەگاتە خوێندنی باڵا. واتە نابێ مامۆستایەکی زمانی کوردی، لەزانکۆ زاراوەی (کار) بەکاربهێنێت و مامۆستایەکی دواناوەندی کەبابەتی زمانی کوردی دەڵێتەوە زاراوەی ( فرمان) بەکاربهێنێت. یاخود (کارا) و ( بکەر)، هەمان شت سەبارەت بە خوێندکارانیش.
- تاوەکو ئێستاش لەناو نوسەرانی کورددا چەند وشەی جیاجیا بەرانبەر بە زاراوەی (ضمیر)ی عەرەبی لەکوردیدا بەکاردەهێندرێت.

---

(١) مەسعود محەمەد، وردبوونەوە لەچەند باسێکی ڕێزمانی کوردی، ل پێشەکی .

(٢) د. کوردستان موکریانی، سینتاکسی ڕستەی تێکەڵ، ل٥.

(( ئـەوەتا هەنـدێك ( ڕانـاو ) و هەنـدێكی تـر ( جێنـاو ) بەكارئـەهێنن و، هـی وایـش هەیـە (بۆ ناو) یان(بەرناو)ی بەكارهێناوە)) [1].

ئەمڕۆ لەزمانی كوردیدا، هیچ كەسێك لایـەنی بـەكارهێنانی ( بۆنـاو ) یـان (بـەرناو) ناگرێ، بەڵام لایەنگرانی ( جێناو ) و ( ڕاناو ) كەم و زۆر هەن.

بەبۆچوونی ئێمە زاراوەی ( جێناو) گونجاوو پەسەندترە، لەبەر ئەوەی :–

(( بەشی یەكەمی ئەو زاراوەیە – ( ڕا ) بەگەڵێ واتا دێ... بە نموونە :

١. تەگبیر ( بیروڕا )...لە ( رأی ) عەرەبییەوە.

٢. ڕێ، ڕێگە : ڕابەر > ڕێبەر... ( ڕا) ش پتر ڕێژە فارسی یەكەیەتی و ( ڕێ ) كوردییە.

٣. وەك پێشگر دەچێتە سەر كار : هاتن – ڕاهاتن

گرتن – ڕاگرتن

وە بەچەند واتایەكی دیكەش دێت. ( ڕا ) كە ئەو هەموو مانایەی هەبێ، هەڵبەت بۆ خوێنەر ئاسان نییە، كـە لـەپێش وشـەی ( نـاو) دا دابنـرێ، یەكسەر تێـی بگـاو بزانـێ كـام مانایان مەبەستە.

لەگەڵ ئەوەدا، كە ( ڕا ) ئەو هەموو مانایەی هەیە، ئەوجا مانای ( جێ ) ناگەیـەنێ مەبەستیش لەو زاراوەیە، ئەوەیە ( جێی نـاو ) بگرێتـەوە بـۆ بەڵگـەش، شـێوە ڕۆنـانی ئـەو زاراوەیە – لەزمانە ئەوروپاییەكاندا بەم جۆرەیە :–

| | |
|---|---|
| یۆنانی | Antonymia : ( anto- جێ ) + ( nymia - ناو ) |
| لاتینی | Pronomen : ( Pro - جێ ) + ( nomen - ناو ) |
| ئینگلیزی | Pronoun : ( Pro - جێ ) + ( noun - ناو ) |

كەواتە : ( جێناو ) واتە بەپێی ڕوخسارو ناوەڕۆك، لە (ڕاناو ) ڕونترو گونجاوترە.

( جێ ) تەنیا یەك واتای هەیە، كە ئەویش ( شوێن ) ە.

---

(١) دەستەی كورد، بانگەوازێك لەلیژنەی ڕێزمانی كوردی یەوە،گۆڤاری كۆڕی زانیاری عێراق،ب ٢٩–٣٠،ل٣١٤.

واتاکەشی زۆر ئاسان و ڕوونە... هەرچی ( ڕا ) یە وشەیێکی فرەواتایەو زۆربەی واتاکانیشی لێڵ و زەحمەتن... ))[1].

لەکۆتاییدا ئەوە دەردەخەین، کە : –

پێویستە زاراوەکانمان یەکگرتوو بێ، نابێ خوێندکارێك لەشاری هەولێر، زاراوەی جێناڤ، بەکاربهێنێت و خوێندکارێکی دیکە لەشاری سلێمانی بۆ هەمان واتا، زاراوەی جێناو یان ڕاناو بەکاربهێنێت، ئەمانە لەگەڵ ڕاستی زانستیدا ناگونجێن و خزمەت بەزمانی کوردی ناکەن.

هەروەها (( لەنوسینێك کە بۆ کتێبی خوێندنگاکان دانرابێ، نوسینی دێرێك بە سلێمانی و یەك بەشێوەی هەولێری و بادینانی یان سنەیی یاخود موکرِیانی قسە پێکەرانی زارێکی تایبەتی فێری زارەکانی تر ناکات. بەڵکو سەر لە هەموان تێك دەدات و زمانی کوردیش بەرەو لەنێوچوون دەبات ))[2] بەڵکو دەبێ هەموو دیالێکت و بەشە دیالێکتەکان ڕەچاو بکرێت و یەك زمانی ئەدەبیی یەکگرتوومان هەبێ بۆ خوێندن و بۆ نووسین.

هەروەها لەگەڵ ئەو بۆچوونەش نین کە دەڵێ : – باواز لەو دوو دیالێکەتە سەرەکییەی زمانی کوردی بهێنین هەر یەکەیان بەشێوەکەی خۆی پێی بنووسرێ و بخوێندرێ ئیتر زمانی ئەدەبیی یەکگرتوومان بۆچییە ؟!

هەروەها ئێمە لەگەڵ ئەو بۆچوونەدانین، کە بە ( تێهەڵکێشکردن ) ی زاراوەکانی کرمانجی خواروو، کرمانجی ژووروو ناودەبردرێت، کۆڕی زانیاری کورد لەم بارەیەوە دەڵێ :

(( تێهەڵکێش کردنی سۆرانی بە وشەی کرمانجی، یابە پێچەوانەوە، هەنگاوێکی گەورەو مەرجێکی پێویستە بۆ دروست بوون و جێگیر بوون و بڵاوبوونەوەی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووماندا، دوو هەمیشیان ئەوەیە کە لەڕێگەی ئەو جۆرە کارەوە دەتوانین سامانێکی زمانەکەمان نیشان بدەین و بیپارێزین ))[3].

بێگومان سوود وەرگرتن لە دیالێکەتەکانی زمانی کوردی، بۆ دەوڵەمەند بوونی فەرهەنگ بەکارێکی باش دادەندرێت، بە جۆرێك پەرەسەندن و گەشەسەندنی هەریەك لەو

---

(١) دەستەی کورد ، بانگەوازێك لە لیژنەی ڕێزمانی کوردی یەوە، ل٣١٥ – ٣١٦.

(٢) د. عیزەدین مستەفا ڕەسول، بۆ زمان،ل ١٢٨.

(٣) ئەنجومەنی کۆڕ، لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، ل٨٩٨.

دیالێکتانـه دەبێتـه هـەوێنی بوژاندنـەوەی زمـانی ئـەدەبیی و بوژاندنـەوەی زمـان، بـەلام ئەنجامدانی ئەم کارە نابێ بە شێوەیەکی ڕەمەکی و لابەلا بێـت، لەکاتێکدا پێویـستە زاراوە لەدیالێکتێکدا وەربگرێت، کەلە زمانی ئەدەبیدا ئەو زاراوەیە دەست نەکەوێت و نەبێتە هـۆی دروست بوونی هاوواتا.

هەندێك زاراوە هەیە بۆ زۆرشت بەکاردێت، کە هەندێکیان لەجێگای خۆیدا نین، ئەم زاراوانە، کەبۆ واتای جۆراوجۆر بەکاردەهێندرێن نەبوون بە فرەواتـا ئەگـەر بـبن بـە فرەواتـا زمانەکەمان دەوڵەمەند دەکەن، کەئەمەش جۆرێك لە ئالۆزیی و سەرلێشواوی بـۆ فەرهـەنگی زمان دروست دەکات، بەوێنە :-

ئەگـەر (( سـەیری وشـەی ( ئاسـت ) بکـەین، بـۆ چـەندین واتـای جۆربـەجۆر بەکاردێت، ناشتوانین بەفرەواتایان دابنێین، لەبەر ئەوەی واتاکان لەیەك نزیك نـین و لەیـەك سەرچاوەوە نەهاتوون))، وەك :-

١. ئاستەکانی زمان
٢. ئاستی لێکۆڵینەوەکە

دووشتی جیاوازن لەزۆر شوێن ئەو زاراوانە بەناچاری بەکار دێن.

کاتی خۆی ئەنجومەنی کۆڕی زانیاری بەرانبەر بە ( مستوی ) زاراوەی ( ڕێکـار) ی پێشنیاز کردووە، (( وەك : ((Level )) ؛ بۆ هەموو واتاکانی ؛ دەگوترێـت : لـەڕێکی یـەکن واتا لەیەك ((مستوی))دان ؛ قیاس لەسەر : لێـوار، کـردار، ڕوکـار، بنـار، ڕوخـسار... ))[1]، بەلام لەزمانی کوردی ئەمڕۆدا زاراوەی ((ئاست )) بەکاردێت.

ئاستی بەرزی ئاوەکە : مستوی
ئاستی خوێندن لە کوردستان چۆنە : مستوی
ئاستی ژیان ( مستوی المعیشة )
هەروەها زاراوەی ( ئاست ) بەم واتایانەش دێت : -

١. پەنا، تەنیشت، لا
- لەئاست دەرگاکە بۆم دابنێ، لەئاست خۆت دانیشە.

---

(١) ئەنجومەنی کۆڕ، لیستەی یەکەمی زاراوەی کارگێڕی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، ل٥١١.

٢. (( بەرانبەر، ڕووبەڕوو، لەئاست ئەم ڕووداوە نازانم چ بکەم )) [(١)].

- ئاستی ئاسۆیی، ئاستی ستوونی.
- ئاستی سروە لە خوێند بەرزە.
- ئاستی بیرکردنەوەی نزمە.
- ئاستی ڕۆشنبیری، ئاستی زانیاری، ئاستی ئابووری...هتد.
- بەکارهێنانی زاراوەی ( ئاست ) وەکو زاراوەیەك بۆ ئەم هەموو واتا جۆراوجۆرو لێك جیاوازە، زیان بەزمانەکەمان دەگەیەنێت و سەریش لەخوێنەرو گوێگر تێك دەدات.
- زاراوەی ( ڕێباز ) ئەویش بۆ زۆر واتا بەکادێت : –
- ڕێبازی لێکۆڵینەوەکە.
- ڕێبازی کارەکە.
- ڕێبازی خەبات.
- ڕێبازی ژیان.
- ڕێبازی بەرگری کردن.
- ڕێبازی سیاسی.

- شێوە :–
- شێوەی کارکردنەکە.
- شێوەی شیعرەکە.
- شێوەی ئافرەتەکە.
- شێوەی بیرکردنەوە.
- شێوەی دەربرین.

---

(١) عەلی نانەوازادە، فەرهەنگی هەرمان،ل ٧٧.

## ٣- رۆڵی ڕێکخراوه كوردستانییه‌كان : -

ئـه‌و ڕێكخـراوه‌ ( پیـشه‌یی، دیموكراسـی و پارتـه‌ ڕامیـاری )انـه‌ی كوردسـتان، بـه‌هۆی یه‌كدیگیر نه‌بوونی بۆچـوونه‌كانیان، لـه‌و زاراوانـه‌ی كه‌بـه‌كاری ده‌هێـنن، ڕۆڵێكـی نێگـه‌تیڤ، له‌دواكه‌وتن و كه‌رت كردنی

( زمان، هونه‌ر، وێژه‌ی كوردیی، ڕێزه‌كانی یه‌كێتی نوسه‌ران و هونه‌رمه‌نـدانی كـورد ) دا وازیده‌كه‌ن. ئه‌م ڕێكخراوانه‌، هه‌ریه‌كه‌یان به‌پێی به‌رژه‌وه‌ندی ڕێكخراوه‌كـه‌ی خـۆی، هـه‌نگاو ده‌نێ و به‌رنامه‌كانی داده‌ڕێژێ هیچ لایـه‌كیان گـوێ بـه‌ به‌رژه‌وه‌نـدی نه‌ته‌وه‌كـه‌مان نـاده‌ن، به‌پێی ڕه‌فتـاری پارتـه‌ سیاسییه‌كان، زاراوه‌ی جیاجیـا بـه‌كارده‌هێنن و یـه‌كێتی ڕیزه‌كـانی نووسه‌ران و ئه‌كادیمیای كوردیان پچڕاندووه‌.

زاراوه‌و ده‌ربڕینه‌ كوردییه‌كانیشیان له‌نێو خۆیاندا به‌ش كردووه‌، به‌وێنه‌ :–

( پـارتی دیمـوكراتی كوردسـتان ) و ( یـه‌كێتی نیـشتمانی كوردسـتان )، نـاوی ڕێكخـراوه‌ پیـشه‌یی و جه‌ماوه‌ریـه‌كانیان به‌شـكردووه‌، پـارتی – ( یـه‌كێتی قوتابیـانی كوردسـتان )و (یـه‌كێتی ئافره‌تـانی كوردسـتان ) ی هه‌یـه‌. بـه‌ڵام یـه‌كێتی – (( كۆمه‌ڵـه‌ی خوێنـدكارانی كوردســـتان )) و (( یـــه‌كێتی ژنـــانی كوردســـتان )) ی هه‌یـــه‌، لـــه‌بری (( قوتابیـــان – خوێندكاران))و له‌بری (( ئافره‌تان – ژنان )) به‌كارده‌هێنن.

به‌ بۆچوونی ئێمه‌ :– هه‌ردوو زاراوه‌ی (( خوێندكارو ژن )) له‌ (( قوتابی و ئافره‌ت)) كوردی ترو ڕه‌وانترن.

هـه‌روه‌ها هه‌نـدێ زاراوه‌ی دیكـه‌ش وه‌كـو :– فێرخـواز، شـاگرد یـان فێركـار – مامۆسـتا، قوتابخانه‌ – خوێندنگا، دواناوه‌ندی – ئاماده‌یی...هتد.

- یه‌كێتی ( مه‌ڵبه‌ند ) به‌كارده‌هێنێت، ( مه‌ڵبه‌ندی سێ )
- پارتی (لق ) به‌كارده‌هێنێت، ( لقی سێ )
- پارتی ( سوپا ) به‌كارده‌هێنێت.
- یه‌كێتی ( له‌شكر ) ( له‌شكری هێزه‌كانی پێشمه‌رگه‌ ).

## زاراوەی کارگێڕی :-

- لە هۆکارە سەرەکییەکانی نەبوونی ڕێکخستنی زانستی لەبواری زانیاری وکارو باری کارگێڕیدا، نەبوونی یەك جۆرە وشەو دەربڕینی کارگێڕییە، کەهەموو لایەك لەسەری ڕێکبکەون.

هەروەکو ئاشکرایە، لە هەربوارێکی زانیاریدا، پێویستە بیروڕاو چەمکی تایبەت هەبێ بەو بوارە کەبشێ بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاڤە کردنەکەی ئاسان بێت و خەڵك بەباشی تێی بگات .

لەکاتێکدا کە وشەو زاراوەو دەستەواژەکان هۆکارێکی تێگەیشتن و ئاڵوگۆڕکردنی بیرو ڕاکانن لەنێوان قسە پێکەراندا، پێویستە ماناکانیان ڕوون ئاشکرا بێت.

کە ئەوە بەتەواوی لەبواری کارگێڕیدا لەگەڵ زاراوەو دەستەواژەکانی ئێمەدا ڕێکناکەوێ، تێگەیشتنێکی ورد و تەواو لەنێوان خەڵکی لەبارەی ئەم بابەتەوە نابینرێ.

ئەو وشەو زاراوانەی کە لەهەر بوارێك لەبوارەکانی چالاکی مرۆڤدا بەکاردەهێنرێن، لەلایەن کەسانی خاوەن پەیوەندی بەم بوارە دەدۆزرێنەوە و پەرەیان پێ دەدەرێت، بواری کارگێڕیش لەم بارەیەوە نامۆ نییە. : –

(( لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم دا بایەخێکی زۆر بەبڕارکردنی زاراوەو واتاکانی کارگێڕی و بنەما سەرەکییەکانی دیکەدرا. پێشەنگەکانی ئەم کارەش لەبواری ( کارگێڕی زانستی ) دا وەك :– برنارد Barnard و بورن bourn و فایۆل Fayal و فولیت Follet و جلبرت Gilberth و مونی Mooney و ریلی Reilley و تایلر Taylor وەکەسانی دیکەش بوون.

نووسەرەکانی سەرەتا لە نوسینەکانیاندا هەوڵیانداوە لەوەی کە نوسیویانەو پۆلێنیان کردووە لەبواری کارگێڕیدا کە سنورێك دابنێن بۆ زاراوەو دەستەواژە درێژەکان، کارگێڕی و ڕێکخستن، وەکارگێڕی جێبەجێ کردن و دەسەڵات و چاودێری و لێپرسراویەتی و پلان دانان. بەڵام هەر زوو جیاوازی لەنێوانیاندا پەیدا بوو دەربارەی سنوری ئەم واتایانە بۆ زۆربەی ئەم وشانە )) [١].

---

(١) ن. غطاس، أ. برش، هـ. جوهانسن، أ. روبرتسون، قاموس الادارة، المقدمة (أ، ب ).

- چەمکە کارگێڕییە بنچینەییەکان ئێستاش لە قۆناغی بەرەو پێشەوە چوونداﻥ، لەبەر ئەوەی کارە کارگێڕییەکان هەر خۆیان دینامیکین و لە جوولەی بەردەوام دان، جیاوازی زۆرە لەنێوان وشەو چەمك و زاراوەیەکی کارگێڕی و زانستە سروشتییەکاندا.

زمانی کوردی ناسنامەی میللەتی کوردە، بۆیە بایەخ پێدانی بە ئەرکێکی نیشتمانیو نەتەوەیی دادەندرێت، بۆ کورد لەزمانە بیانییەکان زۆر لە پێشترە، زمانی ئینگلیزی، عەرەبی... هتد. ئامرازی رۆشنبیرین زمانی ژمارەیەکی گەورەی مرۆڤایەتین، بەلاّم بۆ کورد یەکێتی نەتەوەیی لەپاراستنی یەکگرتوویی زمانی کوردی دایە بەتایبەتی یەکێتی زاراوەکانی ( زانستی، کارگێڕی، ئەدەبی، هونەری) لەم رێگایەوە یەکێتی کەلەپوور پەیدا دەبێت و نەوە دوای نەوە یەکدی دەخوێننەوە.

لێرەدا مەبەستمانە باس لەو زاراوانە بکەین، کەلەفەرمانگەکان و دام و دەزگاکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان بەکاردێ، زۆر پێویستە ئەم ناوو زاراوانە یەکبخرێن، ناوی فەرمانگەکان، ناوی پلەو پایەی کارگێڕی، زاراوەکانی کارگێڕی بەگشتی زمانی نوسراوەکانی حکومەت یەك بخرێن، ئەم زاراوانە پێویستە لەلایەن لیژنەیەکی پسپۆڕەوە تاکۆڕی زانیاری دەست بەکار دەبێت و بەرهەمی دێتە مەیدانەوە هەوڵ بدرێت یەك بخرێن، ئەو پاشاگەردانیو پەشێویە نەمێنێت.

ئەمرۆ چەندین زاراوەی نوێی کارگێڕی هاتوونەتە کایەوە کە کوردی ڕەسەنن و لە جیاتی زاراوەی عەرەبی بەکاردێن لە دام و دەزگاکاندا، وەك : –

سەرمووچانە، دەرماڵە، هاتوو، دەرچوو، ژمێریاری...هتد.

(( زمانی کوردی هیچی لەم ڕووەوە لەزمانەکانی دیکەی جیهان کەمتر نییە، تەنها بەیەخ پێدان نەبێت، هەموو ئەو بوارانەی زمانەکانی دیکە خزمەتی تێدا دەکەن، لەکوردیشدا بەئاسانی خزمەتی تێدا دەکرێت، بەلام ئاوڕدانەوەیەکی دڵسۆزانەی دەوێت، رێگای بنیاتنانی ئەم ئەرکە مەزنەش بەهەنگاوێك دەست پێدەکات ) [1].

پەرەپێدانی زمان بەزاراوەی نوێ و زانیاری تازە بۆ هێنانەدی ئەرکێك و لەخزمەتی کارێکی کۆمەلاّیەتیی دایە لەهەمان کات ڕوانینێکە بۆ جیهان، بەتایبەتی ئەمرۆ حکومەتی هەرێم بەشێك لە پێویستییەکانی زمانی کوردی پڕ کردۆتەوە، خەریکە زاراوەی کوردی وردە

---

(١) محەمەد وەسمان، چەند لاپەڕەیەکی ڕۆژنامە نووسی، ل١١٦.

ورده شوێنی زاراوه عەرەبی و بیانییەکانی دیکه دەگرێتەوە، بۆیه هەوڵدان و بڵاوکردنەوەی فەرهەنگی هاوبەش بۆ زاراوه کارگێڕییەکان لەوانەیه سوود بەخش بێت ئەگەر چی زۆر وردو گشتگیریش نەبێت، چونکه کاری بەڕێوەبەرێکی نەخۆشخانه جیایه لەگەڵ بەڕێوەبەرێکی کارگێڕی پەروەردەو شارەوانی و نەوت و کارگەی چیمەنتۆ...هتد.

وەئەگەر بمانەوێ فەرهەنگێك دابنێین کاری هەموان بەدوورو درێژی ڕوون بکاتەوە، ئەم کاره ماوەیەکی یەکجار زۆری دەوێت و بێ سنوور دەبێت، بۆیه تەنیا ئەمانه دەکرێن لەم کارەدا :-

١. (( دەربڕینه کارگێڕییه سەرەکییەکانی تایبەت بەبنەما کارگێڕییەکان و تیۆره گشتییەکان.

٢. دەربڕینه گشتییه بڵاوبۆوەکان لەهەموو بوارەکاندا، وەك :- دارایی، بەرهەم هێنان، کاروباری فەرمانبەران...هتد.

٣. ئەو زاراوانەی کەباسی شێوازه جیاجیاکانی کارگێری دەکەن بەدوور کەوتنەوەی لە ڕاڤەکردنێکی دوورو درێژ که پێویستییەکانی هەموو پسپۆڕییەکانی ئەم بوارانەی تێدا بێت.

٤. زاراوەی تایبەتی به بابەتی تر که پەیوەندی داره بەکارگێڕی، وەکو ئابوری و یاسا، سەرژمێری و کۆمەڵناسی و...هتد. که پەیوەندییان به بواری کارگێڕییەوه هەیه ))[1]

(١) ن. غطاس، أ. برش، هر. جوهانسن، أ. روبرتسون، قاموس الادارة، المقدمة ( جـ ).

# چەند بنەمایەك بۆ دۆزینەوەو دانانی زاراوەی زانستی

١- پێویستە پەیوەستی و بەشداری و لێکچوونێك هەبێ، لەنێوان واتای زمانە زاراوەو واتا زانستییەکەیدا، مەرج نییە زاراوە هەموو واتا زانستییەکە بگرێتەوە.

٢- دانانی یەك زاراوە بۆ یەك چەمکی زانستی، دوورکەوتنەوە لەوەی کە هەرزاراوەیەك چەند واتایەکی هەبێ لەیەك بواردا، واتا باشتر وایە کە زاراوەی زانستی سازدەکەین، واتای زانستی دیکەی نەبێ، دەبێتە هۆی تێکەڵی و ئالۆزی.

٣- لەنێوان وشە هاوواتا کوردییەکاندا، ئەوەیان هەڵبـژێرین کە بەپەسەند دەزانرێت بۆ زاراوەی زانستی پاش لێکۆڵینەوەو دەست بـژێرکردنیان لەلایەن لێژنەی تایبەتو پسپۆڕی زاراوەسازی.

بەوێنە : - (( بیانی : - بێگانە، لابیدە، نامۆ، ناشناس، بێوار، دەرەکی

مووچە خۆر : فەرمانبەر

بێباك : بێ پەروا، کەمتەرخەم ))[1].

٤- (( هەموو زمانێك وشەی بە پێزو وشەی نەزۆکی تێدا هەیە ))[2].

پەسەند کردنی ئەو وشانەی کە بەئاسانی زاراوەی دیکەیان لێ سازدەکرێت، بەسەر ئەوانەدا کە نەزۆکن بەوێنە ( لەزمانی ئینگلیزیدا ئەگەر سەرنجی هەموو ئەو زاراوانە بدەین کە سەر بە ( ئاو ) ن دەبینین لەجیاتی لەوشەی ( Water ) وەرگیرێن، لەوشەی (aqua) و (hydro) وەردەگیرێن، چونکە دەتوانرێت دەیان زاراوەی هەمە جۆریان لێ سازبکرێت و وەربگیرێت.))[3].

٥- لەنێو وشە هاوواتاکاندا ئەوەیان بەزاراوە هەڵبـژێرین کە واتا زانستییەکە بە ووردی دیاری دەکات، بەوێنە یەکێك لەو کێشانە تێکەڵی ئەو وشانەیە کە لە بوارە ئەندازەییەکاندا، بەکاردەهێندرێن، جیاوازی نێوان هەر جووتە وشەیەك لە مانەی خوارەوە، لە بیری زۆر کەسدا روون نییە، کە کاردەکاتە سەر ڕاست تێگەیشتنی زانستە واتاکەی :

---

(١) تاهیر سادق، فەرهەنگی هاوواتاکانی کوردی،ل ٥٩.

(٢) فردیناند دی سوسور، ( و ) : د. یوئیل یوسف عزیز، علم اللغه العام،ل ١٨٩.

(٣) جەمال عەبدول، بەرکۆلێکی زانستە زاراوەسازیی کوردی،ل ٤٩.

((بەهێز و بەتین،ڕەق و بەستوو، نەرم و خاو، شلەوە بوون و شل کردنەوە،هێزو توانست، پتەو و سەخت، مەییو و بەستو، مەکینە و بزوێن، کارگە و شوێنکار، خاو و کانزا ))[1].

٦- بوژاندنەوەی کەلەپورو زیندوو کردنەوەی وشەی کۆنی کوردی، بۆ سازکردنی زاراوە زانستییەکان، پێویستە، وشەی کوردیی ڕەسەن بەکاربهێندرێت و بەپێی توانا لە شێوە زمانی خۆماڵی و وشەی بازاڕی و ڕەشۆکی دوور بکەوینەوە.

٧- بەشداری کردنی پسپۆڕو بەکارهێن لە سازکردنی زاراوەداو یەکبێنە توێژینەوەو بەشوێن زاراوەدا گەڕان و ساغکردنەوەو تاوتوێ و چەسپاندنی، تا هەمیشە پەیوەندی بەتین هەبێ لەنێوان زاراوەسازو بەکارهێنانی زاراوەداو لێك دانەبڕێن.

٨- پەسەند کردنی زاراوەی یەك وشەیی بەسەر دوانی وسیانیدا، چونکە لێ وەرگرتن و کۆکردنەوەو خستنەسەری ئاسانترە.

٩- بەکوردی کردنی ئەو ناولێنراوە زانستیانەی رواڵەتێکی نێو دەوڵەتیان هەیە، ئەو زاراوانە لەبنجدا یۆنانی یان لاتینین یان ناوی زانایانن و وەك زاراوە بەکاردێن یان تۆخم و ئاوێتە کیمیاییەکان دەردەبڕن، وەك : – (( پاستۆراند، البسترة، Pasteurization، بەناوی

١٠- ( Louispasteur) ی زاناوە.

یان هەندێ شێوازی زانستی تر، کە مانای باویان هەیە، وەك : – گەلڤاندن، الجلفنة، Galvanization.

یان زانستە ناوە وەرگرتەکان وەك : – ترانزیستۆر، ترانزستەر، Transistor، هەروەها هەندێ پێوانەی بیانی، وەك : پاوەند ( Pound )، نەك رەتل، ئۆنس ( Ounce)، نەك مۆقە))[2].

١١- نابێ لەزاراوە سازیدا مەرجی زۆر قورس و تەسك و ترووسك بسەپێندرێت بەسەر دەقی زاراوەدا کە بۆ خنکان دەست بدات، نەك ڕزگاربوون و بەرەو پێشەوە بردنی زاراوەی کوردی، بەبۆچوونی ئێمە گرنگترین مەرج لە زاراوەی نوێباودا، ئەوەیە کە بتوانێت بروات و لەلایەن قسەپێکەرانەوە پەسەند بکرێت.

---

(١) جەمال عەبدول ،بەرکولیێکی زانستە زاراوەسازیی کوردی ،ل ٦٠.

(٢) سەرچاوەی پێشوو، ل٦٣.

١٢-(( پێڕەو کردنی بنەما بریار دراوەکان، لە بەکارهێنانی چاوگی دەستکردردا بۆ دەربڕینی ئەو بارەی وەسفێکی تایبەتی دەبێت، ئەگەر ناوەکە لەزمانی ئینگلیزیدا بە پاشگری ( tivity ) و هەندێ جاریش بەپاشگری ( ity- ) کۆتایی هاتبێ، وەك گەیێنێتی المولیه Conductivity ))[1].

١٣-هاوکاری و هاوئاهەنگی لەنێوان زانکۆ و دەزگا زانستی و ڕوناکبیرییەکانی کوردستاندا، بە پێکهێنانی چەند لێژنەیەکی هاوبەش، کە ببێتە هۆی پێکەوە بەستنی هەموویان، پێش بریار لەسەر دانی هیچ زاراوەیەك.

١٤-پێویستە بریارێکی سیاسی، یان کارگێری و دەزگایەکی باڵای زانستی هەبێت، تاوەکو بەکارهێنانی هەر زاراوەیەکی زانستی پەسەندکراو بسەپێندرێت لەهەموو دەزگا فێرکاری و تەکنیکی و کارگێڕییەکانی سەرانسەری کوردستاندا.

١٥-پێویستە هەوڵی سازکردنی چینێکی وەرگێڕی ئەکادیمیی بدەین، کە دەسەڵاتی بەسەر زمانی کوردیدا بشکێت و بەپێی یاساو دەستووره زمانەوانییە کوردییەکان کار بکات و ئەو نوسینانەش کە لە زمانە بیانییەکانەوەوەردەگێردرێن بۆ زمانی کوردی لەلایەن دەزگایەکی ئەکادیمیی پسپۆڕ سەرپەرشتی بکرێن و دووربن لە هەڵە و کەم و کوڕی.

١٦- ئامادەو سازکردنی فەرهەنگی یەکگرتووی فراوان، بۆ زاراوەکانی هەر بابەتێکی زانستی کە کارو پرۆژەیەکی گرنگن و پێوستە هزرو ئامانج و نەخشەی زانستی ئاشکرای هەبێ و هەموو تایبەتمەندە پسپۆڕو شارەزاکانی بواری زانست و زمان و هونەرو فەرهەنگسازی تێدابەشداربن.

١٧- لەگەڵ ئەوەدا ئەمڕۆکە واخەریکە زاراوەسازیی کوردی جێگەی خۆی لە ژیانی ڕۆشنبیری و زانستی گەلی کورددا دەگرێت. بەڵام پێویستمان بە بابەتی نوێ هەیە ((بەتایبەتی لایەنی تیۆری)).

١٨- ( زاراوە سازی ) جگە لە ( زاراوەسازی پێوانە ) ی مامۆستا مەسعود محەمەد و چەند وتاری دی، لێرەو لەوێ یان چەند نووسراوی دوورە دەست نەبێت هیچ نوسراوی وامان نییە کە بەشێوەیەکی تیۆری ڕێڕەوێك بێت بۆ دارشتنی زاراوە. بۆ ئەوەی

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ل٦٥.

شانبەشانی پێشکەوتن و پەرەسەندنی ژیانی سیاسی و ئابووری و زانستی ئەمڕۆمان بڕوات و پێداویستیەکانی دابین بکات))[1].

١٩- بایەخ دان بەزمانی کوردی و هەوڵ دان بۆ بەرەو پێشەوە بردنی و دروست بوونی زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی و نوسین و دارشتنی کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکان لە قالبێکی کوردانە و پەیڕەوکردنی کوردی ڕەوان نوسین و دەستوری زمانەوانیی کوردی، قسەکردن لە ڕاگەیاندن و کەناڵە ئاسمانییەکان بە زمانێکی پاراو و شێوازێکی زانستیانە و دوور لە هەڵە و ئاڵۆزی و واتە بەکوردی بیرکردنەوەو بەکوردی نوسین.

٢٠- تا لەتواناداببێت زاراوەی کوردی ڕەسەن بەکاربهێندرێت، ئەگەر زاراوەی کوردی تایبەت بەو بوارە دەست نەکەوت، ئینجا پەنا ببەینە بەر بەکارهێنانی زاراوەی زمانانی دیکە، ئەوکاتەش وەرگرتنی زاراوەکە بە دیارددەیەکی ئاسایی دادەندرێت.

٢١- لە قۆناغی ئێستای زمانی کوردیدا، پێویستە زیاتر گرنگی بە بواری زاراوەسازیی بدەین، وە لەزاراوە دانادا دەستورێکی تازە پێڕەو بکەین، هەروەك چۆن زمانە پێشکەوتووەکان پێڕەوی دەکەن، بەپێی سیستەمێکی جیهانی و زانستیی، زاراوەسازی بچێتە ناو دەزگاکانی کۆمپیوتەرو تۆڕەکانی ئینتەرنێتەوە، لەگەڵ دابینکردنی هەموو پێداویستییەکی تەکنیکی و ئابووری و ڕۆشنبیری بۆ دەزگاکە و پاڵپشتکردنی لەلایەن حکومەتی هەرێمەوە.

٢٢- پەیڕەو کردنی سیستەمی نەتەوەیی لە هەڵبژاردنی زاراوەی زانستی واتە :-

١- هەوڵدان بۆ نزیککردنەوەی زاراوەی کوردی و زاراوەی جیهانی بۆ ئاسانکردن و بەراورد کردنیان لەلایەن زاناو لێکۆڵەرەوان.

٢- پشت بەستن بە پۆلینکردنی دەیانەیی جیهانی، بۆ پۆلینکردنی زاراوەکان بەپێی پۆل و لقەکانیان و بواری لێکۆڵینەوەکانیان.

٣- دابەشکردنی زاراوە بەپێی بوارە تایبەتییەکانی ( زانستی، کارگێڕی، وێژەیی، ئابووری، مێژوویی، جوگرافی.... هتد ) و ڕێکخستنیان بەپێی هەربوارێك.

---

(١) محەمەد وەسمان، بەرەو فەرهەنگی پزیشکیی یەکخراو، ل١٩.

٤– ڕەچاو کردنی بیرۆکەی پلەبەندی لە دانانی زاراوەی زانستی : –

(( أ– بەکارهێنانی واژەی عەرەبی ڕەسەن، ئەگەر وشە بیانییەکانی لێوە وەرگیرابوو، لەوەرگێڕانی زاراوەدا وشەکە لە زمانە ڕەسەنەکەیەوە وەربگرین و وەری بگێڕین بۆ سەر زمانی کوردی، نەك لەزمانی دیکەوە بۆی بچین.

ب– زیندو کردنەوەو بوژاندنەوەی زاراوە کوردییە کۆنەکان مەگەر ئێستا نەتواندرێ گوزارشتی ڕاستیی پێ بکرێت.

جـ– پەسەند کردنی واژەی کوردیی ڕەسەن، بەسەر واژەی سازکراودا، مەگەر سازکراو باوتربێت.

د– پەسەند کردنی واژەی سازکراو بەسەر نوێدا، مەگەر نوێیەکە ناسراوتر بێت ))[1].

٥– وشەیەك وربو گەیەنەر بێت لەواتادا، باشترە لەوەی واتای گشتی و لێڵ بدات.

٦– ڕێککەوتنی واتای زاراوە کوردییەکە لەگەڵ واتای زانستی زاراوە بیانییەکە، بێ خۆبەستنەوە بە واتای وشەیی و زمانی زاراوە بیانییەکە.

٧– دیاریکردنی واتای زانستی وردی هەر وشەیەك بەجیا لەگەڵ زاراوە هاوواتاکانیدا یان نزیك لە هاوواتاکانی.

٨– کوردانذنی ئەم زاراوە بیانیانە، کە کردەیەك دەردەبڕن، بەهۆی پاشگری (– اندن) وە بێت، وەك :

| | | |
|---|---|---|
| هایدرۆجیناندن | هدرجة | Hydrogenizing |
| ئۆکساندن | اکسدة | Oxidizing |

لەجیاتی ئەوەی بڵێین، ئانۆد کردن و ئۆکسید کردن.

٩– زاراوە جیهانی و ئاوێتەکان، کە لەبواری زانستیدا، لەلایەن زۆر زمانەوە وەرگرتنیان بەسەرداهاتووە، وەك ناوی توخم و ئاوێتە کیمیایی و فیزیاوییە ئاڵۆزەکان و شتی تری لەو بابەتە پێویستە بەپێی بنەمای زمانە ڕەسەنە بیانییەکەی خۆیان بە کوردییان بکەین، نەك عەرەبییەکان، چونکە زاناو زمانەوانە عەرەبەکانیش دووچاری هەندێ بۆچوونی چەوت بوون لەو بوارەدا.

١٠– ناوە بیانییەکان بگێڕدرێنەوە بۆ بنچینە کۆنەکانیان.

(١) جەمال عەبدول، بەرکولێکی زانستە زاراوەسازیی کوردی، ل٦٢.

١١-لێکۆڵینەوەو وردبوونەوە لە وشە بیانییەکان و باش تێگەیشتنی واتاکانیان، ئینجا بیرکردنەوە لە دارشتن و سازکردنی زاراوەی کوردی بەرانبەریان.

١٢-پێویستە هەموو واتایەکی زانستی و تەکنۆسازی و پیشەگەری لە هەر بارێکدا، زاراوەیەکی تایبەتی هەبێ.

١٣- وشەی ڕەوان و خۆشئاواز و بەگوێ ئاشنا پەسەند بکرێت بەسەر وشەی ئاڵۆز و قورس و لەبەر دڵ و گوێ گران.

١٤-وشەی باو و ڕەوان پەسەندترە لە وشەی دەگمەن و نامۆ، مەگەر لەگەڵ زانستە واتاکەی تێکەڵ ببێت.

هەروەها پێویستە : -

ئامانج و بنەماکانی زاراوەسازی ڕوون بن و پەیوەندییە زانستی و زمانییەکان بە زاراوەکانی کیمیا و فیزیا و بایۆلۆجی و زاراوە پزیشکییەکان و زانستە سروشتییەکانی ترەوە ڕەچاوکرابن.

- کێشەی پێشگرو پاشگرە بیانییەکان یەکلابکرێتەوەو هەوڵ بدرێت بکرێن بە کوردی.

بەوێنە ( مامۆستا جەمال عەبدول ) لەم بارەیەوە هەوڵی ئەوەی داوە پێشگر و پاشگرەکانی زمانی ئینگلیزی بکات بە کوردی و نموونەی بۆ هێناونەتەوە، وەك : -

(( پێشگرێکە، بەواتا anti -

١- دژی " بەرهەڵستی antislavery واتە دژە تەنەکی.

٢- دژە فرۆکە anti aircraft

٣- دوژمن، درۆزن " ساختە antichrist دژە مەسیح.

٤- پێچەوانە " ئاوەژو anticlimax، دژە کتوپڕ دابەزین.

٥- نا، antilogical دژە ژیربێژی.

پاشگرێکە، بەواتا : - ate

١- پەیوەندیدار بە Collegiate واتە کۆلێژی.

٢- خاوەن " جیاکراوە بە brancheate واتی ریشودار.

٣- هاوشێوەی stellate واتە ئەستێرەیی.

٤- دەبێتە    maturate واتە پێگەییو.

٥- وای لێ دەکات    activate  واتە چالاك دەکات.

٦- نوێ دەکاتەوە    ulcerate واتە کێم دەکات.

٧- دەیداتێ    capacitate واتە دەسەڵاتی دەداتێ.

٨- تێکەڵ دەکات، چارەی دەکات بە    Camphorate واتە تێرە کافوری دەکات. ))[1].

---

(١) جەمال عەبدول، بەرکوڵێکی زانستە زاراوەسازیی کوردی،ل٩٧ – ٩٩.

# مەرجەکانی زاراوە دانان - زاراوەساز

بێگومان دانانی زاراوە کارێکی بێ گیروگرفت و تەنگ و چەڵەمە نییە، چەندین ڕێساو دەستوور هەیە، کە پێویستە زاراوەساز بیانگرێتە بەر، وەك : -

١- دەبێ ئەو کەسەی زاراوەی نوێباوی کوردی دادەنێت، پسپۆڕبێت لەو بوارەو لە بابەتی زاراوەکەدا، شارەزایی هەبێت، واتە ئەوەی زاراوەی پزیشکی دادەنێت، دەبێ پزیشك بێت و لەو بوارەدا بەئەزموون و زانابێت.

٢- دەبێ، شارەزاو هۆگری زمانی کوردی و خاوەن چێژو سەلیقەی زمانی نەتەوایەتی بێت، لەو زمانەیشدا، کە دەیەوێت زاراوەی کوردی بەرانبەر بەزاراوەکانی ساز بکات، تەواو شارەزا بێت.

٣- دەبێ، جگە لە دەستوورو ڕێزمانی کوردی، شارەزای دەستورو ڕێزمانی چەند زمانێکی دیکەش بێت.

٤- زاراوە ساز دەبێ، شارەزایی هەبێ لەبارەی هەموو زارو شێوە زارەکانی زمانی کوردی و بابەتی فۆلکلۆرو پەندی پێشینان و چەند بوارێکی دیکەش.

٥- دەبێ زاراوە ساز شارەزایی هەبێ لە زانستی زمان، سروشتی مۆرفیمەکانی زمان بناسێت و ئەو دەستورو یاسایانەش بزانێت کە بە هۆیانەوە مۆرفیمەکانی پێ لێك دەدرێت بۆ دروستکردنی وشە.

٦- زاراوە دانان، پێویستی بەزانستی فەرهەنگسازی هەیە، هەروەها پێویستی بە شارەزابوون لە زانستی زمان و دەنگسازی و هەموو لقەکانی دیکەی زانستی زمان هەیە.

٧- پێویستە زاراوەساز ڕوناکبیرێکی کارامەبێ، دووربێ لە دەمارگیریی و بیرو باوەڕی خۆسەپاندن و بەرژەوەندی زمانی کوردی بخاتە پێش بەرژەوەندی کەسی و ناوچەگەریی.

٨- زاراوەساز لەکاتی دانانی زاراوەدا، نابێ زاراوەی ناوچەیی و شێوەزاری خۆی بسەپێنێت بەسەر زاراوەی ئەدەبیدا، واتە لەکاتێك دا زاراوەی (دوانە) هەبێت، نابێ زاراوەی (جوامرانە) بەکاربهێنێت.

# زمانی ستاندارد

زمان دیاردەیەکی نەتەوەییە، کە گشت ئەندامانی نەتەوەیەك، بەبێ جیاوازی بیرو باوەڕو ئاین و ڕادەی ڕۆشنبیری و پلەی چینایەتی بەکاری دەهێنن. بەلاّم دیالێکت ((شێوەی قسەکردنی کۆمەڵە کەسێکە لەناو زمانی نەتەوەیەك، بەهۆی هەندێ هۆکاری وەکو جوگرافی و کۆمەلاّیەتی و ڕۆشنبیری دروست دەبێت، هەر زمانێك ژمارەیەك دیالێکتی هەیە، کە بەچەند تایبتییەکی وەکو وشەسازی و دەنگ و ڕستەسازی جیادەکرێتەوە)).[1]

زمانی کوردی قاڵبوەوەی سالاّنێکی دوور و درێژی مێژووی گەلی کوردە ئەنجامی گۆڕان و پێشکەوتنی ژیانی مرۆڤی کوردە.

گومانی تێدانییە، کە زمانی کوردی بەهەموو دیالێکت و بەشە دیالێکتەکانیەوە زمانێکی یەکگرتووە (( فیلۆلۆژەکانی هەموو جیهان ئێستا لەسەر ئەو باوەڕەن کە یەك بوونی سێ شت لەچەند دیالێکتێکی زماندا، ئەو زمانە دەکات بە زمانێکی یەکگرتوو ئەم سێ شتەش ئەمانەن :

١- گراماتیکی زمان.

٢- فۆنەتیك.

٣- بنەڕەتی فەرهەنگی زمان ))[2].

هەندێ لە زاناکان، بەتایبەتی بێگانەکان کە دێنە سەر باسی زمانی کوردی و دیالێکتەکانی تەنیا لە دیمەنی جیاوازی نێوان دیالێکتەکان دەدوێن، بەلاّم لێکۆڵینەوەی وردی هەندێ زانا ئەوە دەسەلمێنێ کە زمانی کوردی یەك زمانە. (( کاتێ کە ئەم باسە دەچێتە قاڵبی لێکۆڵینەوەی زانستی فراوانەوە ئەوە دەسەلمێنن کە گراماتیك و فۆنەتیك و بنەڕەتی فەرهەنگی هەموو دیالێکتەکانی زمانی کوردی یەکن، ئەو وردە جیاوازییە کەهەیە، هەر ئەوەیە کە لە دیالێکتی هەموو زمانەکانی جیهاندا بەزیادەوە هەیە. ئەمە ڕای گەلیش لەولاوە بوەستێ، کە لە هەرکوردێك بپرسی : لە هەولێر یا ماردین یا کرماشان یا هەورامان کە ئەو زمانەی پێی ئەدوێی چی یە؟

نالێ - سۆرانی یا کرمانجی یا لوڕی یا گۆرانی ( هەورامی ) بەڵکو ئەڵێ کوردی.

---

(١) د. محمد علي الخولي، معجم علم اللغة النظري، ل٧٣.

(٢) د. عیزەدین مستەفا رەسولّ، سەرەنجێ لە زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو، ل١٠

بەم شێوەیە بۆمان دەردەکەوێت، کە زمانی یەکگرتوومان هەیە لە چوار دیالێکتی سەرەکی:-

( کرمانجی خواروو، کرمانجی ژووروو، دیالێکتی لوڕ، دیالێکتی گۆران ) و چەند بەشە دیالێکتێك پێکهاتووە.

ئەم دیالێکتانە نە یەکدەگرن و نە دەبێ یەکبگرن و نە یەکنەگرتنیان دەبێتە بەڵگەی نەبوونی زمانی یەکگرتووی کوردی. بەڵکو مانەوەو گەشەسەندنیان زمانە یەکگرتووەکەمان و زمانی ئەدەبیی یەکگرتوومان دەوڵەمەند ئەکات)).[1] هەریەکە لەو دیالێکتانە بەشێکە لە زمانی نەتەوەیی کوردو لە ڕێگای دەستورو بنەما زمانەوانییەکان فۆنەتیکی و وشەسازیو ڕستەسازییەوە، خۆی لەگەڵ ئەو زمانە یەك دەخات دەکات.

(( هیچ گەلێك نی یە لەم جیهانە دا، تێکرای کۆمەڵانی خەڵکەکەی بەیەك زمانی یەکگرتوو بدوێن، لەبەر ئەوە بوونی چەند شێوەیەك لە زمانی کوردی دا شتێکی سەیرنی یە، بەڵام ئەوەی خەڵك هەیەتی و ئێمە نیمانە زمانێکی یەکگرتووە بۆ خوێندن و نووسین و کاروباری گشتی)) [2].

مەبەست لە زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو (( ئەم زمانە پێوانەییە یەك گرتوەیە کە ڕۆڵەکانی گەلی کورد لە نوسین و خوێندن و بوارەجیاجیاکانی ئەدەب و زانستدا بەکاری دێنن. زمانی کوردی بەهەموو دیالێکتەکانیەوە : کرمانجی سەروو، کرمانجی خواروو، گۆرانی، لوڕی. زازایی و بەشە دیالێکتەکانیان کەرەستەی ئەم زمانە پێوانەییەن)).[3]

واتا زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو بەو زمانە دەووترێت، (( کە لە زمانی یەکگرتووەو بە هەموو دیالێکتەکانیاوە وەرئەگیرێت، یان بناغەکەی لە یەکێك لە دیالێکتەکانەوە وەرئەگیرێت و زۆرجار پوختەکراوێکی زمانە یەکگرتووە کەیە یا دیالێکتێکی پەتی، یا بڵێین پوختەکراوێکی زمانی قسەکردنە، ئەم زمانە دەبێتە زمانی نووسین و خوێندنەوەو ئەدەبیات پشت بە هەموو سەرچاوەکانی بەرەو پێشچوون و دەوڵەمەند بوونی زمان، دەوڵەمەند دەبێت و بەرەوپێش دەڕوات، زمانی یەکگرتوو دیالێکتەکانی زمان و ئەدەبی فۆلکلۆری

(١) سەرچاوەی پێشوو ،ل١١ – ١٢

(٢) جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی، ل٧.

(٣) محەمەد وەسمان، چەند لاپەڕەیەکی ڕۆژنامە نووسی، ل١٢١.

نەتەوەو زمانی نەتەوە دراوسێکان و ئیستیلاحی زانستی جیهانی گەورەترین سەرچاوەی ئەو دەوڵەمەند بوونەن )).[1]

ئەگەر زمانی یەکگرتوو، لای زۆربەی نەتەوەکانی جیهان، کۆکردنەوەی تایبەتمەندییە لە یەکچووەکانی هەموو دیالێکتەکانی ئەو زمانە بێت، ئەوا زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو – لە پاڵ تایبەتمەندییە یەکگرتووەکانی هەموو زمانەکەدا، زۆر لە تایبەتمەندیی یەکێ لە دیالێکتەکانی زمانیشی تێدایە.

لەبەر ئەوەی – زمانی ئەدەبی یەکگرتوو – لای زۆربەی نەتەوەکانی جیهان، لەبەر هۆیەك لە یەکێ لە ناوچەکانی وڵاتدا دروست دەبێت، لەبەر ئەوە زۆر لە تایبەتمەندییەکانی ئەو ناوچەیەی تێدایە، ئەو زمانە ئەدەبییە یەکگرتووە ئەوسا لەگەڵ دیالێکتەکانی زماندا بەیەکدادەچێت و جۆرە تێکەڵبوون (تفاعل ) ێك لە نێوانیاندا پێك دێت.

لای کورد، کۆنترین دیالێکت کە هەلی ئەوەی بۆ هاتبێتە پێشەوە ببێتە زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو دیالێکتی لوڕە، کە کۆنترین دیالێکتی کوردییە شیعری پێ نووسرابێتەوە دواتر کرمانجی ژووروو بە تایبەتی بەشە دیالێکتی ( بۆتان )، ڕۆژگارێك زمانی یەکگرتووی ڕۆشنبیری سەردەمی خۆی بوو، لەدواییدا دیالێکتی گۆرانی بەتایبەتی بەشە دیالێکتی هەورامی بوو بەزمانی یەکگرتوو، تا دامەزراندنی شاری سلێمانی و میرنشینی بابان ئەم بەشە دیالێکتە ڕۆڵی زمانی پێوانەیی کەوتە ئەستۆ، وشە و زاراوەی دیالێکت و بەشە دیالێکتەکانی دیکە تێکەڵ بووە ئەمڕۆ ڕۆڵێکی بەرچاو دەبینێت.

بەڵام هیچ کامێك لەو دیالێکتانە، نەیانتوانیوە ببن بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو، بۆ هەموو کورد، ئێمەی کورد، تاوەکو ئێستا زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتووی نووسین و خوێندنەوەمان نییە، لەبەر ئەوەی ئەو تەجروبەیەی کە بۆ دروست بوونی زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی پێویستە، تا ئێستا بۆ گەلی کورد نەهاتۆتە پێشەوە، وەك :–

(( ١– نەبوونی ئاینێکی کوردانەی گشتی.

٢– نەبوونی ئەدەبیاتێکی فراوان بەتەنیا شێوەیەکی کوردی.

٣– نا لەباری ژینی کۆمەڵایەتی.

---

(١) د. عیزەدین مستەفا رەسوڵ، بۆ زمان، ل٩٢.

٤- هەولّدانێکی زانستانەی لەسەرخۆ بۆ بەرهەمهێنانی زمانێکی ئەدەبیی )).[1]

هەروەکو پێشتر باسمان کرد، کورد هیچ کاتێك، خاوەنی دەوڵەت و قەوارەیەکی سیاسی یەکگرتوو نەبووە، بەڵکو هەموو کات پارچەپارچە بووەو هەر ناوچەو خێڵ و هۆزێك دەستەلاتدارییەکی سنورداری خۆی هەبووە، (( هەر میرنشینێك زمانی ئەو ناوچەیەی خۆی بۆ بووە بە زمانی نوسین و ئەدەبی میرنشینەکە. لە میرنشینی ئەردەلاندا زاراوەی گۆرانی ( شێوەی هەورامی )، لە میرنشینی بۆتاندا زاراوەی جزیرە، لە میرنشینی باباندا زاراوەی سلێمانی زاڵ بووە. ئاین و ئاینزا لە یەکخستنی نەتەوەو زمانی نەتەوەدا تاڕادەیەك دەورێکی لەبەر چاو دەبینن، کورد هەروەك کتێبێکی ئایینی پیرۆزی – بۆ هەموو کورد – نەبووە، دەرفەتی ئەوەشی لەبەر پەرت و بڵاوی – بۆ نەڕخساوە کە کتێبی مەسحەفی ڕەش، جەلوە یا سەرەنجام، بۆ ببێتە بناغەی زمانێك بۆ هەموو کورد ))[2]. تاوەکو ئێستا، نوسەرێکی وامەزن دەرنەکەوتووە، کە بەهۆی شاکارێکی ئەدەبییەوە، بتوانێ زمانێکی ستاندارد دابمەزرێنێ.

هەروەك چۆن لە مێژووی گەلاندا، چەندین نموونەی لەو بابەتە دەبینین، بەوێنە: (دانتی)ی هونەرمەند، کە لە سەدەی چواردەیەمدا ژیاوە. یەکێ لەو نووسەرە بلیمەتانەی (ئیتالّیا) بووە، (( لەسەدەی یازدەدا ( دانتی ) توانی، بەهۆی بەرهەمی (کۆمیدیای یەزدانی) یەوە، ( بنکەیەکی پتەوی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی ئیتالّی پێکبێنێ ) )).[3]

لای کورد، هەموو ئەو تەجروبانەی کە بەرەو دروست بوونی زمانێکی ئەدەبیی هەنگاویان ناوە، لەبەر ئەو هۆکارانەی باسمان کرد، پووچەڵ بوونەتەوەو سەریاننەگرتووە بەوێنە: (( ئەگەر هاتباو ئەو زاراوەیەی کە مەلای جزیری و ئەحمەدی خانی پێیان دەنووسی، ببوایە بە زمانی هەموو کورد ئەوا ئێستا زاری کرمانجی ژووروو دەبووە زمانی یەکگرتووی کورد. ئەگەر هاتباو ئەو زاراوەی کە نالی پێی دەنووسی، ببوایە بە زمانی هەموو کورد ئەوا ئێستا زاراوەی کرمانجی خواروو دەبووە زمانی یەکگرتووی کورد، وە ئەگەر ئەو

---

(١) جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی، ل١٢.

(٢) ئەمجەد شاکەلی، زمانی یەکگرتووی کوردی، گەلّێك لە دەولّەتی کوردی، پێویستترە، گۆڤاری نەوشەفەق، ژ(٢)،ل٦١.

(٣) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، ڕێنیسانس،ل ٩٦.

زاراوەی کە مەولەوی پێی دەنووسی ببوایە بە زمانی هەموو کورد ئەوا ئێستا زاری گۆران ( هەورامی ) دەبووە زمانی یەکگرتووی کورد.

وە ئەگەر هاتباو تەریقەتی – مەولانا خالیدی نەقشبەندی هەموو کوردستانی گرتباوە، ئەوا ئێستا ئەو زارەی کە مەولانا خالید پێی دەنووسی دەبووە زمانی یەکگرتووی کورد. ئەگەر هاتباو هەموو کورد یارسان بوونایە، لەوانە بوو زاری گۆرانی ببێتە زمانی یەکگرتوی کورد)).[1] وە ئەگەر هەموو کوردستان خاوەنی یەك دەسەڵاتی سیاسی یەکگرتوو بونایە لەوانە بوو، ئەو دیالێکتەی کە دەبووە مەرکەزی دەسەڵات، ببوایە بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو بۆ هەموو کورد.

نەبوونی زمانێکی ستاندارد، گەلێك کێشەی بۆ زمانی کورد دروست کردووە (( هەر نوسەرێ بە ئارەزووی خۆی دەنووسێ، لەسەر دەستورێکی زمانی یەکگرتوو بەڕێوە ناڕۆن. ئەمەش بەوە پاساو دەدەن و دەڵێن : – لەبەر ئەوەی، زمانێکی ستاندارمان نییە، بۆیە، ئەو دەستوری نووسینە پێڕەو دەکەن، کە خۆیان باوەڕیان پێی هەیە)) [2].

لەبەر ئەوەی قالبێکی یەکگرتووی ڕێنووس و داڕشتنمان نییە و ئەلفو بێیەکی یەکگرتوومان نییە لەسەر تاسەری کوردستان (( نووسەری کوردی وا هەن، گەر لە رووی ڕێنووس و داڕشتنەوە، بەرهەمەکانیان هەڵسەنگێنین، ئەوا دەبێ، سەرلەنوێ هەموویان دابرێژینەوە. بە شێوەیەکی ڕێك و پێك، لەسەر بنچینەیەکی زانستانەی دەستووری زمان بیاننوسینەوە )).[3]

ئەو زمانە ئەدەبییەی ئێستا بووە بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی ناوچەیەکی فراوانی کوردستان و لە بەشێکی گەورەی هەردوو پارچەکەی رۆژهەلات و باشوری کوردستان پێی دەنووسرێ و دەخوێندرێ و زمانی ئەدەبیاتە، شێوە نوسینێکی یەکگرتووی کوردییە کە کرمانجی خواروو (( سنە، سلێمانی، سۆران، موکریان ) و نوسەرانی کوردی ( گۆران ) و هەندێ نوسەری کوردی لوڕ بەکاری دەهێنن)) [4].

---

(١) ئەمجەد شاکەلی، زمانی یەکگرتووی کوردی، گەلێك لە دەوڵەتی کوردی، پێویستترە،ل ٦٢.

(٢) حوسێن محەمەد عەزیز، سەلیقەی زمانەوانیی و گرفتەکانی زمانی کوردی،ل ٣٨٩.

(٣) سەرچاوەی پێشوو،ل ٣٩٣.

(٤) د. عیزەدین مستەفا رەسوڵ، بۆ زمان،ل ١١٣.

ئەگەر هەوڵی زانستانەی بۆ بدرێ ڕەنگە بەرەو ئاسۆیەکی ڕوون هەنگاو هەڵهێنێ. بەڵام دەبێ چەند ڕاستییەك لەبەرچاو بگیرێت : –

١– ئەم شێوە ئەدەبیەی ئەمڕۆ لە کرمانجی خواروو بەکاردێت، بناغەکەی شاری سلێمانی یە.

٢– ( بەو پێیە ڕەگەزی سلێمانی زۆر تێدایە و ڕەگەزی بەشە دیالێکتەکانی دیکەی تێکەڵبووە، بەڵام دەبێت ئەوەمان لەبەرچاو بێت کە کرمانجی خواروو بەشی (سۆران – موکریان) ناوەڕاستترە لە نێوان (سلێمانی – سنە)و کرمانجی ژووروودا ئەمەش جێگەی بەرچاو گرتن و سوود بینینە ))[١].

نابێ بەهیچ جۆرێك بەم شێوە ئەدەبییە بڵێین شێوەی سلێمانی، چونکە ڕاستە بەشە دیالێکتی سلێمانی لەسەردەمی بابانەکانەوە بناغەیە بۆ زمانی ستاندەرەکە، بەڵام بە تێپەڕ بوونی کات دوچاری زۆر گۆڕان بووە و وشەو زاراوەی دیالێکت و بەشە دیالێکتەکانی دیکەی تێکەڵبووە.

هەرچەندە ئەم شێوە ئەدەبییە ڕواڵەتی شێوەزاری سلێمانی هەر پێوەدیارە، بەڵام لەگەڵ قسەکردنی ناو ماڵ و خەڵکی ناوچەکە جیاوازی هەیە.

هەندێ بنەڕەتی گراماتیکی شیوە زارەکانی دیکەش جێ ی خۆی تێدا کردۆتەوە، هەندێ دیاردە کە تایبەتە بە شێوە زاری ناوچەی سلێمانی نابێ بسەپێندرێت بەسەر زمانی ئەدەبیی، وەك : –

(( لەناوچوونی دەنگی [ د ] بە شێوەیەکی فراوان لە شێوە زاری سلێمانی دا بەرچاو دەکەوێت، ئارەزووی فڕێ دانی ئەم دەنگە دەکات لەچەند بیئەیکی جیاواز بۆ ئاسانی و سوکی دەربڕین))[٢]., وەك : –

١– لەسەرەتادا : – دێت – یَت

---

(١) سەرچاوەی پێشوو،ل ١٥٨ – ١٥٩.

(٢) تالیب حوسێن عەلی، فۆنۆلۆجی و دیاردەی ئاسان بوونی فۆنیمەکان لە شێوە زاری سلێمانی،ل ٧٣.

هەر بە هۆی ئەم دیاردەیە دەنگی [ د ] لە ئەسپێکتی بەردەوامی ڕانەبردوو لە ناودەچێت و قاڵبی ( دە ) دەبێتە ( ئە ) [١].

دەچم – ئەچم

٢– لە ناوەڕاستی وشە، دەنگی [ د ] لەناو دەچێت و دەگۆڕێت بە دەنگی (یـ) وەك:–

(( زیاد کردن – زیاکردن )) [٢]

لە ژمارەکانی ( یازدە، دوازدە، سێزدە، پازدە، شازدە، حەڤدە، نۆزدە ) دەنگی [ د ] لەناودەچێت و دەبێتە : – ( یانزە، دوانزە، سیانزە، پانزە، حەڤڤە، نۆزە ).

٣– لە دەستەواژەدا : – ئەوەندەم زانی – ئەوەنەم زانی.

٤– لە کۆتایی وشەدا : – مەحمود – مەحمو

هەندێ جار دەنگی [ د ] دەگۆڕێ بە دەنگێکی دیکە : –

بەقەد – بەقەی        بادان – بایان

دەربەند – دەربەنگ        بادەم – بایەم [٣].

دەنگی [ د ] کە بەدوای دەنگی [ ن ] دادێت لەشێوەی سلێمانیدا دەبێتە [ گ ] :–

مەند – مەنگ

ئەفەندی – ئەفەنگی

(( لە شێوەی سلێمانی هەندێ جار مۆرفیمی ( – ەوانێ ) لە ئاخاوتندا بەکاردەهێندرێ بەمەش چەند دەنگێك دەبێ بەسەر بار، بێ ئەوەی هیچ پاساوێك هەبێ وزەی زیاد سەرف دەکەین ئەم مۆرفیمە ڕوخساری فیزیایی هەیە، کەچی واتای نی یە، هەمووکاتێك دەتوانرێ ئەم مۆرفیمە لابدرێت بەبێ ئەوەی واتای ڕستەکە بگۆڕێت : –

شاناز ڕۆیشتەوە – شاناز ڕۆیشتەوانێ.

لەلایەکی دیکەوە ئەم مۆرفیمە هەر تایبەت نییە بە ڕێژەی کار، چونکە دەلکێت بە هەموو ئەو پاشگرە ڕێزمانیانەی کە پاشگری ( ەوە ) هەڵدەگرن : –

دەرەوە – دەرەوانێ

---

(١) توفیق وەهبی، ئەسڵی پیتە قاڵبی ((ئە))ی شێوەی سلێمانی،ل ٢١.

(٢) دلبەر ئیبراهیم فەرەج، یاسادەنگیەکانی زمانی کوردی،ل ٦٦.

(٣) سەرچاوەی پێشوو،ل ٩١.

ژووره‌وه – ژووره‌وانێ ))[1].

خاڵی دووه‌م که‌ پێویسته‌ ئاماژه‌ی پێ بکه‌ین ئه‌وه‌یه‌ : –

ئه‌و زمانه‌ ئه‌ده‌بییه‌ هێشتا نه‌بووه‌ به‌ زمانی ئه‌ده‌بیی یه‌کگرتووی هه‌موو نه‌ته‌وه‌ی کورد، ئه‌م شێوه‌ ئه‌ده‌بییه‌ هێشتا نه‌بووه‌ به‌ شێوه‌ی نووسینی ئه‌و کوردانه‌ی که‌ به‌ کرمانجی ژووروو ده‌دوێن که‌ ئه‌مانه‌ له‌رووی ژماره‌وه‌ به‌شی زۆرترینی کوردن. ئه‌و کوردانه‌ی به‌ دیالێکتی کرمانجی ژووروو ده‌په‌یڤن نه‌ك هه‌ر زمانێکی یه‌کگرتوویان نییه‌، به‌ڵکو به‌ ئه‌لف‌و بێیه‌کی یه‌کگرتووش نانوسن، هه‌ندێکیان به‌ پیتی لاتینی و هه‌ندێکی دیکه‌یان به‌پیتی عه‌ره‌بیی ده‌نووسن، تا ئێسته‌، له‌ نێو خۆیاندا، له‌سه‌ر شێوه‌ زمانێکی تایبه‌تی رێکنه‌که‌وتوون و به‌ته‌واوی ره‌گی دانه‌کوتاوه‌.

به‌ڵام له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا ناتوانین، بڵێین ئێستا نه‌ته‌وه‌ی کورد دوو شێوه‌ی ئه‌ده‌بیی یه‌کگرتووی هه‌یه‌.

(( چونکه‌ ئه‌م زمانه‌ له‌ ده‌وری میرنشینی بابانه‌وه‌ تا ئێستا زمانی ئه‌ده‌بی ناوچه‌یه‌کی گه‌وره‌ی کوردستانه‌و له‌ ساڵی ( ۱۹۲۲ ) ه‌وه‌ تا ئێستا زمانی خوێندن و نووسینی به‌شی زۆری ئه‌و ناوچه‌یه‌یه‌، شێوه‌ زمانێکی تر نابینین به‌و شێوه‌ فراوانی یه‌و به‌و به‌رده‌وامی به‌ زمانی ئه‌ده‌بیات بێت و له‌هیچ شوێنێکی تری کوردستان به‌ کوردی نوسین نی یه‌و زمانی کوردی به‌ره‌سمی نه‌ناسراوه‌، تا شێوه‌یه‌کی تری له‌ به‌رامبه‌ر ببێته‌ زمانی یه‌کگرتووی ناوچه‌یه‌کی ته‌سکیشدابێت.

هه‌رچه‌نده‌ هه‌ندێ شاعیرو نوسه‌ری ناوچه‌ی ( بادینان ) یش ئێستا هه‌وڵی ئه‌وه‌ ده‌ده‌ن که‌ به‌ به‌شی بادینانی کرمانجی ژووروو بنووسن به‌ڵام ئه‌و چه‌ند نووسینه‌ی ئه‌و به‌شه‌ ئه‌و شێوه‌یه‌ی نه‌کردووه‌ به‌ زمانی ئه‌ده‌بیی نه‌ك له‌ کوردستانی عێراقدا ته‌نانه‌ت له‌بادینانیش چونکه‌ ئه‌و شێوه‌ تا ئێستا نه‌بووه‌ به‌ زمانی ره‌سمی ده‌وڵه‌ت و زمانی خوێندن و نووسین))[2].

سه‌ره‌رای ئه‌مه‌ش دوو شێوه‌ به‌کارهێنان له‌ کوردستانی عێراقدا تا بلۆی چه‌ند ساڵێکی دیکه‌مان به‌م جۆره‌ ده‌بێ :

---

(۱) شێرکۆ بابان، رێزمانی پاشگری دووپاتیی (( ه‌وه‌ ))،ل ۲۳.

(۲) د. عیزه‌دین مسته‌فا ره‌سول، بۆ زمان،ل ۱۱۵ – ۱۱۸.

دوو ئێستگە، دوو تەلەفزیۆن، دوو چەشنە گۆڤارو ڕۆژنامە، دوو چەشنە قوتابخانە لە هەموو دام ودەزگا پەیوەستی دارەکانی کوردستان و تەرجومانێك بۆ کوردی بە کوردی، زمانە یەکگرتووەکەش دەبێ بە دوو زمان و نەتەوەی کورد، بنچینەیەکی پەیدابوون و بوونە نەتەوەیی خۆی لەدەست دەدات و دەبێ بەدوو نەتەوە.

## لە ئەنجامدا، دەگەینە چەند ڕاستییەك : -

لەزمانی ئەدەبی یەکگرتوودا، هەرچەندە شێوەیەك دیمەنی لەوانی دیکە زیاتر بەزمانی ئەدەبیی یەکگرتووەوە دیاردەبێ، بەڵام ئەو زمانە زۆر ڕەگەزی تێکەڵی شێوەکانی ئێستای تێدادەبێ. واتە لەهەر شێوەیەك شتێك خۆی لەو زمانە دا دەچەسپێنێ. پەیڕەوە گشتییەکانی گراماتیك، خۆیان لە زمانی ئەدەبیدا جێگیر دەکەن.

دروست بوونی زمانی ئەدەبیی و بەکارهێنانی لە نوسین و خوێندندا مانای ئەوەنییە دیالێکتەکانی کوردی یەك بخەین و هەموویان بکەین بەیەك دیالێکتی یەکگرتوو، چونکە بوونی دیلێکت و بەشە دیالێکت لە هەموو زمانێکی زیندوودا هەیەو دیاردەیەکی ئاساییە.

(( ڕێگە بدرێت بەهەموو شێوە زارەکانی زمانی کوردی کەوا باشترین خۆراکیان پێش کەش بەزمانە ئەدەبی یەکەمان بکەن. بەبێ ئەوەی شیرازەی تێك بدەن بۆ ئەوەی هەم فەرهەنگی زمانەکەمان فراوان بکەین، هەم دەسەڵاتی دەربڕینی ئەدەبیمان، هەوڵ بدرێت ئەو بناغەیەتێکەڵ بە شێوە زارەکانی تری کوردی بکرێت ))[1]. بەتایبەتی کرمانجی ژووروو، (( ئەو شێوەیەی ئەمڕۆ لە کوردستانی عێراق بۆ نووسین بەکاردێت، پێویستە لە سنووری دەسەڵات لە شێوەی کرمانجی ژووروو نزیك بکرێتەوە، لەهەمان کاتدا بەهەردوو شێوەکەی تر پاراو بکرێت و بە وشەو زاراوەکانیان دەوڵەمەندبکرێن ))[2]. پێویستە هەردوو شێوە سەرەکییەکە بخرێنە ژێر تیشکی لێکۆڵینەوەی زانستی یەوە لە ڕووی ڕێزمان و وشە ڕۆنان و زاراوە سازییەوە.

لایەنی وێکچوون و جیاوازییان نیشان بدرێت، دیارترین جیاوازی لە نێوان ئەم دوو دیالێکتەدا لە دۆخی خستنەپاڵ و جێ ناوەکان و مۆرفیمی نێرو مێ دا دەردەکەوێت.

---

(١) مەسعود محەمەد، ڕێنووسی کوردی،گۆڤاری کۆڕی زانیاری، ل ٢٤٧ – ٢٤٨.

(٢) جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی،ل ٢٣.

زمانی یەکگرتووی کوردی، بەوە دروست نابێ،ئەگەر وشەیەك لە کرمانجی خوارووودا چەسپابێ، ئێمە هەمان وشە لە دیالێکتێکی دیکەدا وەرگرین و لە نوسینەکانماندا تێهەڵکێشی کەین وەك هەندێ نوسەر (( لەبڕی (( نزیك – نێزیك. خراپتر – خراتر. جنێو – جوێن – جمێن – جون. )) دەنووسن. بەڵکو دەبێ، لە دیالێکتەکانی دیکەدا، بە دوای ئەو ووشە کوردییە پەتییە پوختە ڕەسەنانەدا بگەڕێین، کە لەبەشە دیالێکتی کرمانجی خوارووودا نین، پاشان بەکاریانبێنین، بڵاویانکەینەوە، بیانچەسپێنین و کەڵکیان لێ وەرگرین. تا لە لایەکە زمانەکەمان بەوشەی کوردی ڕەسەن دەوڵەمەند کەین. لەلایەکی دیکەشەوە، زمانێکی تێکەڵاوی چێشتی مجێور ئاسا دروست نەکەین و سەر لە خەڵکی تێك نەدەین )).[١]

---

(١) حوسێن محەمەد عەزیز، سەلیقەی زمانەوانی و گرفتەکانی زمانی کوردی،ل ٢٩٨.

هەروەها پێویستە ئەم لایەنانەی خوارەوە لە بەرچاو بگیرێت : –

أ– لە کوردستانی عێراق، لە هەولێر و سلێمانی ژمارەیەکی زۆر ڕۆژنامە و گۆڤار بەزاری کرمانجی خواروو یان تێکەڵ لەگەڵ کرمانجی ژووروودا بە پیتی عەرەبی دەردەچن. لە دهۆکیش ژمارەیەکی زۆر ڕۆژنامەو گۆڤار بە زاری کرمانجی ژووروو بە پیتی عەرەبی دەردەچن، لەم دواییەشدا لە دهۆك دەست کراوە بە دەرکردنی گۆڤارێك بەناوی Dicle بە زاری کرمانجی ژووروو، بەپیتی لاتینی.

ب– لە سوید لەبواری خوێندنی زمانی کوردیدا لە فێرگەو خوێندنگاکاندا، بێجگە لەوەی کە کرمانجی ژووروو، کرمانجی خواروو لەیەك جودا کراونەتەوە. کە کارگێری خوێندن داوای مامۆستادەکات، دەنوسێ پێویستمان بە مامۆستای سۆرانی یان کرمانجییە. کارگێڕی وەرگێران و بیانییانیش کە داوای وەرگێڕ دەکەن بەهەمان شێوە داوادەکەن و جیای دەکەنەوە، لە ڕاگەیاندنێکدا، کە داوای وەرگێڕی کوردی دەکەن دەنووسن. عەرەبی / سۆرانی، فارسی / سۆرانی و تورکی / کرمانجی، وەك بڵێی ئەو زارە کوردییانە هەریەکەو زمانێکی تایبەت و بەشێك بن لە عەرەبی، فارسی و تورکی. هەڵسوکەوت لەگەڵ زمانی کوردیدا وەك دوو زمانی جیاواز سەیر دەکرێ.

جـ – تەلەفزیونی مەد MEDTV – هەواڵ و دەنگوباسەکانی بەدوو زاری کرمانجی (ژووروو – خواروو)، شێوە زاری زازایی – وەك سێ زمانی جیاواز بڵاودەکاتەوە. )[1]

ئەگەر چارەی ئەم تێکەڵیەی ئێستای زمانی کوردی نەکرێت و پەیڕەوی بەکارهێنانی زمانێکی ستاندارد بۆ هەموو نەتەوەی کورد نەکرێت، ئەوا زمانەکەمان پارچەپارچە دەبێت و بەرەو دواوە دەڕوات، هەرچی مەسەلەی وەرگێڕانیشە، وەرگێڕان لە کوردییەوە بۆ کوردی – ناکرێ نێوی وەرگێڕانی لێ بنرێ، چونکە وەرگێڕان لە زمانێکی سەربەخۆوە بۆ زمانێکی سەربەخۆی دیکە دەبێت، وەك عەرەبی بۆ کوردی، ئینگلیزی بۆ فارسی، کوردی بۆ فەرەنسی و.... هتد.

---

(١) ئەمجەد شاکەلی، زمانی یەکگرتووی کوردی، گەلێك لە دەوڵەتی کوردی پێویستترە،ل ٥٩ – ٦٠.

# ڕێنوسی یەکگرتووی کوردی

ئەمڕۆ لە کوردستان، بەتایبەتی لەهەرێمی کوردستانی عێراق، زمانی کوردی هەنگاوێکی باشی بڕیوە، نوسینیش بەزمانی کوردی پەرەی سەندووە، خوێندنی قۆناغەکانی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی بەزمانی کوردییە، هەروەها ژمارەیەکی زۆر ڕۆژنامەو گۆڤار و کتێب بەزمانی کوردی لەچاپ دەدرێن، لە دەرەوەی کوردستانیش زۆر دام و دەزگای ڕوناکبیری و خوێندن دامەزراون، بەڵام تاوەکو ئێستاش ڕێنوسێکی یەکگرتووی کوردیمان نییە، ئەگەر سەرنج بدەین لە ڕێنوسی کوردی بە ئەلف و بێی عەرەبی هەروەها بە ئەلف و بێی لاتینیش کێشەکان بێ چارەسەر ماونەتەوە. نەبوونی ڕێنوسێکی یەکگرتوو کارێکی نێگەتیڤ دەکاتە سەر پڕۆسەی پێشکەوتنی زمانی کوردی، جۆرێك سەر لێشێوان بۆ خوێنەران دروست دەکات. ڕێنوسی یەکگرتوو، بنچینەی خوێندەواری و زمانی ئەدەبیی یەکگرتووە، ئەم یەکگرتنە، فەرهەنگی زمان بەرەو پێشەوە دەبات، مەرجیش نییە چارەسەرەکان بێ گرێ و کەم و کورتی بن، گرنگ ڕێککەوتنە.

لێرەدا هەندێ لەو گیروگرفتانە دەخەینە ڕوو، کە دووچاری ڕێنوسی ئەمڕۆی زمانی کوردی بوونەتەوە، وەك : –

**یەکەم – پیتی ( و ) ی سەرەتای وشە**

(( پیتی ( و ) لەسەرەتای وشەدا هەر بەیەك واو دەنوسرێت وەك : وشە، وتە، ورد، وشك، ورچ ))[1]

**دووەم – گیروگرفتی پیتی ( ی ) :**

نیشانەی ( ی ) لە زمانی کوردیدا بەم شێوەیەی خوارەوەیە :

(( ١– پیتی ( ی ) بزوێن، واتە ( ی : I ).

بۆ نموونە : زەوی – Zewi

٢– پیتی ( ی ) ی کۆنسۆنات. واتە ( ی : y )

بۆ نموونە : یار – yar

---

(١) محەمەد وەسمان، چەند لاپەرەیەکی ڕۆژنامە نوسی، ل١٧٣.

هەروەها پیتێکی ( ی ) ی بزوێنی فرەکورت هەیە کە لە نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی لاتینیدا نیشانەی ( I ) ی بۆ دانراوە وەك لە وشەکانی من – min، کن – kin، ژن – jin . ئەم نیشانەیە لە نووسینی کوردی بە ئەلف و بێی عەرەبیدا نییە.

جگە لەوەش نیشانەکانی ( ی ) ی بزوێن و ( ی ) کۆنسۆنات واتە ( I ) و ( y ) لە ئەلف و بێی عەرەبیدا، هەردووکیان هەمان نیشانەی ( ی ) یان هەیە بەلام لە راستیدا لە یەکتر جیاوازن و لەکاتی بەدوای یەکتر هاتنیاندا دەبێ هەردووکیان بنوسرێن.

وەك : نییە، زەوییەکە.

(( NÎye. ZewÎyeke )) [1].

سێیەم : – پاشگرەکانی ( دا. ڕا. وە )

(( ئەم پاشگرانە بە وشەکانی پێش خۆیانەوە دەلکێنرێن )) [2]، وەك :

دا : لە شەڕدا ( لە شەڕدا کوژرا ).

ڕا : لە سلێمانی ڕا ( لە سلێمانی ڕا بەپێ هاتووین ).

وە : لەهەولێرەوە ( لە هەولێرەوە تا کۆیە ( ٧٦ ) کیلۆ مەترە ).

چوارەم : – ( مۆرفیمی ( تر ) هاوبێژە : –

١– (( مۆرفیمی پلەی بەراوردی ئاوەڵناوە )) [3]

مۆرفیمی ( تر، ترین ) کە بۆ بەراوورد بەکاردێت دەبێ بە وشەکانی پێش خۆیانەوە بلکێنرێن. وەك :

زیرەك : زیرەکتر – زیرەکترین.

بەرز : بەرزتر – بەرزترین.

پێنجەم :

پیتی ( ت ) لە کۆتایی کاردا دەشێ بنوسرێت و دەشێ نەنووسرێ :

دەکرێت، دەخوات ( یان ) دەکرێ، دەخوا.

---

(١) بەدران ئەحمەد حەبیب، ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی،ل ١٠.

(٢) سەرچاوەی پێشوو،ل ١٣.

(٣) ئەنجومەنی کۆڕی زانیاری کورد، ڕێنووسی کوردی ،ل ٢٧٨.

شەشەم :

نیسبەت لە زمانی کوردیدا زۆربەی جار بەهۆی پیتی ( ی ) لە کۆتایی ناودادەکرێت.

هەولێر + ( ی ) ⟵ هەولێری

شێخان + ( ی ) ⟵ شێخانی

تێبینی : – ئەو ناوانەی خویان بە دەنگی ( ی ) کۆتاییان دێت، پێویست ناکات ( ی ) نیسبەتیان بخرێتە پاڵ. وەك :

سلێمانی : بەختیار سلێمانی

ئامێدی : شیرین ئامێدی

حەوتەم : نوسینی پیتی ( ڕ ) ی قەڵەو :

لە بەر ئەوەی دەنگی ( ر ) لەسەرەتای وشەدا هەمیشە (قەڵەوە) بۆیە پێویست ناکات حەوت لەژێریدا دابنرێت، وەك : رەوسە، رەوەند، راوێژ

بەڵام لەناوەڕاست و کۆتایی وشەدا نیشانەی حەوتی لەژێر دادەندرێت، وەك :

بڕیار، دڕ، کوڕ.

هەشتەم :

لەزمانی کوردیدا هەندێك وشەهەیە، کە لەوتندا دەنگێکیان تێ دەچێ و هەندێك گۆڕان لە دارشتنیان ڕوودەدات لە نوسیندا ئەم جۆرە وشانە پێویستە بگەڕێنەوە سەر بنچینەی خۆیان ئەگەرچی لە هەموو شوێنێکیش وەك یەك نەخوێندرێنەوە.وەك :مناڵ – منداڵ.

دوانزە – دوازدە.

نۆیـــــەم :

دەنگی ( ـە ) کە هەندێ لە نووسەران دەیخەنە نێوان ژمارەو نیشانەی ( ەم، ـەین ) ی پلەیی یەوە زیادە و لەلاوە هێنراوە، نابێ لە زمانی ئەدەبیدا بنوسرێت، وەك : –

یازدەهەم، دوازدەهەم، سێزدەهەم، یەکهەمین، دووهەمین.

یازدەیەم، دوازدەیەم، سێزدەیەم، یەکەمین، دووەمین.

دەیـــەم :

بـیرو بۆچـوونی جیـاواز هەیـە لـە بـارەی بزوێنـی دوولانـەی ( وێ – وی ) بەتـەواوی یەکلانەکراوەتەوە، کە ئایا ئەمانە فۆنیمن یان دوو دەنگی جیاوازن.

یازدەیـــەم :

ئامرازی ( ش ) ی تەئکید کەوتە هەر شوێنێکی وشـەوە دەبـێ بە بەشـێك لـە وشـەکەو نابێ بەهۆی لەتبوونی وشەکە. وەك : –

نەشهات، ناشتدەمێ، بشمانبەن

ناوی لێکدراو، وەك : –

دەسـتنووس، ئـازادیخواز، سـورهەڵگەڕان، سـەرهەڵدان، دڵـشاد، گـوڵزار..... هتـد. بەیەکەوە دەنووسرێن.

بەڵام ئەگەر وشەی دووەم لە دۆخی فرماندابوو، بەجیا دەنووسرێن :

رێك دەکەوین، پێك دەهێنین.

-( وشەی داتاشراو ( منحوت ) بەدەم یەکەوە دەنووسرێت، وەك :

- (( خورمژ، رێنووس، رێزمان ) ))[1].

سێزدەیـــەم :

پیتی ( و ) ی بەستن بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە وشـەی پـێش خـۆی و پـاش خۆیـەوە دەنووسرێت و مامەڵەیەکی سەربەخۆی لەگەڵدا دەکرێت : –

سروە و سازان، من و تۆ

بەڵام ئەگەر مۆرفیمی ( و ) (( کەوتە نێوان جووت وشەوە و بەهـەردووکیان ئـیدیۆمێکی تایبەتیان پێکەوە ناو هیچ کەرتێکیان بە جودا ئەو مانایە نەدەن ئـەوا لـەم بـارەدا ( و ) بـە بەشی یەکەمیانەوە دەلکێت، وەك : گفتوگۆ، کشتوکاڵ..... هتد. ))[2].

---

(١) مستەفا نەریمان، رێنووسی کوردی لە رەگ و ریشەوە،ل ٤٢.

(٢) محەمەد وەسمان، چەند لاپەڕەیەکی رۆژنامە نووسی،ل ١٧٤.

## نوسینی وشەی بێگانە : -

میللەتی کورد بەهۆی ئەو پەیوەندییەی کە لەگەڵ میللەتانی دیکەی دراوسێ و جیهانیدا، چ لەڕووی سیاسی یان ڕۆشنبیری یان کلتورییەوە هەیەتی، چەندین وشەی ئەو زمانانە هاتۆتە ناو زمانەکەمانەوە.

پێویستە هەر وشەیەك کە لە زمانێکی دیکەوە دێتە ناو زمانی کوردی، لەگەڵ سازو ئاوازی کوردیدا بگونجێنرێت و بە ڕێنوسی زمانی کوردی بنوسرێت.

(( هیچ ووشەیەکی بێگانە نابێ، بە ڕێنووسی ئەو زمانە بێگانەیە بنوسرێ، کە لێوەی وەرگیراوە. چونکە ئەگەر بێتو ئێمە ئەو وشە بێگانانە هەروەك خۆیان بنووسینەوە، دەبێ منداڵەکانمان و ئەو بێگانانەی زمانە کەمان فێردەبن، فێری دوو جۆرە نووسین بکەین))[1].

بەتایبەتی ئەو وشانەی کە لە زمانی عەرەبی وەردەگیرێن (( چونکە لە عەرەبیدا دەنگیئەوتۆ هەن لە کوردیدا نین و لەگەڵ یاسای فۆنەتیکی زمانی کوردی ڕێك ناکەون بەوێنە دەنگی ( ث، ذ، ص، ض، ط، ظ ) لەزمانی کوردیدا نییەو گۆکردنیان بەگوێرەی دەنگسازی کوردی پێویستیان بە گۆرینەو لە کوردیدا دەبنە ( س، ز، س، ز، ت، ز ) جا ئەگەر هات و

ئەو وشانە وەکو خۆیان وەرگیران دەبێ بخرێنە ناو دووکەوانەوە ))[2].

هەر بەو شێوەیە هەندێ دەنگی ڕەسەنی کوردی وەك : ( چ، گ، پ، ڤ، ۆ، ێ، ڵ ) لە زمانی عەرەبیدا نین. بەڵام لە زمانە ئەورووپایی یەکاندا هەن. لەبەر ئەوە دەبێ ئەو وشانە لە زمانە ڕەسەنەکەی خۆیان وەربگرین و بە ڕێنوسی کوردی بیاننوسین، لەبەر ئەوە نابێ، (ناوی (( ئامێر، زاراوە جۆراوجۆرەکان، ناوی مانگەکان، گوند، شارۆچکە، شارو وڵات))، وەك ( عەرەب، تورك و فارس )) ەکان بنوسین، بەڵکو پێویستە ئەو گەلانە خۆیان چۆنی دەڵێن و چۆنی دەنوسن، ئێمەش هەر بەو شێوەیە بیاننووسین. نەك لە زمانی عەرەبییەوە وەریانگرین و بیاننووسین، بۆ نموونە : -

---

(١) جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی،ل ٧٧.

(٢) محەمەد حسین عەلی زەهاوی، گیروگرفتی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی،ل ٥٦.

(( نـاوی دەوڵـەتی (( Portugal ))، بـەپیتی کـوردی (( پورتوگـاڵ )) بنووسـین، نـەك گوتن و نووسینەکەی، لە زمانی دووەمەوە وەرگرین. ، عەرەب پیتی (( پ، گ )) یان نییە و بە (( برتغال)) دەینووسن.

هەروەها عەرەبەکان (( چیچێن )) بە (( شیشان )) دەخوێننەوە لەبەر ئـەوەی دەنگـی (چ ) یان نییە.

هـــــــەروەها، (( Venezuela و Japan و America و Polen و Gambia و Ghana و Vatican و Gabon )) عەرەبەکان بە (( کابون، بولونیا، امریکا، یابـان، فنـزویلا، فیتنـام، فاتیکان، کانـا، کامبیـا )) دەیاننوسـن، کـە ڕاسـتتر وایـە بـە (( ژاپـۆن، ئـەمێریکا، پۆڵـۆن، گابۆن، گانا، گامبیا، ڤاتیکان، ڤێتنام، ڤێنزەزێللا )) بنووسرێن ))[1].

هەروەکو چۆن لە ڕووی دەنگەوە ئەو وشـانەی دێنـە نـاو زمـانی کوردییـەوە، پێویستە بەرگێکی خۆماڵیان بە بەردا بکرێت، بە هەمان شێوەش لە ڕووی ڕێنووسەوە (( کـورد چـۆن وشـەی هـەر زمـانێکی بێگانـەی وەرگرتـووەو شـێوەو بـەرگی کـوردی بـە بـەردا کـردووە و خستوویەتی یە ژێر باری سروشتی فۆنەتیکی زمانەکەیەوە، هەر بـەو جـۆرەش پێویستە لـە ڕێنووسدا مامەڵەی لەگەڵ بکرێ، چونکە ڕێنووس ئاوێنەی واقیعی زمانەکەیە ))[2].

---

(١) حوسێن محەمەد عەزیز، سەلیقەی زمانەوانیی و گرفتەکانی زمانی کوردیی،ل ٤٥٤ – ٤٥٥.

(٢) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، گیروگرفتی ڕێنووسی کوردی بە ئەلف و بێی عەرەبی،ل ٧١.

## نووسینی ناوی بێگانە : -

واتە ئەو ناوانەی کە لە زمانی دیکەوە وەر دەگیرێن و کوردی نین، پێویستە بە ڕێنووسی کوردی بنووسرێت، وەك :

محمد = محەمەد

عبدالله = عەبدوللا

عوسمان = وەسمان

(( georg = جۆرج ، henry = هەنری ))[1].

لە کۆتاییدا دەڵێین : –

ئاشکرایە کە (( نوێ کردنەوەو پێش خستنی ولات لە ڕووی کۆمەلایەتی و نەتەوایەتی یەوە پەیوەندی یێکی تەواوی لەگەڵ بلاوبوونەوەی خوێندەواری دا هەیە و ئەم بلاوکردنەوەیەش لەبەر نەبوونی ڕێنووسێکی پڕ بە پڕ و گونجاو نایەتەدی. دەبێت بە هەڵەش بۆ کێشەکە نەچین و وابزانین کە بوونی ڕێنووسێکی گونجاوی فۆنیمی پڕ بە پڕ لەخۆی دا بەسە بۆ ئەوەی ڕێنووسەکە پەسەند بکرێت لەلایەن خەڵکی ولاتەوە، چونکە کێشەکە هەر پەیوەندی بە زمانەوانی یەوە نی یە بەتەنیا بەڵکو کێشەیێکی کۆمەلایەتیشە و دەبێت لەم ڕوانگەیەشەوە سەیربکرێ و باری کۆمەلایەتی بۆ خۆش بکرێ))[2].

---

(١) محەمەد وەسمان، چەند لاپەڕەیەکی ڕۆژنامەنووسی،ل ١٧٥.

(٢) محەمەد مەعروف فەتاح، سنوورو بنەما ئەرکەکانی کۆزمانەوانی، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ،ژ(١١٢)،ل ١٢٣.

# ئەنجــام

لە کۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا بە چەند ئەنجامێك گەیشتین :

١- هەرچەندە هەندێك لێکۆڵینەوە لە بارەی زاراوەی کوردی و بواری زاراوەسازی کوردیدا کراوە، بەڵام لەلایەکەوە، ئەم لێکۆڵینەوانە لە کەم و کورتی بەدەر نینە، لە لایەکی دیکەشەوە بۆمان دەرکەوت کە ئەم بوارە زۆر فراوانە و پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زیاتر هەیە و دەکرێ چەندین لێکۆڵینەوەی دیکەشی لەبارەیەوە بکرێت، تازیاتر لە زماندا ڕۆبچیت گرنگی و وردەکاری ناو زمانت بۆ دەردەکەوێت.

٢- زمان وەکو هەموو شتێکی دیکەی زیندوو، بەپێی یاسای تایبەتی گۆڕان، لە ڕەوتێکی بەردەوامی گۆڕاندا یە، گەشە دەکات، تا وورده وورده پەرە دەستێنێت و لەناو کۆمەڵدا ڕەگ دادەکوتێت، لەم ڕەوتەی پێشکەوتنەدا، هەموو زمانێ، لە لایەکەوە، کار لە زمانەکانی دیکەی گەلانی دەوروبەری خۆی دەکات، لە لایەکی دیکەشەوە، زمانەکانی دیکە کاری تێدەکەن. جا ئەو کارتێکردنە، دوولایەنی هەیە. هەڵبەتە هەمیشە هەربەچاکە ڕەنگ ناداتەوە، بەڵکو کارتێکردنەکە بە چاك یا بە خراپ ڕوودەدا.

وەرگرتنی زاراوە ئەگەر بەپێی پێویستی زمانەکەو لە ڕادەی ئاسایی خۆی دا بوو، ئەوا زمانەکارتێکراوەکە پتر گەشە دەکاو پێشدەکەوێ، بە پێچەوانەشەوە ئەگەر هاتنە ناوەوەی وشە بۆ ناو فەرهەنگی زمانی خۆماڵی بە لێشاو بوو، بگاتە ڕادەیەك کاربکاتە سەر دەستوری زمان و سترەکچەری ڕێزمانی زمانەکە ئەوا لاوازی دەکاو بەرە بەرە دەیپوکێنێتەوە، جاری واش هەیە، زمانە کارتێکراوەکە بەرگە ناگرێ و لە نێو دەچێ.

٢ ژمارەی وشەلەهەموو زمانێکدا سنووردارە، لە بەرامبەردا ژمارەیەکی بێ سنوور واتا هەیە هەمیشەش لە زۆربوون دایە، بۆیە زمانەکان، پەنا دەبەنە بەر چەند ڕێگایەکی جۆراو جۆر بۆ دروستکردنی زاراوەو دەربڕینی واتاکان.

٤- ئاکامەکانی زانستی زاراوەسازی و جێ بەجێ کردنی نەك هەر بۆ ئاسان گواستنەوەی زانیاری و زانست و تەکنۆلۆژیای نوێ بە ڵکو بۆ یەکخستنی زاراوەکان وەك بنچینەیەك بۆ دروست بوونی زمانی ستانداردی کوردی هەنگاوێکی مەزن و پیرۆزە، لە بەر ئەوەی یەکخستنی زاراوەکانی زمان، دەبێتە پردێك بۆ لە یەك نزیك بوونەوەی دیالێکتەکانی

زمانی کوردی، کە یەکخستنی زمانی کوردییە، وە سەرەتایەکە بۆ هێنانەدی ئاواتی لە مێژینەی کورد، کە دروست بوونی زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردییە.

٥- بۆ گرنگی دان بە تایبەتمەندی و چۆنیەتی سازکردنی زاراوەی کوردی، پێویستە گرنگی بە مۆرفیمەکانی زمان و تایبەتییەکانیان بدەین، لە بەرئەوەی، زانین و شارەزابوونی مۆرفیمەکانی وشە دارشتن و چۆنیەتی کەرت کردنی وشە بۆ مۆرفیمە پێکهێنەرەکانی، نەك هەر سوودی هەیە بۆ شارەزابوونی چۆنیەتی دروست بوونی وشەکانی زمان، بەڵکو بۆ رۆنان و دروستکردنی زاراوەی نوێباویش.

٦- زمانی کوردی زمانێکی زیندووی سەربەخۆیە، پێشگرو پاشگرەکان لەو زمانەدا، خاوەنی تایبەتمەندی خۆیانن، بە وێنە :- ژمارەی ئەو پێشگرو پاشگرانەی کە دەچنە سەرهەمان بەشی ئاخاوتن وەك یەك نین، هەروەها ژمارەی ئەو پێشگرانەی کە دەچنە سەر بەشە ئاخاوتنی (کار)، زیاترە لە ژمارەی ئەو پێشگرانەی کە دەچنە سەر بەشە ئاخاوتنی (ناو )، بە پێچەوانەشەوە، پاشگر لەگەڵ بەشە ئاخاوتنی (ناو) چالاکترە، وەك لە بەشە ئاخاوتنی (کار).

٧- مۆرفیمە وشە دارێژەکان، لە چالاکیاندا بۆ دروستکردنی زاراوەی دارێژراو، جیاوازیان هەیە، هەندێکیان لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر وشەدا یەکدەگرن و زاراوەی نوێ دادەرێژن بە وێنە پێشگری (هەڵ) یەکێکە لە پێشگرە چالاکەکانی بەشە ئاخاوتنی (کار)، بەلاَم هەندێکیان لەم بارەیەوە سستن و لەگەڵ ژمارەیەکی کەمی وشەدا یەکدەگرن، وەکو پاشگری (سست) لەم وشانەی خوارەوەدا :-

بارست، توانست، زانست.

هەروەها وشەکانیش لە چالاکیاندا، بۆ وەرگرتنی مۆرفیمی وشە دارێژەر، جیاوازییان هەیە، وشە هەیە ژمارەیەکی زۆر پێشگر یان پاشگر، یاخود هەردووکیان بەیەکەوە وەردەگرێت وەکو کاری (کەوتن)، وشەی واش هەیە بەدەگمەن ئەو مۆرفیمانە بەخۆیەوە دەگرێت، وەکو کاری (خواردن ).

٨- لەم لێکۆڵینەوەیەدا، ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە، جگە لەو پێشگروپاشگرانەی کە لە سەرچاوەکاندا باسیان کراوە، بە گەڕان و لێکۆڵینەوەی زمانەوانیی، دەتوانین ژمارەیەکی باش پێشگرو پاشگری تازە بینینەوە، کە ڕۆڵ دەبینن لە دروستکردنی زاراوەدا، سودیان

لێ وەربگرین بۆ سازکردنی زاراوەی نوێباوی کوردی لە بوارە جۆراو جۆرەکانی زانستی و تەکنیکی.

٩- لە بواری زاراوەسازیی کوردیدا، نابێ مەرجی زۆر قورسی وەرسکەر بەسەردەقی زاراوەو زاراوەسازیدا بسەپێنرێت، ئێمەش لە زمانی کوردیدا دەتوانین پەیڕەوی ئەم ڕێگایانە بکەین کە زمانە پێشکەوتووەکان گرتوویانە و زاراوە سازیی کوردی پێ دەوڵەمەند بکەین، هەروەکو چۆن کاتی خۆی کۆڕی زانیاری پەیڕەوی ئەوەی کردووە.

١٠- هەرزمانێك فەرهەنگێکی بنەڕەتی خۆی هەیە، کە کۆمەڵ لە سەری ڕێککەوتوون، بۆ ناولێنانی شت و دیاردەکانی دەوروبەر، فەرهەنگی بنەڕەتی هەرزمانێك، جیاوازە لە فەرهەنگی بنەڕەتی زمانێکی دیکە، تەنانەت ئەو زمانانەش کە سەربەیەك بنەماڵەو ڕەچەڵەکن. ئەو وشانەی کە لەو فەرهەنگە دا هەن خۆماڵین و بە سەرچاوەی یەکەمی وشە دادەندرێن لەو زمانەدا ١١- بۆ یەکەم جار لەم لێکۆڵینەوەیەدا ئاماژەمان بەهەندێك ( مۆرفیمی دوولانە ) کردووە، کە ئەرکی دوولانە ( سینتاکسی ) و (داڕشتن ) دەبینن، دەتوانین سوودیان لێ وەربگرین و زاراوەی نوێباویان پێ دابڕێژین، بە وێنە :- مۆرفیمی (ان)، کە ئەرکی سینتاکسی، کۆکردنەوەی ناوو ئاوەڵناوە، لەگەڵ هەندێ وشەدا، وەکو پاشگرێکی وشە داڕێژ، بەشداری دەکات لە داڕشتنی هەندێك بەشە ئاخاوتن، وەك :-

ا- ناو :- ڕێز + (- ان ) ڕێزان

ب ئاوەڵکاری داڕێژراو :-

نێو + (- ان ) ⟵ نێوان

تاریك + (- ان ) ⟵ تاریکان

٢-پێشگری دوولانە :-

(نا )

أ- ئەرکی سینتاکسی ناکردنی وشەیە، وەك :-

دەکەم - ناکەم

ب- ئەرکی وشە داڕشتن، وەك :-

نا + ساز ⟵ ناساز

١٢– ئامانژەمان بەوەکردووە، کە هەندێ وشەی سادە، لە هەندێ شوێندا ڕووەو پێشگر یان پاشگر بوونەتەوە، پەیوەندیان بە واتا سەرەکییەکەیانەوە نەماوە، لە بواری زاراوە سازیدا، دەتوانین سوودیان لێ وەربگرین، وەك :–

أ– پێشگر :– سەرکەوت ( لەتاقی کردنەوەدا سەرکەوت )

ب–پاشگری ( – کۆ) لە وشەکانی :– دلکۆ، لاوکۆ، پاشکۆ، سەرکۆ...هتد.

دوو پاشگری (– اندن ) و( –ەوە)، زۆر چالاکن و ژمارەیەکی زۆر ئەرك دەبینن و بەمەبەستی جۆراوجۆر بەکاردێن و بەشداری دەکەن لە داڕشتنی زاراوە لە زمانی کوردیدا.

١٣– چەندین ڕێباز هەیە، کەڕۆڵ دەبینن لە دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی زمان وەکو (داڕشتن، وەرگرتن، لێکدان، میتافۆر، فرە واتاو...هتد )، کە ڕێبازی ( لێکدان و داڕشتن) بە پێی سروشتی زمانی کوردی لە هەموویان سەرەکی ترین، جگە لەو ڕێبازانە، چەندین هۆکاری دیکە هەیە کە دەبنە سەرچاوە بۆ دەوڵەمەند بوونی فەرهەنگی زمان، وەکو (بزووتنەوەی نەتەوەیی و سیاسی، ڕۆژنامەنووسی، پێشکەوتنی زانست و تەکنۆلۆژیا، توێژینەوەی ئەکادیمیی، بزوتنەوەی ئەدەبیی... هتد).

هەروەها وشەی نوێ بە ئامادەکراوی بە هۆی یەکێك لەو ڕێگایانە، دێتە ناو فەرهەنگی زمانەوە ( داگیرکردن، بازرگانی، دۆزینەوەکان، کۆچکردن ).

١٤– چەندین کێشە دێتە بەردەم زاراوەسازی کوردی، کە هەندێکیان پەیوەندییان بە زمانی کوردییەوە هەیە، وەکو ( فرە دیالێکتی، دیاردەکانی هاوبێژی و هاوواتایی ) لە زمانی کوردیدا، هەندێکی دیکەیان پەیوەندییان بەو زمانەوە هەیە کە وەکو سەرچاوەیەك زاراوەی لێ وەردەگرین، هەندێ لەو کێشانەش، پەیوەندییان بە باروددۆخی نەتەوەی کوردەوە هەیە، وەك ( ژێر دەستەیی و نەبوونی دەوڵەت و نەبوونی داهێنان و دۆزینەوەی گەورەو، نەبوونی کۆڕێکی زانیاری کوردی و نەبوونی فەرهەنگێکی یەکگرتووی کوردی...هتد).

١٥– بە کوردی پەیڤین، بە کوردی بیرکردنەوەش دەگەیەنێت، واتا هەبوونی عەقلێکی کوردی، پێچەوانەی ئەمەش ڕاستە زمان و بیرکردنەوە پەیوەندییەکی بناغەییان بە یەکەوە هەیە، قسە کردن بە زمانی داگیرکەر، بیرکردنەوەیە بە عەقلی داگیرکەر. کەم وکوڕی هەرەگەورە ئەوەیە کە زمان ئەو بایەخە شایستەی خۆی پێ نەدرێ و بە هەند

وەرنەگیرێ، کورد دەبێ دەرك بەبایەخی زمان و دەوڵەمەند کردنی زمانەکەی بە دانانی زاراوەی نوێباو بکات، بۆ ئەوەی زمانی خۆی و ناسنامەی خۆی بسەپێنێ.

١٦- پێویستە بایەخ بە وەرگێڕان بدەین، زمان خاسیەتی بوونەوەری زیندووی هەیە، گەورەو بچووك دەبێت، بە دەردەکەوێت و لە ناودەچێت، ئەو زمانەی کە نەیتوانی پێشکەوێت و نوێ بێتەوە دەمرێت، لە پرۆسەی گەشەکردن و نوێبوونەوەدا، وەرگێڕان رۆڵێکی بنچینەیی دەبینێت.

# پێشنیاز

تاوەکو بۆمان بکرێت، وشەی کوردی ڕەسەن بەکاربهێنین، بەتایبەتی لەبواری پەروەردەو فێرکردن و دام و دەزگاکانی حکومەت و شوێنە ڕەسمییەکان، بۆ ئەوەی نەوەیەکی کوردی هۆشیار بە عەقڵ و هۆشێکی کوردانە و زانستیی پەروەدە بکەین.

پێویستە گرنگی بە هەموو بوارەکانی زاراوەی کوردی بدەین و فەرهەنگی زاراوەسازیی کوردی، بەهەوڵدان و گەڕان و لێکۆڵینەوەی جۆراوجۆر دەوڵەمەند بکەین، ئەو بیرە زانستییە بسەپێنین، کە خوێندن و فێربوون بەزمانی دایك، لەهەموو زمانێکی دیکە باشترە و بەهۆی زمانی کوردییەوە خوێندکار دەتوانێت بەقوڵایی بابەتەکاندا بچێتە خوارەوەو ئەندێشەی فراوان بێت، هەوڵی بەکوردی کردنی سەرجەم زاراوە زانستییەکان بدەین و ئەو بیرەش بسەپێنین کە زمانی کوردی هیچی لە زمانانی دیکەی پێشکەوتوو کەمتر نییە، تەنیا هەوڵدان و خۆماندوو کردنی دەوێت، لەپاڵ گرنگیدان بەزمانی کوردی ئینجا گرنگی بە زمانێکی دیکەی پێشکەوتوو بدرێت بەوێنە وەك زمانی ئینگلیزی، بۆ ئەوەی خوێندکار وردەکارییە زانستییەکان شارەزابێت.

هەوڵبدرێت تا لەتوانادا بێت زاراوەی کوردی ڕەسەن بەکاربهێنرێت. بەوێنە لەگەڵ ئەوەی چەندین ساڵە زاراوەی ( ئەستۆپاکی ) بەرانبەر بە زاراوەی ( براءة الذمة ) عەرەبی دانراوە، کەچی تاکو ئێستاش ئەم زاراوە لێکدراوەی زمانی عەرەبی لەزانکۆ و پەیمانگاکان بەکار دەهێنرێت.

# سەرچاوەکان

**١- بەزمانی کوردی :**


١- ئەورەحمانی حاجی مارف ( د. )، وشەی زمانی کوردی، چاپخانەی کۆری زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٥ .

٢- ئەورەحمانی حاجی مارف (د.)، وشە رۆنان لەزمانی کوردیدا، چاپخانەی کۆری زانیاری کورد، بەغدا،١٩٧٧.

٣- ئەورەحمانی حاجی مارف (د.)، رێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم ( مۆرفۆلۆژی )، بەشی یەکەم – ناو–، چاپخانەی کۆری زانیاری عێراق، بەغدا، ١٩٧٩.

٤- ئەورەحمانی حاجی مارف (د.)، گیروگرفتەکانی رێنوسی کوردی بەئەلف و بێی عەرەبی، چاپخانەی کۆری زانیاری عێراق، بەغدا، ١٩٨٢ .

٥- ئەورەحمانی حاجی مارف (د.)، نوسینی کوردی بەئەلف بێی عەرەبی، لەچاپکراوەکانی ئەمینداریەتی گشتی رۆشنبیری و لاوانی ناوچەی کوردستان، چاپخانەی (علا )، بەغدا، ١٩٨٦ .

٦- ئەورەحمانی حاجی مارف (د.)، گۆڤاری کۆری زانیاری عێراق ((دەستەی کورد))، بەرگی پازدەهەم، چاپخانەی کۆری زانیاری عێراق، بەغدا، ١٩٨٦ .

٧- ئەورەحمانی حاجی مارف (د. )، رێزمانی کوردی، بەشی یەکەم (مۆرفۆلۆژی )، بەشی سێیەم– ئاوەڵناو–، چاپخانەی کۆری زانیاری عێراق، بەغدا، ١٩٩١ .

٨- ئەورەحمانی حاجی مارف (د.)، رێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم ( مۆرفۆلۆژی )، بەشی چوارەم – ژمارەو ئاوەڵکردار–، بەغدا، ١٩٩٨ .

٩- ئەورەحمانی حاجی مارف (د.)، رێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم ( مۆرفۆلۆژی )، بەشی پێنجەم – کردار –، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠ .

١٠- ئەورەحمانی حاجی مارف (د.)، فەرهەنگی زاراوەی زمانناسی، کوردی – عەرەبی – ئینگلیزی، سلێمانی، ٢٠٠٤ .

١١- ئەورەحمانی حاجی مارف(د.)، بەرهەمە زمانەوانییەکانم ((نوسینو وەرگێران))، بەرگی سێیەم، (وتارو لێکۆڵینەوە) لەگەڵ پاشکۆیەك، سلێمانی، ٢٠٠٥.

١٢- ئەبو بەکر عومەر قادر، بەراوردێکی مۆرفۆسینتاکسی لەزمانی کوردی و فارسی دا، نامەی ماجستێر، کۆلێجی زمان، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠٤ .

١٣- ئەحمد ئەبو زەید (د.)، (و):رۆشنا ئەحمەد، زانستی سەردەم، ژمارە(٢٣)، سلێمانی، ٢٠٠٥ .

١٤- ئەمجەد شاکەلی، گۆڤاری نەوشەفەق، ژمارە (٢)، ٢٠٠٣ .

١٥- ئەنجومەنی کۆڕی زانیاری ،نەسرین محمد فەخری، گۆڤاری کۆری زانیاری کورد، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٣

١٦- ئەنجومەنی کۆڕ، لیستەی سێیەمی زاراوەکانی کۆر، گۆڤاری کۆری زانیاری کورد، بەرگی دوهەم، بەشی دوهەم، بەغدا، ١٩٧٤ .

١٧- ئەنجومەنی کۆڕ، ئەحمەد حەسەن، جەمال بابان، گۆڤاری کۆری زانیاری کورد، بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٥ .

١٨- ئیبراهیم عزیز ئیبراهیم (د.)، دیالێکتەکانی زمانی کوردی، زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ١٩٨٣.

١٩- بارات ئۆسما نۆڤا، (و): شوکر مستەفا، کۆڤاری کۆری زانیاری عێراق ((دەستەی کورد))، بەرگی حەوتەم، بەغدا، ١٩٨٠ .

٢٠- بەختیار سەجادی، محەمەد مەحمودی، فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی، کوردی – ئینگلیزی، ئینگلیزی – کوردی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢ .

٢١- بەختیار سەجادی، محەمەد مەحمودی، فەرهەنگی شیکارانەی زاراوەی ئەدەبی، کوردی – ئینگلیزی، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە. هەولێر، ٢٠٠٥ .

٢٢- بەدران ئەحمەد حەبیب رێنوسی یەکگرتووی کوردی، چاپی یەکەم، ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤ .

٢٣- بەدران ئەحمەد حەبیب، فەرهەنگی زارەوە گەلی راگەیاندن، ئینگلیزی – کوردی – عەرەبی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥ .

٢٤- بەکر عومەر عەلی، بەستن و کرتاندن لەزمانی کوردیدا، نامەی ماجستێر، کۆلیجی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٩٢ ٠

٢٥- بەکر عومەر عەلی، میتافۆر لەروانگەی زمانەوانییەوە، نامەی دکتۆرا، کۆلێژی زمان، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠٠ ٠

٢٦- بەکر عومەر عەلی (د.)، چاو پێکەوتن، زانکۆی کۆیە.

٢٧- بۆبێ ئەسەر، ئەمڕۆ پێویستمان بەچی هەیە، گۆڤاری بەربانگ، ژمارە( ٨٧ )، ساڵی (١٢)، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٣ ٠

٢٨- تاهیر سادق، ڕێنوس - چۆنیەتی نوسینی کوردی، چاپی دووەم، لەبڵاوکراوەکانی کتێبفرۆشی سیدیان، مەهاباد، ساڵی چاپ (نییە) ٠

٢٩- تاهیر سادق، فەرهەنگی هاوواتاکانی کوردی، کوردستان، سلێمانی، ١٩٩٨ ٠

٣٠- تاهیرە سەففار زادە، (و): قادر وریا، بنچینەکانی وەرگێران، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم،سلێمانی، ٢٠٠٥

٣١- تەها فەیزی زادە، فەرهەنگی وشە دوانەکانی زمانی کوردی، چاپی یەکەم، ئینتشاراتی سەلاحەدینی ئەییوبی، ورمێ، ١٣٦٧ی هەتاوی ٠

٣٢- تۆفیق وەهبی، ئەسڵی پیتە قالبی (( ئە)) ی شێوە سلێمانی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٣ ٠

٣٣- جەلال مەحمود عەلی، ئیدیۆم، بەرگی یەکەم، چاپخانەی حسام،بەغدا، ١٩٨٢ ٠

٣٤- جەما نەبەز، هەندێ زاراوەی زانستی، چاپخانەی کامەران، سلێمانی، ١٩٦٠ ٠

٣٥- جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی، بامبێرگ، ئەڵمانیا، ١٩٧٦ ٠

٣٦- جەمال نەبەز، سەرنجێك لەچەند زاراوەیەکی تازە بەکار هاتوو و کۆڕی زانیاری کورد، کۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات، ژمارە (٢٢)، چاپخانەی (( دار الجاحظ))، بەغدا، ١٩٧٨.

٣٧- جەمال عەبدول، فەرهەنگی کیمیا، ئینگلیزی - عەرەبی - کوردی، دووەم چاپ، سلێمانی، ١٩٩٩ ٠

٣٨- جەمال عەبدول، بەرکولێکی زانستە زاراوەسازیی کوردی، چاپی یەکەم، قەشەنگ، سلێمانی، ٢٠٠١ ٠

٣٩- حوسێن محەمەد عەزیز، ململانێی ئایدۆلۆژیی لەکوردستاندا، چاپی دووەم، چاپخانی کتێبی هەرران،سوید، ١٩٩٥ ٠

٤٠- حوسێن محەمەد عەزیز، سەلیقەی زمانەوانیی و گرفتەکانی زمانی کوردی چاپی دووەم، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی، ٢٠٠٥ ٠

٤١- دەستەی کورد، رێنوسی کوردی بەپێی بریارەکانی کۆڕی زانیاری عێراق، چاپخانەی کۆری زانیاری عێراق، بەغدا، ١٩٨٧ ٠

٤٢- دەستەی کورد، محەمەدی مەلاکەریم، نەسرین محمد فەخری، گۆڤاری کۆری زانیاری (( دەستەی کورد))، بەرگی بیستو نۆهەم و سیهەم، بەغدا، ٢٠٠٢ ٠

٤٣- دلبەر ئیبراهیم فەرج شالّی، یاسا دەنگییەکانی زمانی کوردی نامەی ماجستێر، کۆلێژی زمان، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠٠ ٠

٤٤- دیار عەلی کەمال، طالب حسێن عەلی (د.)، یاساکانی رۆنان و گوێزانەوە لەرستەی کوردیدا، گۆڤاری زانستە مرۆڤایەتییەکان. ژمارە (٢١)، زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ٢٠٠٤ ٠

٤٥- دیوانی بێخود، بەغدا، ١٩٧٠ ٠

٤٦- رەفیق محەمەد محێدین شوانی، چاوگ و فرمان کامیان سەرچاوە و بنەرەتن، گۆڤاری کۆری زانیاری (( دەستەی کورد))، بەرگی بیستو حەوتەم‌و بیستو هەشتەم، بەغدا، ١٩٩٨ ٠

٤٧- رەفیق محەمەد محێدین شوانی، ئەو وشانەی لەچاوگەوە وەردەگیرێن، نامەی ماجستێر، کۆلێجی ئەدەبیات، زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ١٩٩٨ ٠

٤٨- رەحمان ئیسماعیل حەسەن کانەبی، پێرەوی فۆنیمە ناکەرتی یەکان، نامەی دکتۆرا، زانکۆی بەغدا، ١٩٩٨ ٠

٤٩- رەحیم قادر سورخی، رۆڵی واتا، لەپرۆسیسی پێوەندییەگشتیەکاندا، زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ٢٠٠٥.

٥٠- سازان رضا معین، واتاو دەوروبەر ( لێکۆڵینەوەیەکی پراگماتیکیە)، کۆلێجی پەروەردە زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ٢٠٠٥ ٠

٥١- سەلام ناوخۆش بەکر، زمانناسی و هەندێ بابەتی زمانناسی کوردی، لەبڵاوکراوەکانی کتێبفرۆشی سۆران، چاپخانەی (ژین)، هەولێر، ٢٠٠٤ .

٥٢- شێخ ئەحمەدی جزیری، دیوانی مەلای جزیری، تهران، ١٣٦١ ی هەتاوی.

٥٣- شێخ محەمەدی خاڵ، فەرهەنگی خاڵ، جزمی یەکەم، چاپخانەی کامەران، ١٩٦٠ .

٥٤- شێخ محەمەدی خاڵ، فەرهەنگی خاڵ، جزمی دووەم، چاپخانەی کامەران، سلێمانی، ١٩٦٤.

٥٥- شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چاپی دووەم، سلێمانی، ١٩٧١ .

٥٦- شێخ محەمەدی خاڵ ، هەژار موکریانی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی دووەم، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٤ .

٥٧- شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چاپی سێیەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠ .

٥٨- شێرکۆ بابان (د.)، رێزمانی پاشگری دووپاتیی ((ەوە))، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، چاپی یەکەم، ٢٠٠١ .

٥٩- شێرکۆ حەمەئەمین قادر، مۆرفیمە بەندەلێکسیکی و رێزمانییەکان و ئەرکیان لەدیالێکتی گۆراندا، نامەی ماجستێر، کۆلێجی زمان، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠٢ .

٦٠- صادق بەهائەدین ئامێدی، رێزمانا کوردی، کرمانجی یا ژۆری و ژێریا هەڤبەرکری، چاپایەکێ، دار الشؤون الثقافية العامة، بەغدا، ١٩٨٧ .

٦١- صادق بەهائەدین، ئیدیەمێت کوردی، چاپا دووێ، چاپخانا وەزارەتا پەروەردێ، هەولێر، ٢٠٠٥ .

٦٢- صباح رەشید قادر، هاوبێژی وفرەواتایی لەگیرەکدا، نامەی ماجستێر، کۆلێجی زمان، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠٠ .

٦٣- صدیق بۆرەکەیی، دیوانی مەستورەی کوردستانی، ١٣٧٤ ی هەتاوی .

٦٤- طالب حوسێن عەلی، فۆنۆلۆجی و دیاردەی ئاسانبوونی فۆنیمەکان لەشێوەزاری سلێمانیدا، نامەی ماجستێر، کۆلێجی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ١٩٨٩ .

٦٥- طالب حوسێن عەلی، هەندێ لایەن لەپەیوەندی نێوان رستەو واتا لەکوردیدا، نامەی دکتۆرا، کۆلێجی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ١٩٩٨ .

٦٦– عەبدولرەحمان ئەمین زەبیحی، قاموسی زمانی کوردی، ئینتیشاراتی سەلاحەدینی ئەییوبی، ورمێ، ١٣٦٧ ی هەتاوی .

٦٧– عەبدولرەحمان ئەمین زەبیحی، قاموسی زمانی کوردی، بەرگی دووەم، چاپخانەی کۆری زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٩.

٦٨– عبدالرحمن بەگی صاحبقران، دیوانی سالم، بلاْوکراوەی (کوردی و مەریوانی) ژمارە (٥)،بەغدا، ١٩٣٣ .

٦٩– عبدالرحمن بەگی صاحبقران، دیوانی سالم، چاپخانەی کوردستان، چاپی دووەم، هەولێر، ١٩٧٢ .

٧٠– عەلائەدین سجادی، خۆشخوانی، چاپخانەی (مەعارف)، بەغدا، ١٩٨٦.

٧١– عیزەدین مستەفا رەسول، سەرنجێ لەزمانی ئەدەبی یەکگرتوو، چاپخانەی (سلمان الاعظمی)، بەغدا، ١٩٧١ .

٧٢– عیزەدین مستەفا رەسول (د.)، بۆ زمان، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٥ .

٧٣– غازی فاتح وەیس، کتێبی زاراوەی کوردی و چەند تێبینییەك، گۆڤاری کاروان، ژمارە (٢٤)، هەولێر، ١٩٨٤ .

٧٤– فەتاح مامەعلی، هاودەنگ لەزمانی کوردیدا، نامەی ماجستێر، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٨٩ .

٧٥– فەرەیدون عەبدول محەمەد، هەندێ لایەنی رستەسازی زاری هەورامی، نامەی دکتۆرا، کۆلێجی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٩٨ .

٧٦– فوئاد تاهیر سادق، هۆشیاری زمانەوانی، چاپی یەکەم، کوردستان، سلێمانی، ١٩٩٩ .

٧٧– کامل حەسەن بەسیر(د.)، زمانی عەرەبی و کێشەی زاراوەی کوردی، چاپخانەی کۆری زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٤ .

٧٨– کامل حەسەن بەسیر (د.)، زاراوەی کوردی، زانکۆی سلێمانی، سلێمانی، ١٩٧٩ .

٧٩– کامل حەسەن بەسیر(د.)، زمانی نەتەوایەتی کوردی، کۆری زانیاری عێراق، بەغدا، ١٩٨٤ .

٨٠– کەمال جەلال غەریب، ئینسکلۆپیدیا چییە؟، ئۆفیستی راز، سلێمانی، ٢٠٠٤ .

٨١- کەمال مەزهەر ئەحمەد (د.)، ڕێنیسانس، فوئاد میسری کردوویە بەکوردی، چاپی یەکەم، چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا، ١٩٨٤ .
٨٢- کەمال فوئاد، زاراوەکانی زمانی کوردی و زمانی ئەدەبیی و نوسینیان، گۆڤاری زانیاری، ژمارە (٤)، بەغدا، ١٩٧١ .
٨٣- کەمال مەعروف (د.)، ئەدەبیاتی کلاسیکی و نوێخوازی کوردی، چاپی یەکەم، ژین، سلێمانی، ٢٠٠٣ .
٨٤- کەریمی حسامی، یادی هێمن، چاپی یەکەم، لەبڵاوکراوەکانی سەردەمی نوێ، سوید، ١٩٨٧ .
٨٥- کەوسەر عەزیز ئەحمەد، بیردۆزی مۆرفیم و هەندێ لایەنی وشەسازی کوردی، نامەی ماجستێر، کۆلێجی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ١٩٩٠ .
٨٦- کوردستان موکریانی (د.)، سینتاکسی ڕستەی سادە لەزمانی کوردیدا، دەزگای ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن، چاپخانەی ( دار الحریة )، بەغدا، ١٩٨٦ .
٨٧- کوردستان موکریانی، سینتاکسی ڕستەی کوردی، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە،هەولێر، ٢٠٠٠ .
٨٨- کوردستان موکریانی (د.)، سینتاکسی ڕستەی تێکەڵ، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٤ .
٨٩- کۆمەڵێ نوسەر، ژماری تایبەت بەسیمیناری فەرهەنگی، نوسەری نوێ، ژمارە (١٩)، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠١ .
٩٠- گیو موکریانی، فەرهەنگی مەهاباد، چاپی یەکەمین، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، ١٩٦١ .
٩١- لیژنەیەك لەوەزارەتی پەروەردە، فەرهەنگی قوتابی، کوردی - عەرەبی، چاپی یەکەم، الوفاق، بەغدا، ٢٠٠١ .
٩٢- لیژنەی دەستوری زمانی کوردی، زمانی کوردی، هەندێ لەبابەتە کێشەدارەکان لە ڕێزمانی کوردیدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا، ١٩٨٥ .
٩٣- لیژنەی زاراوە زانستیەکان، زاراوە زانستیەکان، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی چوارەم، بەغدا، ١٩٧٦ .

٩٤- ليژنەی (( زمان و زانستەکان ))، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی شەشەم، بەغدا، ١٩٧٨ .
٩٥- ليژنەی زمان، چەمکێکی دی لەڕێزمانی کوردی، کۆڕی زانیاری عیراق، دەستەی کورد، بەغدا، ٢٠٠٠ .
٩٦- مەسعود محەمەد، وردبوونەوە لەچەند باسێکی ڕێزمانی کوردی، چاپی یەکەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٤ .
٩٧- مەسعود محەمەد، زاراوەسازی پێوانە، چاپخانەی سۆمەر، بەغدا،١٩٨٨ .
٩٨- محەمەد ئەمین هەورامانی، زاری زمانی کوردی لەترازووی بەراورد دا، بەغدا، ١٩٨١ .
٩٩- محەمەد ئەمین هەورامانی، فەرهەنگی زاروو ئیدیۆمی زمانی کوردی، ئەمینداریێتی گشتی رۆشنبیری لاوان، بەغدا، ١٩٨٩ .
١٠٠- محەمەد تاهیر گوهەزری، ڕێزمانا کوردی زارێ کرمانجی، چاپخانا خەبات، دهۆك، ١٩٩٩ .
١٠١- محەمەد چیا، فەرهەنگی فەلسەفی، ئینگلیزی - عەرەبی - کوردی، چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٤ .
١٠٢- محەمەد حسێن علی زهاوی، گیروگرفتی نوسینی کوردی بە ئەلف بێی عەرەبی، نامەی ماجستێر، کۆلێجی پەروەردە، زانکۆی بەغدا، ١٩٩٩ .
١٠٣- محەمەد مەحوی (د.)، زمان و زانستی زمان، بەرگی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠١ .
١٠٤- محەمەد وەسمان، چەند لاپەڕەیەکی ڕۆژنامەنوسی، کوردستان، هەولێر، ٢٠٠٤ .
١٠٥- محەمەد وەسمان، گیروگرفتەکانی زاراوەدانان لەزمانی کوردیدا، هەولێر، ٢٠٠٤ .
١٠٦- محەمەد وەسمان، بەرەو فەرهەنگی پزیشکی یەکخراو، نوسەری نوێ، ژمارە (١٨)، هەولێر، ٢٠٠١ .
١٠٧- محەمەد مەعروف فەتاح، گۆڤاری کوری زانیاری عێراق، (( دەستەی کورد ))، بەرگی پازدەم، بەغدا، ١٩٨٦ .
١٠٨- محەمەد مەعروف فەتاح، سەرەتایەك لەزمانەوانی بەکەرەسەی کوردی، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ١٩٨٧ .

١٠٩–محەمەد مەعروف فەتاح، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١١٢)، ١٩٨٩

١١٠–محەمەد مەعروف فەتاح، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە(١٢١)، ١٩٨٩ ٠

١١١–محەمەد مەعروف فەتاح، رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٢٥)، ١٩٩٠ ٠

١١٢–محەمەد مەعروف فەتاح، زمانەوانی، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٩٠ ٠

١١٣– محەمەد محەمەد نوری عارف، نەسرین محەمەد فەخری، گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات، ژمارە (١٨)، چاپخانەی ( مەعاریف )، بەغدا، ١٩٧٤ ٠

١١٤–مستەفا نەریمان، رێنوسی کوردی لەرەگ و ریشەوە، دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، دار الحرية للطباعة، بەغدا، ١٩٨١ ٠

١١٥–موحسین ئەحمەد عومەر (د.)، فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی، بەرگی یەکەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپخانەی وەرزاەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥ ٠

١١٦– مینۆرسکی، کوردی و تێبینی و وردبونەوە، وەرگێرانی لەعەرەبییەوە، حەمەسەعید حەمەکەریم،چاپی یەکەم، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ١٩٨٤ ٠

١١٧– میدیا، سەرتاییێکی زمانناسی، بەرگی یەکەم، سلێمانی، ١٩٩٨ ٠

١١٨– مەهاباد قەرەداغی، زمان و ناسنامە، رەهەند، لەبڵاوکراوەکانی نێوەندی رەهەند بۆ لێکۆلینەوەی کوردی، چاپخانەی رەنج، ستۆکهۆڵم، ٢٠٠٠ ٠

١١٩–نەسرین محەمەد فەخری (د.)، هەندێ زاراوەو ئیدیۆمەی کوردی لێکۆلینەوەو لێکدانەوەیان لەرووی زمانەوە، گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات، ژمارە (١٩)، دار الجاحظ، بەغدا، ١٩٧٦ ٠

١٢٠–نەوشیروان مستەفا ئەمین، پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن، چاپی یەکەم، ئەڵمانیا بەرلین، ١٩٩٧ ٠

١٢١–نوری عەلی ئەمین، گرتنی کەلێنێکی تر لەرێزمانی کوردی، چاپخانەی مەعارف،بەغدا،١٩٥٨ ٠

١٢٢– نوری عەلی ئەمین، رێزمانی کوردی ب١، چاپخانەی کامەران، سلێمانی، ١٩٦٠.

١٢٣– نیعمەت عەلی سایە، رێزمانی کوردی زاری کەلهوری چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٤

١٢٤-هەژار، هەمبانەبۆرینە، فرهنگ کوردی، فارسی، چاپی یەکەم، سروشت، تهران، ١٣٦٧ی هەتاوی .

١٢٥- هێمن، پاشەرۆك، چاپی دووەم، چاپخانەی پیرۆز، لەبلاوکراوەکانی سەیدیان، مهاباد، خاکەلێوەی ١٣٦٢ ی هەتاوی .

١٢٦- وریا عمر ئەمین ، مردنی وشە، کاروان، ژمارە( ٤٥ )، ١٩٨٦ .

١٢٧- وریا عمر ئەمین (پ)، چەند ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، چاپی یەکەم، بەرگی یەکەم، ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤ .

٢- بەزمانی عەرەبی : -

١٢٨- ابراهيم انيس (د.)، من اسرار اللغة، الطبعة الرابعة، الانجلو، القاهرة، ١٩٧٢ .

١٢٩- ارسطو طاليس، ترجمة : عبدالرحمن البدوي، فن الشعر، مكتبة النهضة العربية، ١٩٥٣ .

١٣٠-جون لاينز، ترجمة : مجيد المشاطة، اللغة والمعنى والسياق، مطبعة جامعة البصرة، البصرة، ١٩٨٧ .

١٣١- ر.ل. تراسك، ترجمة : رانيا ابراهيم يوسف، اساسيات اللغة، الطبعة الاولى، المجلس الاعلى للثقافة، القاهرة، ٢٠٠٢ .

١٣٢- ستيفن اولمان، ترجمة : كمال محمد بشر، الطبعة العاشرة، مكتبة الشباب .

١٣٣- علي القاسمي (د.)، مقدمة في علم المسطلح، بغداد، ١٩٨٥ .

١٣٤- عمر ابراهيم عزيز (د.)، العلاقة بين اللغة والفكر، مجلة (روشنبيرى كوردستان)، العدد (٥)، اربيل، ٢٠٠١ .

١٣٥- محمد على الخولي، معجم علم اللغة النظري، انكليزى - عربى، مكتبة لبنان، بيروت، ١٩٨٢ .

١٣٦- ن. غطاس، هـ. جوهانس، أ. برش، أ. روبرستون، قاموس الادارة، عربى - عربى - انكليزى، بيروت، لبنان، ١٩٨٣.

٣- بەزمانی ئینگلیزی :

١٣٧- Arnold, I. (١٩٧٣). English word, mock be : Leningrad.

١٣٨- Crystal. david (١٩٩١), A dictionary of linguistics. Black well :oxford.

١٣٩- Dixon, R.M.W ١٩٧٧, where have all the adjectives Gone studies in language , vol., No: ١. ١٩ – ٨٠

١٤٠- From kin V. (١٩٨٨) An Introduction to language, Holt, Rinhart and winstonIns: U.S.A.

١٤١- Jennifer seidl, (١٩٨٨), English Idioms, oxford university press.

١٤٢- palmer, F.R. (١٩٨١). semantics, cam bridge university press.

١٤٣- Scalise, S. (١٩٨٦), Gene rative Morpho Logy, foris pub Lication, Dordrec ht: Holand.

# ملخص الرسالة

هذه الرسالة الموسومة ( معجم اللغة وعلم المصطلح الكردي ) دراسة وصفية على المستوى المورفولوجى، تتحدث عن كيفية إغناء معجم الكردي بالمصطلحات.

وتحتضن مقدمة لتوضيح سبب إختيار البحث والمنهج المتبع في إنجاز هذه الرسالة ، ثم يأتي بعدها تمهيدٌ لتوضيح بعض المفاهيم المستخدمة في الرسالة

وهذه الرسالة تتكون في ثلاثة فصول:-

**الفصل الاول:**

يتناول(معجم اللغة و المصطلحات المصطنعة )،ويتكون في توطئة قصيرة لتوضيح دور الكلمة ومعجم اللغة ، ويتحدث عن السوابق واللواحق النحوية التي تشترك في صياغة المصطلحات في اللغة الكردية، ويتناول أيضاً المورفيم المزدوج لبعض اللواحق، التي تنشأ نتيجة انشطار الكلمة الى المورفيمات المكونة للمصطلحات ، مع بعض الكلمات البسيطة المستخدمة اليوم في اللغة الكردية.

**الفصل الثاني :**

هذا الفصل الذي يحمل عنوان ( المصادر الاخرى لاغناء معجم اللغة ) ،يدرس دور الكلمة في إغناء معجم اللغة مع تبيان صفاتها وخصائصها المميزة ، إضافة الى التطرق الى الطرائقها الاخرى مثل الاكرونيم والانشطار .... الخ، التي تلعب دوراً كبيراً في التطور وإغناء معاجم اللغات في اغلب اللغات الحية، وتناولنا في هذا الفصل بعض العوامل الاخرى التي تؤدي الى إزدهار معاجم اللغات ، مع ذكر السبل والوسائل التي تُسهل دخول الكلمات الجديدة الى اللغات ، مثل الاحتلال والهجرة والاكتشافات ...الخ .

**الفصل الثالث : -**

تتمثل جوانب ( مشكلة المصطلحات الكردية )، يتناول هذا الفصل المشاكل التي تعترض المصطلحات الكردية في وقتنا الراهن ، وأردفنا ذلك بأراءنا الخاصة بهذا الصدد ، فأقترحنا الحلول المناسبة لها ، إعتماداً على الطرق الحديثة في علم اللغة .

وتأتي بعد الفصول الثلاثة نتائج البحث ، التي توصلت اليها ، وهى كثيرة منها للغة دور مهم في حياة الفرد والمجتمع ، لانها تحمل واجبات متنوعة ، وتحتاج الى النمأ والتطور لتجديد نفسها ، والمصطلحات الجديدة تسبب في تطور ورقي اللغات الحية .. ثم نأتي بعدها قائمة المصادر واالمراجع المعتمدة في هذا البحث ، وتضم مجموعة كبيرة في المصادر والمراجع المهمة لإنجاز الرسالة.

# Abstract

This thesis entitled ((Kurdish Lexicon and Terminology)) is a descriptive study that deals with Kurdish terminology and enrichment of its lexicon .

Apart from the introduction which explains why the subject has been chosen, the thesis is made up of three chapters and results as follows .

**Chapter one :.**

This chapter includes a short introduction demonstrating the function of word and lexicon , the affixes that contribute in composing words in Kurdish language , Some dual morphemes and suffixes that appear as a result of slicing words to their components , looking for Kurdish lexicons and some simple words that one used as affixes in the language .

**Chapter two:-**

This part is devoted to (other references to enrich the dictionary) explaining their role and characteristics one by one besides some creative ways like slicing , diminution acronym etc.

That have no table and important role in developing lexicon in most languages, as well as the factors and means that expand lexicon and bring ready made words in to Kurdish language for example, occupation, discovery, migration.

**Chapter three:-**

It includes the problems that face Kurdish terminology nowadays. The problems have been discussed besides our own opinions on this case and suggesting suitable solutions relying on new scientific methods of linguistics.

Finally, there is a list containing the most important results drawn form the thesis and the references used.

ئەم کتێبە، لەبنەڕەتدا نامەیەکی ماجستێرە لەلایەن ((ڕۆژان نوری عەبدوڵڵا))ەوە
ئامادەکراوە، بەسەرپەرشتی ((پرۆفیسۆری یاریدەدەر دکتۆر بەکر عومەر عەلی))،
پێشکەشی بەشی زمانی کوردی کۆلێژی پەروەردەی زانکۆی کۆیەی
کردووە، بلەی ((زۆرباشە))ی دراوەتێ ...

لەگەڵ ئەوەی زاراوە بە بەردی بناغەی لە دایکبوون و پێکهێنانی زمانی نەتەوایەتیی هەموو زمانێکی پێشکەوتوو دادەندرێت، لە بوارە جیاجیاکانی زانستی و ڕۆشنبیری و هونەری و وێژەییدا، هۆیەکە بۆ یەکخستنی بیرکردنەوەو تێڕوانینیان، بەڵام ئێمەی کورد لە بواری زاراوە سازیدا، هێشتا نەگەیشتووینەتە ئاستی پێویست، بۆیە پێویستە گرنگی بەم لایەنەی زمان بدەین و بەرەو پێشەوەی ببەین.

لە بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا